ڕێڤەبەرێ گشتی و سەرنڤیسەر
موئەیەد تەیب

- **ژمارا وەشانێ** : (٤٢٦)
- **ناڤێ پەڕتووکێ** : فەرهەنگا سپیرێز (عەرەبی - کوردی)
- **دانان** : محەمەد ئەمین دۆسکی
- **بەرگ** : نەجمەددین بیری
- **دەرهێنانا ناڤەرۆکێ** : شیرزاد محمد عمر و حسێن سەنعان مەتیخان
- **سەرپەرشتکارێ چاپێ**: شێروان ئەحمەد تەیب
- **چاپ** : دووێ - ٢٠١٦
- **تیراژ** : (١٥٠٠) دانە
- **ژمارا سپاردنێ** : (٢٠٧٦) ل ڕێڤەبەریا کتێبخانێن گشتی ل پارێزگەها دهوکێ
- **چاپخانە** : (Matris) - ترکیا



دهۆک/ جادا مازی / تاخێ ئاشتی / ئاڤاهیێ سپیرێز
www.spirez.org www.spirez.com

# فەرهەنگا سپیرێز

# عەرەبی - کوردی

**دانان**

**محەمەد ئەمین دۆسکی**

سپیرێز ٢٠١٦

# پێشگۆتنا چاپا دووێ

ژ بەر وێ گرنگیا ژ پێویستیا مرۆڤێ کورد - نەخاسمە قوتابی - ب هەبوونا فەرهەنگ و کتێبێت فیرکرنا زمانێ عەرەبی پەیدابووی ب تایبەتی ل ڤی دەمێ فێرکرنا وی یا ب زمانێ عەرەبی دەملدەست ژ ئەگەرێ سەرهلدانێ هاتیە ڤەگوهازتن بۆ زمانێ کوردی ئەم هاتبووینە ڕاسپاردن ژ لایێ ریڤەبەرێ دەزگەهی ڤە مامۆستایێ هێژا (مؤید طیب) ڤە ژ بۆ دانانا فەرهەنگەکا (عەرەبی - کوردی) و ئەڤ ڕاسپاردنە ل دەمەکێ کورت بوو کار و هاتە ئەنجامدان ل ژێر ناڤێ (فەرهەنگا سپیریز) و هاتە چاپکرن و وەشاندن، و ب شێوەیەکێ بەرچاڤ ڕەواجا خۆ دیت و خواندەڤانا بەرێ خۆ دایێ و هەر زوی هاتە کڕیت و د دەمەکێ کورت دا د سویکا پەرتووکا کوردی دا نەما و جهێ وێ ما ڤالا، و هەر ئەو پیویسی وەکی خۆ ما و داخوازا ل سەر وێ ژی یا ژ لایێ بکڕی کتێبێ ڤە دهاتە کرن هەر وەکی خۆ ما.

ژ بەر وێ چەندێ مە دەست ب ڤەوژارتن و زێدەکرنا وێ کر و چەندەکا مەزن ژ پەیڤان لێ زێدەکر، نەخاسمە ئەو پەیڤێت مە ژ بەر کارێ لەزێ ژبیرکرین و پەیڤێت دی یێت ژ هەر ئەگەرەکێ ڕێکا خۆ بۆ فەرهەنگێ نەدیتین نەخاسمە ئەوێت گرنگ و خواندەڤان ب تایبەتی قوتابی پێدڤیدبیتێ و مە ل دویڤ شیانێت خۆ گەلەک کیماسی چارەکرن و باش دەولەمەندکر دا کو هندەک ژ وێ ڤالاتیا نەبدەستکەڤتن و نەلئاستیا فەرهەنگا پەیداکری پێ پڕببیت، ئەڤە ژی وەک پێهنگاڤەکا بەرچاڤ د ڕێکا وێ ئارمانجێ دا یا کو دەزگەهێ سپیریز یێ چاپ و وەشانی ژ بۆ بجهئینانا وێ هاتیە دامەزراندن.

پێویستە بهێتە زانین کو ئەڤ فەرهەنگە ژ گشت پەیڤێت زمانێ عەرەبی پێکناهێت ئانکو هەمی پەیڤێت زمانێ عەرەبی تیدا نینن، بەلکو دەریایا پەیڤێت ژێکرتی یە ئەوێت ل دویڤ زانینا مە خواندەڤایێ کتێبێ و قوتابییێت گشت قووناغێت خواندنێ ل

قوتابخانەیێت ئەدەبی و زانستی و ئایینی پێدڤی دبنێ و ژ بەر هندێ ژێ هژمارا پەیڤێت د ڤێ چاپا فەرهەنگێ دا گەلەک زێدەتر لێهاتینە ژ ییێت چاپا ئێکێ و پتر نێزیکی تەکووزیێ بوویە کو هەر ل دەستپێکێ ئارمانجا مە بوو.

مە هزرڤان و فەلسەفەخواز و ڕەوشەنبیر و یاساپەروەر و دیندار و مەلا و سۆفی و دختۆر و ئەدیب و شاعر و شانۆڤان و نەخشکیش و مۆزیکڤان و ئەدەبدوست و خواندەڤانێ کتێبێ و کارکەر و پیشەشاز و مالخوێ مالێ و کابانی و بەرمالی بێبار نەکرینە ژ پێدڤییێت وان ژ پەیڤ و زاراڤا و هەر ئیکی ژ وان پێدڤیا وی ل بەرچاڤ گرتی یە، بەلێ ل دویڤ شیانێت خۆ هەمی ژی ژ پێخەمەت خزمەتکرنا ڕەوشەنبیریا گشتی هویڤیدارین ئەڤ بەرهەمە ب دلێ هەمیان بیت و هەمی مفای ژێ ببینن.

ئەڤ چاپە (چاپا دووێ) ل دویڤ دیتنا من دێ پتر ڕەواجێ د بازارێ کتێبا کوردی بینت و دێ پتر هێتە داخوازکرن ژ بەر کو ل دویڤ دیتنا من پتر ژ (چاپا ئێکێ) وێ ڤالاتییێ دێ پڕکەت ئەوا مە ل دەستپێکێ بەحس ژێ کری و دێ ئارمانجا دانانا خۆ پتر ب جهـئینت کو هویڤیا مەیە.

هویڤیدارم ل ئاستێ خزمەتا ڕەوشەنبیریا کوردی بیت و جهێ خۆ د پەرتووکخانەیا کوردی دا ب بەرفرەهی ببینت و ل دویڤ ڕەزامەندیا خواندەڤانێ هێژا بیت نەخاسمە قوتابییێ خۆشتڤی، و سەرکەڤتن ژ خودێ یە.

**محمدأمین دۆسکی**
**٢٠١٣/٨/١٤**

# پێشگۆتنا چاپا ئێکێ

زمانێ عەرەبی و زمانێ کوردی ژ گەلەک لایان ڤە ژێک د دویرن ژ بەر کو زمانێ عەرەبی ژ بنەمالا زمانێت سامی یە و زمانێ کوردی ژ بنەمالا زمانێت هندۆئۆرپی یە، لێ دگەل هندێ ژی پەیوەندیەکا دیرۆکی یا موکم د ناڤبەرا هەردویان دا پەیدابوویە و ئەو پەیوەندی د وێ دانوستاندنێ دا خویا دبیت یا کو شوینوارێت وێ د هەردوان دا د ئاشکرا و بەرچاڤ.

ئەڤ پەیوەندی یە ژی ب حوکمێ جیرانەتیا دیرۆکی یا هەردو نەتەوان عەرەب و کوردان پەیدابوویە و دیرۆکا وێ پەیوەندیێ یا بوویە ئەنجام و ئەگەرێ موکمبوونا وێ دانوستاندنا گرنگا ژێکگۆتی، پاشی هندەک ئەگەر و فاکتەرێت دی پەیدابوونە وان ژی رۆلەکێ گەلەک گرنگ د بەردەوامیا وێ پەیوەندیێ و دانوستاندنێ دا هەبوویە مینا دین و چارەنڤیس و ئامانج و کارێت هەڤپشک ب درێژاهیا دیرۆکێ.

هەتا نوکە ژی ئەو پەیوندی یا بەردەوامە و دێ یا بەردەوام بیت هندی کو دینێ هەڤپشک هەبیت یێ کو ب زمانێ عەرەبی هاتی، لەوما ژی گرنگیا زمانێ عەرەبی دێ یا بەردەوام بیت و مرۆڤێ کورد نەشێت خۆ ژێ بێمنەت بکەت، دگەل وێ چەندێ ژی گەلەک ژ رەوشەنبیریا کوردی یا پێ هاتیە نڤێسین و ژمێژە، زێدەباری کو ب سەدان سالان زمانێ فەرمی یێ فێربوونێ بوویە ل فێرگەهێت کوردستانێ و کەسایەتیا رەوشەنبیریا کەلەک ژ ناڤدارێت کورد یا ب رێکا زمانێ عەرەبی یا هاتیە ئاڤاکرن.

هەر چەندە هەرێما کوردستانێ ژ بەری پتر ژ پازدە سالان یا ڤەقەتیای بوویە ژ حوکۆمەتا عێراقێ و خواندن ل خواندنگەهێت وێ یا سەربخۆ بوویە لێ کاودانێ پەروەردێ ب وی رەنگی بەر ب پێش نەچوویە کو ب شێوەیەکێ رێژەیی ژی بێمنەتی ژ زمانێ عەرەبی پەیدا ببیت؛ بەلکو گرنگیا وی پتر یا خۆ دسەپینت و فێرخواز ژ هەمی توخما یێ خۆ پێویستی رێکێت فێربوونا وی دبینن، بەلێ دەستڤالا ژ هەر بزاڤ و هەولدانەکێ دزڤرن ئەو ژی ژ ئەگەرێ کیمی و لاوازیا ژێدەران نەخاسمە ژ لایێ فەرهەنگان ڤە.

ڤێ هەمییێ هێلا رێڤەبەرێ دەزگەها سپیرێز یێ چاپ و وەشانێ نڤیسەر موئەید تەیب هزرا خۆ د ڤی جۆرە پرۆژەی دا بکەت و وەک هەولدانەک ژ بۆ دابینکرنا هندەکێ ژ وێ پێویستیا ژێگۆتی و ل دویڤ راسپاردنا وی ئەڤ کارە هاتە کرن و ئەڤ پرۆژە یێ کو ب ناڤێ (فەرهەنگا سپیرێز) هاتە ب جهئینان، هویڤیدارین ئارمانجا خۆ ب جهـ بینت.

ئەڤ فەرهەنگە ژ کۆمەکا هلبژارتیا پەیڤێت عەرەبی یێت وەرگێرای پێک دهێت کو ب بەردەوامی ب بەرچاڤێت خواندەڤانی دکەڤت د پەرتووکێت زمانێ عەرەبی ژ هەمی جوینا، ئەم دشێین بێژین کو دزیندی نە، و گەلەک ژ وان پەیڤێت عەرەبان ب پاشگوهـ ڤە هاڤێتن رێکا خۆ بۆ ڤێ فەرهەنگێ نەدیتی یە، و ئەگەر کێماسیەک هەبیت و ب شاشی ڤە پەیڤەکێ جهێ خۆ تێدا نەدیت بت د چاپێت داهاتی دا دێ بینت و ئەو کێماسی دێ هێتە چارەکرن.

**محەمەد ئەمین دۆسکی**

**٢٠٠٨/٦/١٤**

# تێبینی

ژ بۆ ب کارئینانا دورستا ڤێ فەرهەنگێ پێدڤی یە خواندەڤان ڤێ چەندێ بزانت:

١- کریار(الفعل)ێ جیناڤێ خۆ یێ هەی ئانکو وەرگێرانا وێ ل سەر بنیاتێ هەبوونا جیناڤی یا هاتی یە کرن.

٢- ناڤێ کوردی یێ د ناڤبەرا دو کڤانا دا نموونەیێ کاری(الفعل) یە، بوو نموونە دەما (أمطر) دهێتە وەرگێران ب ڤی رەنگی دهێتە نڤیسان: باری(باران).

# پیتا ( أ )

**أ:** پیتا ئێکێ یە ژ ئەلفابێیا عەرەبی، هژمارا وێ د حسێبا ئەبجەدی دا دبیتە (١)، بۆ پرسیارێ و گازیکرنێ و یەکسانکرنێ دهێتە ب کارئینان.
**الإئتشاب:** تێکهەلیئێکبوون.
**الإئتلاف:** کومبوون و لێککگونجان.
**الإئتمان:** ١- ئەوە مرۆڤ ئێکی بکەتە جهێ باوەریا دەبارەی تشتەکی ئانکو تو تشتەکی ب دانی نک. ٢- تو ئێکی بکەیە جهێ باوەریا خۆ. ٣- د یاسایێ دا ئەو کو تو مالەکی یان ئێمانەتەکی یان دەینەکی یان وەکالەتەکێ ب ئێمانەت ڕادەستی کەسەکی بکەی.
**أب(بالتشدید):** ١- خۆ ئامادەکر؛ کارێ خۆ کر. ٢- خەریببوو.
**آب:** ١- زڤڕی. ٢- هاتە نک ب شەڤ. ٣- تووبەکر.
**أب:** ١- باب. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: کەسێ عەقلی و نەفسێ و لەشی پەروەردەکەت کو دبنە کانیا ژیانێ.
**أب:** گیا؛ شینکاتی.
**آب:** مەها تەباخێ.
**أبأ:** هاڤێت.
**أباء(بالتشدید):** یێ زۆرداریێ قەبیل نەکت.
**إباء:** قائیل نەبوون؛ ڕەتکرن.
**أباب:** ١- ئاڤ. ٢- سەراب.
**أبابیل:** کۆما(أبالة)یە کو دبیتە رەڤا بالندا دبێژن: مەبەست حادیرەشکن.
**الأباتي:** ناسناڤێ سەرۆکێ گشتی یە ل ناڤ ڕەبەنیت کەنیسا رۆژهەلات.
**الإباحیة:**١- هزرەکە بەرێ خەلکی ددەتە ئازادبوونێ ژ تۆرە و دین و یاسایا.
٢- جوینەکێ سۆفیانە دبێژن شیانێت هێلانا گونەها و ب جهئینانا فەرمان و ئەرکا ل نک مرۆڤی نینن و ڕەت دکەن کو ملکێ تایبەتی هەبیت و دبێژن: ملک یێ هەمیایە ئانکو مال وملک و ژن یێت هەمیانە.
**أباخس:** تبل ب گەه و ڕه و هەستی ڤە.
**الإبادة:** قەتبڕکرن.
**أبار:** ١- ئەوێ دەرزیکا چێدکەت. ٢- ئەوێ دارقەسپا تۆڤ ددەت.٣- کێچ.
**الإبارة:** کارێ ڤەگوهازتنا تۆڤی ژ گیایێ نێر بۆ گیایێ مێ کو برێکا میشەمۆرا یان بای یان ئاڤێ جاروبارا ژ بۆ بەرگرتنێ.

**أبازير:** کۆما (أبزار)ە یا کو دبیتە کۆما (بزر) کو دبیتە دەرمانکێت زادی.
**أباس:** گرفتارکر.
**الإباض:** کنفێ گرێدانا حێشترێ.
**الإباضية:** خەوارجن؛ دویڤچوویێت (عبدالله بن إباض)ی نە؛ دبێژن: (علي بن أبي طالب) خودێ ژێ رازی بت کافرە و هەر موسلمانێ نە دگەل مە بیت ژی کافرە ئانکو نە ل سەر باوەریا وان بیت.
**الأباطيل:** کۆما (باطل) کو دبیتە تشتێ نەدورست.
**أبان(بتشديد الباء):** ل دەمێ.
**أبان:** دیارکر.
**أبت:** ١- شاریا؛ گەرمبوو. ٢- حێبەتیبوو. ٣- پوفبوو.
**إبتاع:** کڕی.
**إبتدأ:** دەست پێ کر.
**الإبتداء:** دەستپێکرن.
**الإبتدائية:** سەرەتایی.
**الإبتداع:** ڤەدیتن وچێکرنا تشتی.
**إبتدع:** ئافراند؛ چێکر.
**الإبتذال:** ڕیژوبێژیا د تشتی دا دهێتە کرن.
**أبتر:** ١- کوری قوت یان بڕی. ٢- بێ دویندەهـ.
**الإبتسامة:** گرنژین.
**إبتسم:** گرنژی.
**الإبتشار:** ب مزگینیێ خۆشبوون.
**إبتشک:** درەوکر.
**أبتع:** ١- مرۆڤێ تژی و خڕ. ٢- پێکڤە.
**الإبتعاد:** دویرکەڤتن.
**أبتعد:** خۆ دویر کر.
**أبتعون:** هەمی پێکڤە.
**الإبتغاء:** داخوازکرن.
**إبتغی:** داخوازکر.
**الإبتکار:** ئافراندن.
**إبتکر:** ئافراند؛ ژ نک خۆ چێکر.
**إبتلی:** سەربۆرکر؛ جەرباند.
**الإبتلاء:** تووشبوون ب سەربۆرکرنەکێ وەک مسیبەتەکێ.
**الإبتلاع:** داعویران.
**الإبتلال:** ساخبوون ژ ئێشەکێ.
**إبتلع:** داعویرا.
**الإبتناء:** ئاڤاکرن.
**الإبتهاج:** کەیفخۆشبوون؛ شادبوون.
**الإبتهال:** دوعاکرن.
**إبتهج:** دلخۆشبوو؛ کەیفخۆشبوو.
**إبتهل:** دوعاکر.
**أبج:** یێ تیکا چاڤێت وی فرەهـ.
**أبجد:** کۆما ئێکێ یە ژ پیتێت عەرەبی ل دویڤ ڕێبازا کەڤن.
**أبجل:** دومارا دەستی یان یا پێی.
**أبحر:** ب ڕێکا دەریایێ چوو.
**الأبخر:** ئەوێ بێهن ژ دەڤی دهێت.
**الأبد:** ١- دەمێ دەستپێک هەی و بێ دویماهی. ٢- بەردەوامیا هەبوونێ د دەمێت داهاتی یێت بێ دویماهی. ٣- دەمێ بێ دویماهی. ٤- ئەو دەمە یان تشتە یێ چوجار ب هزرێ ب دویماهی نەهێت.
**الإبداء:** ١- دەستپێکرن. ٢- دیارکرن.
**الإبداع:** ئافراندن.
**أبدي:** هەروهەر.
**الأبدية:** دەمێ دەستپێک هەی و دویماهی نە.
**الآبد:** شوینوار.
**الآبد:** کویڤی.
**أبد:** کویڤیبوو.
**إبداء:** دیارکرن؛ کفشکرن.
**الأبدار:** ل نک سۆفیا ئەوە یێ خودێ وەک نموونە ل جیهانێ دانای ژ بەر کو ژاتێ وێ وەک حوکم یێ تێدا تەجەللابووی ژ بەر هندێ دبیتە خەلیفێ خودێ یێ ب ناڤێت وی ئاشکرابووی.

**الإبداع:** ١- چێكرنا تشتی ژ نەبوونێ. ٢- چێكرنا تشتی ژ تشتی.
**أبدال:** كۆما (بدل)ە، ئەو چاكن یێت د هزرا سۆفیان دەما ئێك دمریت ئێكە دی دهێتە شوینێ، یان خولقەت ل دویڤ خولقەتێ هاتینە گوهۆرین و ڤاڤێرتنەك ل دویڤ ڤاڤێرتنێ لێ هاتیە كرن، ژمارەیا وان (٤٠)ن و دبێژن (٣٠)ن.
**الإبدال:** پێككگوهۆرینا تشتا.
**آبدة:** كارەساتا بەردەوام.
**أبدع:** ئافراندن تێدا كر.
**أبدي:** بەردەوام، هەروهەر.
**أبر(بتشدید الراء):** سویندا خۆ ب جهئینا.
**أبر:** ١- دەرزیكدا(صە). ٢- گەزت. ٣- پێڤەدا.
**الإبراء:** بەریكرن.
**أبراء:** كۆما (بزر)ە ئانكو دەرمانكێت زادی.
**إبراز:** بەرچاڤكرن؛ دیاركرن.
**إبرة:** ١- دەرزیك. ٢- زیلك.
**إبرة الراعي:** كێلی دەرزیك.
**الأبرز:** دیارتر.
**أبرز:** دیاركر.
**الأبرش:** چنیچنی.
**الأبرشية(الأبريشية):** دێر یان جهێ ل بن دەستهەلاتا ئوسقوفەكی ڤە (یۆنانی) یە.
**الأبرص:** ئەوێ ئێشێ پیستێ وی گرتی و پنی لێ چێبووین.
**أبرق:** عەردێ ب بەر و خیز.
**أبرم:** باداییتر.
**إبريج:** مەشك.
**إبريز:** ١- زێر. ٢- خورست. ٣- زەلال.
**إبريسم:** ئارمیش.
**إبريق:** مەسین (فارسی یە).
**أبريل:** مەها نیسانێ.
**أبز:** ١- خۆ هلاڤێت؛ لۆت دا. ٢- زۆرداری لێ كر.
**أبزار:** بهارات.

**أبزق:** تشتێ رەنگێت سپی و رەش تێدا.
**إبزيم:** ئاڤزونكا قاویشێ (فارسی) یە.
**أبس(بتشديد السين):** هاژۆت.
**الأبس:** راشكاندن و بێرووم‌ەتكرن.
**الإبساس:** پەرخاندنا گوهانی دا شیر ژێ بێت.
**الإبسال:** ١- مراندن. ٢- حرامكرن.
**الإبصار:** دیتن.
**الأبصار:** كۆما (بصر)ە كو دبیتە چاڤ.
**أبصر:** دیت.
**الأبض(بالضم):** قۆقلكا چۆكی.
**الإبط:** بنكەفش.
**أبطأ:** گیرۆبوو.
**الإبطاء:** گیرۆكرن.
**أبطل:** ژ كارئێخست.
**الإبعاد:** دویركرن.
**أبعاض:** كۆما (بعض)ە ئانكو هندەك.
**أبعد:** دویركر.
**الأبعد:** یێ دویرتر.
**الإبغاض:** نەڤیانتێكرن.
**أبغض:** نەڤیانا خۆ تێ كر.
**البغضاء:** نەڤیان.
**أبق:** ١- رەڤی. ٢- ژ خودانێ خۆ رەڤی.
**الآبق:** یێ ژ بەر خودانێ خۆ یان مەزنێ خۆ رەڤی.
**الإبقاء:** هێلان.
**أبقى:** هێلا.
**الأبقع:** یێ پنیپنی.
**الإبكاء:** گریاندن.
**الإبكار:** سپێدە.
**أبكار:** كۆما (بكر)ە ئانكو نەخری یان كچین.
**الأبكر:** كەڤرێت مەزن.
**الأبكع:** كەسێ دەستبری.
**الأبكم:** لال.
**أبكى:** گریاند.

**إبل:** حێشتر؛ دەڤە.
**أبل:** ١- قائیل نەبوو ب چیتە نڤینا ژنکا خۆ.
٢- فێری شڤانەتیا حێشترا بوو.
**الإبلاس:** بێهویڤیکرن.
**الإبلاغ:** ڕاگەهاندن.
**الإبلال:** ١- شلکرن. ٢- ساخبوون ژ ئێشەکێ.
**أبلة(بتشدید اللام):** ١- پرتا خورمێ.
٢- ئێل؛ عەشیرەت.
**الأبلخ:** یێ خۆ مەزن دکەت.
**أبلس:** بێ هویڤی بوو.
**أبلغ:** ڕاکەهاند.
**الأبلغ:** یێ ڕەهوانبێژتر.
**أبلق:** بەلەک.
**الأبلق الأبقع:** بالندەیێ بنبەرۆتکێ بەلەک.
**الأبلق الأحمر الذنب:** بالندەیێ بنبەرۆتکێ بنپشتسۆر.
**الأبلق الأسود الأذن:** بالندەیێ بنبەرۆتکێ بەلەکێ گوهرەش.
**الأبلق الأشهب:** بالندەیێ بنبەرۆتک؛ بنبەلیتک.
**الأبلق الإعتیادي:** بالندەیێ بەلەخشک.
**الأبلق الحزین:** بالندەیێ بنبرۆتکێ دامایی.
**الأبلق العربي:** بالندەیێ بنبەرۆکێ بەلەبەش.
**أبله:** گێل؛ دەبەنگ.
**إبلیس:** یێ بێ هویڤی ژ دلۆڤانیا خودێ کو شەیتانە.
**إبن الأیام:** ئەوە یێ کاودانێت ڕۆژا دزانیت.
**إبن آوی:** ڕویڤی.
**إبن براء:** ڕۆژا دویماهیێ ژ هەیڤێ.
**إبن بریح:** قەل؛ قەلەڕەشک.
**إبن دأبة:** قەل.
**إبن الخال:** کوڕخال.
**إبن الخالة:** کوڕخالەت.
**إبن السری:** ڕێڤینگێ شەڤێ.
**إبن السبیل:** ڕێڤینگ.
**إبن عرس:** سڤۆرە.
**إبن العم:** پسمام.
**إبن العمة:** کوڕمەت.
**إبن اللبون:** حێشترا دوسالی.
**إبن الوقت:** ١- کەسێ ل دویڤ دەمی کار دکەت. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە سۆفیێ دەمی ژ دەستێ خۆ نەکەت و مفای ژێ دبینت.
**إبن الیوم:** یێ حالێ وێ حالێ ئەو تێدا.
**أبن(بتشدید الباء):** پەسنا مری کر.
**الإبن:** کوڕ.
**أبن:** گونەهبارکر.
**ألابن:** یێ شیردایی.
**أبناء الدهالیز:** کوڕیت کولانا.
**أبناء السکک:** کوڕیت کۆلانا.
**إبنة:** کچ.
**أبنة:** ١- گرێکا داری. ٢- بسمارا گوشتی.
**إبنة الأخ:** برازا.
**إبنة الأخت:** خوارزا.
**إبنة الجبل:** بەرەشیشک.
**إبنة الخال:** کچخال.
**إبنة الخالة:** کچخالەت.
**إبنة العم:** دۆتمام.
**إبنة العمة:** کچمەت.
**الأبنة(بالضم):** گرێ.
**أبنه(بتشدید الباء):** پەسنا وی کر.
**أبنوس:** دارا ئاڤەنۆس، جۆرە دارەکە ل هندستانێ شین دبت.
**أبه:** پویتە پێ کر.
**الأبهی:** ١- گەشتر. ٢- جوانتر.
**الإبهام:** ١- تبلا بەرانی. ٢- مژدارکرن.
**الأبهة(بتشدید الباء):** مەزناهی.

**الأبهر:** ١- پشت. ٢- دەمار پشتێ. ٣- دەمار ستۆی. ٤- دەمارا خوینێ یا د ناڤبەرا دلی و پشـــتێ دا. ٥- پێ گەشتر.

**الأبوان:** دایک و باب.

**أبو الائمة:** بابێ ئیماما مەبەست (علي بن أبي طالب)ە خودێ ژێ ڕازی ببت.

**أبو بريص(الوزغة):** چەپچەپیسک.

**أبو البشر:** بابێ مرۆڤا ناسناڤێ ئادەمی یە - سلاڤ لێ بن.

**أبو تراب:** ناسناڤێ (علي بن أبي طالب)ی یە خودێ ژێ ڕازیبت.

**أبو جعادة:** گورگ.

**أبو جعار:** حەفتیار.

**أبو جعدة:** گورگ.

**أبو جعران:** کیزگولۆلک.

**أبو الحارث:** ناسناڤێ شێری یە.

**أبو الحباحب:** ستێرستێرۆک.

**أبو حديج:** بالندەیێ لەگلەگە.

**أبـو الحنـاء:** بالنـدەیێ بەرسـۆرک؛ مـەلاک؛ مەلاسۆرک؛ بنحەفکسۆرک؛ بوبکسۆران.

**أبـو الخضير(الـوروار الأوربـي):** بالنـدەیێ کولکـولی؛ مێشـــخوەلینک؛ مێشـــگرک؛ شالویل؛ مێشخۆرک.

**أبو الزعر:** بالندەیێ چرکۆنەیێ کوریدرێژ.

**أبـو الزعـر العراقـي:** بالنـدەیێ چرکۆنـەیێ کوریدرێژێ کوری ترتالە.

**أبو اليسر:** بالندەیێ لغاڤگورا بنچەنگسۆر.

**أبو بنات عبر:** درەوکەر.

**أبو بيض(عنكبوت):** تەڤنپیرک.

**أبـو تمـرة الأشـجار:** بالنـدەیێ بالاڤیکـەورکا داروبارا.

**أبـو تمـرة الصـحراء:** بالنـدەیێ بالاڤیکـەورکا دەشتێ.

**أبـو تمـرة الغـيط:** بالنـدەیێ بالاڤیکـەورکا مێرگا.

**أبو تمرة الماء:** بالندەیێ بالاڤیکەورکا ئاڤ و دەراڤا.

**أبو جعرانة(جعل):** کێزگولولک.

**أبو جلمبو(سرطـان):** کێڤژالە.

**أبو خصلة:** بالندەیێ کۆفیکەزیک.

**أبو الحناء:** بالندەیەکە بەرچێلکا وی یا سۆرە و لـــەش و کوریێـــت وی د قـــەهوەیی و زەیتـوینی نـە، میشـەمۆر وفێقـی دخۆت، ل ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیا دژیت.

**أبو دقيق(فراشة):** بەلاتینک.

**أبو زريق:** بالندەیێ شرکاک؛ کرکاک؛ کڕکەوک؛ شلکاک.

**أبو صابر:** خوێ.

**أبو ظفر:** بالندەیێ کەدیکێ بەرسینک ڕەش.

**أبو عوف:** کولیێ نێر.

**أبو فراس:** ناسناڤێ شێری یە.

**أبو قترة:** نەقلناڤێ شەیتانی یە.

**أبو قردان:** بالندەیێ گاڕانیک.

**أبو قلنسوة:** بالندەیێ سەرڕەشک.

**أبو كاسب:** گورگ.

**أبو لاحق:** بازی.

**أبو مالك:** ١- برس. ٢- پیری.

**أبو مجرف:** بالندەیێ کەپیپان.

**أبو مغازل:** بالندەیێ چەکمەسۆر.

**أبو مليح:** خوارنەکە ژ نانێ قەلاندی و خیار و پیڤـازا و مەعدەنۆسـی و ترشـێ سـماقێ و زەیتێ چێدکەن.

**أبو المليح:** بالندەیێ کەدیک.

**أبو نمرة المحمر الزور:** بالندەیێ بالاڤیکەورکا حەڤتکسۆر.

**أبو هبيرة:** بەقا نێر.

**أبو الهول:** بەیکەرەکێ فیرعەونی یە ل وەلاتێ (مصر)ێ.
**أبو یقظان(دیک):** دیکل.
**أبو:** باب.
**الأبوة:** بابینی.
**أبی:** قائل نەبوو.
**الأبیاري:** ١- ئانکو یێ ژ (أبیار) کو ناڤێ (مصر)ێ یە. ٢- شیشەیێ نازک. ٣- جۆرەکێ کۆترایە.
**أبیت اللعن:** تۆ وێ نەکەی یا تو پێ ژ هەژی نەفرتێ ببی.
**أبیض:** سپی.
**الأبیضان:** ١- ئاڤ و شیر. ٢- نان و ئاڤ.
**أبیل:** دارێ ناقوسێ.
**الأبیلة (الإیبالة؛ الإبالة):** گەرزێ گیای.
**أتا:** ١- بەرێ وی دەرکەڤت. ٢- بەرهەمێ خۆ مشە دا.
**أتی:** ١- هات. ٢- کر.
**إتاب:** شەرمکر.
**أتابک:** میر، سالار، د بنیات دا پەروەردەکارێ بچویکێت مەلکا بوو(ترکی یە) ژ پەیڤا (أتا) ئانکو باب و پەیڤا (بگ) ئانکو مەزن هاتیە کو دبیتە: بابێ مەزن.
**الإتاحة:** رێدان.
**إتأد:** خۆگرتن.
**أتأم:** چێمکەک بوو.
**أتان:** ماکەر.
**الإتاوة:** ١- بەرتیل. ٢- باج.
**أتب:** ئێلەک؛ قوتک.
**الإتباع:** بدویڤکەڤتن.
**الإتباعیة:** ل (الکلاسیکیة) بزڤرە.
**إتبس:** هشکبوو.
**الإتجاه:** سەمت.
**إتجر(بالتشدید):** بازرگانیکر.
**إتجر:** دەرمان ڤەخوار.
**الإتحاد:** ١- ئێککرن. ٢- ئێکرنا دو تشتا ژ لایێ (ذاتي) ڤە. ٣- تێکهلبونا دو تشتا یان پتر. ٤- لەشێ ژ دو تشتا پێکهاتی. ٥- ل نک سۆفیا دبیتە: ئێکبوونا دو ذاتا وەک کاودان(حال).
**إتحاد:** ئێکگرتن؛ ئێکەتی.
**الإتحاد:** ئێکەتی.
**الإتحادي:** ١- یێ سەر ب ئێکەتییەکێ ڤە. ٢- یێ تایبەتمەند ب ئێکەتییەکا سیاسی ڤە.
**الإتحاف:** دەولومەندکرن.
**إتحد:** ١- بوونە ئێک. ٢- رێککەڤتن. ٣- خۆ کرە ئێک.
**الإتخاذ:** وەرگرتن.
**إتخم:** حەبلی.
**أتخم:** هێلا بحەبلت.
**أتد:** ئەو کنفە یێ دهاڤێنە پێ چێلێ ل دەمێ دۆتنێ.
**إتدع:** ئارامبوو و خۆجهبوو و تەنابوو.
**إتدی:** خوین وەرگرت و تۆلا خۆ ڤەنەکر.
**الأترجة:** ترنج.
**الإتزان:** هەڤسەنگی.
**إتزر:** ١- هیزار ل خۆ کر. ٢- گونەهکر.
**إتزر:** پلەیا وەزیریێ وەرگرت.
**إتزن:** ١- هاتە کێشان. ٢- هاتە هەڤسەنگکرن.
**الإتساع:** ١- بەرفرهبوون؛ بەرینبوون. ٢- تێراکرن.
**الإتساق:** ١- ل دویڤێکهاتن و هەڤگرتن. ٢- د (علم البلاغة) دا دبیتە: تێکحەلیانا رامانا و ژێکنێزیکیا ئاخڤتنێ. ٣- سیستەمبوون.
**إتسخ:** ١- گوشتێ وی کێمبوو. ٢- قرێژبوو.
**إتسع:** ١- فرەهبوو. ٢- درێژبوو. ٣- دەستێ وی فرەهبوو.

**إتسق:** ١- رێکوپێکبوو و دورستبوو. ٢- کۆمبوو. ٣- دورستبوو و تژیبوو.
**إتسم:** ١- بۆ نیشانەک چێکر دا پێ بهێتە نیاسین. ٢- نیشانەک ل خۆ کر.
**الإتشاج:** پەیوەندی لێکبەستن.
**الإتشاح:** بەکۆشک گرێدان.
**إتشح:** بەرکۆشک ل پشتا خۆ کر.
**إتشر:** داخوازکر ددانێت وی تیژ بکەن.
**الإتصاف:** سالخەتداربوون؛ ب سالوخەت کەڤتن.
**الإتصال:** ١- پەیوەندیپێکرن. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: ژێکفەبونا مریدی ب سرا خۆ ژ هەر تشتەکی ژ بلی خودێ. ٣- پەیوەندیکرن.
**إتصال التربيع:** پێکڤەنانا دو دیوارا ب رەنگەکی کو لبنێت وان ب ناڤ ئێک بکەڤن.
**إتصف:** ١- سالوخەتێ وی هاتە کرن. ٢- بەرنیاس بوو ژ بەر سالوخەتێت وی یێت باش. ٣- ئەو سالوخەت ڤەگرتن. ٤- بوو خودان سالوخەت.
**إتصل:** ١- پەیوەندیکر. ٢- گەهەشتێ. ٣- خزمەتا وی کر.
**إتضح:** دیاربوو.
**إتضع:** ١- رەزیل و کێم بوو. ٢- دومۆربوو و بێعەسلبوو.
**إتطأ:** ب ساناهی لێهات و ئامادەبوو.
**الإتعاب:** وەستاندن.
**الإتعاد:** پەسەندکرنا ژڤانی.
**الإتعاظ:** شیرتگرتن.
**أتعب:** وەستاند.
**إتعد:** ١- ب ژڤانی قائیلبوو. ٢- ژڤان دانە ئێک.

**إتعظ:** ١- ب شیرەتێ کر و چێبوو. ٢- شیرەت پەسەندکر و پێ کر.
**الإتفاق:** رێککەڤتن.
**إتفاقية:** رێکەڤتننامە؛ رێککەڤتن.
**إتفق:** ١- پێکهاتن. ٢- نێزیکبوون و بوونە ئێک. ٣- دگەل رێکەڤت. ٤- وەسا چێبوو. ٥- رێکەڤت.
**الإتقاء:** خۆپارازتن.
**الإتقاد:** ئاگر تێ هلبوون، سۆتن.
**الإتقان:** خۆبسپۆرکرن د تشتی دا.
**إتقد:** ١- برسقی. ٢- سۆت؛ ئاگر تێ هلبوو.
**إتقى:** ١- خۆ پارازت. ٢- بوو تەقوادار.
**إتكأ:** پالا خۆ دا؛ پالڤەدا.
**الإتكاء:** پالدان؛ پالڤەدان.
**الإتكال:** پشتپێراستکرن؛ خۆ ب هویڤیا ئێکی ڤە هێلان.
**إتكع:** موکمبوو.
**إتكل(بتشديد التاء):** ١- پشتا خۆ پێ راستکر د کاری دا. ٢- پشتا خۆ پێ راستکر. ٣- پشتا خۆ پێ راستکر و باوەری پێ ئینا. ٤- خۆ ب هویڤیێ ڤە هێلا.
**الإتلاف:** نەهێلان؛ پویچکرن.
**إتلع:** بێسەروشوینبوو.
**الأتلع:** ستۆدرێژ.
**أتلف:** پویچکر.
**أتله:** بێ عەقل و پەریشان بوو.
**أتلي:** چوو.
**أتم(بتشديد الميم):** تمامکر.
**الإتمام:** تمامکرن.
**أتن(بتشديد النون):** دەقساند.
**إتناص:** ئاڤابوو.
**إتنتل:** د بەری راکر.

**إتنضى:** ١- ژ بەر خۆ کر. ٢- ژ کاڤلانی دەرئێخست.
**إتنفخ:** پوڤبوو.
**إتنقب:** پێچە بەردا سەر دێمێ خۆ.
**إتنقى:** ژێگرت.
**إتنكث:** ١- لێڤەبوو. ٢- سەرێ وی کرە داڤداڤ.
**الإتهام:** ١- گونەهبارکرن. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە گونەهبارکرنا نەفسا خۆ ب تەنێ.
**إتهب:** دان بۆ خۆ قەبیل کر.
**إتهم(بالتشديد):** گوەهبارکر.
**الأتون:** ١- کوچک. ٢- کوچکێ ئاگرێ سەرشۆێ. ٣- کۆمر. ٤- کۆمرا گێچێ.
**آتى:** ١- کر. ٢- دا؛ بەخشی.
**أتى:** هات.
**الآتي:** دەمێ بهێت.
**الإتيان:** هاتن.
**أث(بالتشديد):** لێک هاتە بادان و مشەبوو.
**الأثاث:** داروبارێ ناڤمالێ.
**الإثارة:** ئاراندن.
**الأثافي:** کۆما (أثفية)ە کو دبیتە پێکوچکێ کوچکێ دارا ئانکو بەرێ پێکوچکی.
**الأثالة:** ١- برنا رەھـ و ریشالا د ناڤ عەردی را. ٢- رەسەنبوون. ٣- ب رووماتکەتن و بلندبوون.
**الإثبات:** ١- سەلماندن. ٢- ل نک سۆفیان ئەوە کو مرید خۆ د هەر تشتەکی ب سەلمینت یان ژی دبیتە خۆجهکرنا بەردەوامیا ئەحکامێت عبادەتی.
**أثبت:** سەلماند.
**أثث:** ب داروبارێ ناڤمالێ خەملاند.
**الأثر:** ١- شوینوار. ٢- فەرمۆدا پێغەمبەری- سلاڤ لێ بن. ٣- ئەنجام. ٤- دەستکەڤتیێ تشتی. ٥- پرت. ٦- ل نک سۆفیا دبیتە: ئەو شوینە یان نیشانە یا ل جهێ تشتەکێ نەمای دمینت.
**آثر:** قەدرێ وی گرت، یان ژ خۆ چێترتر دانا.
**أثر(بالفتح):** ڤەگوهازت.
**أثر(بالتشديد):** کارتێکر.
**إثر:** ل دویف.
**الإثراء:** زەنگینکرن.
**الإثراب:** لۆمەکرن.
**الإثرار:** پرپێژیکرن.
**أثرب:** کۆما(ثرب) کو دبیتە بەزێ تەنکێ ل سەر عویر و رویڤیکا.
**أثرم:** ددانشکەستی.
**الأثرمان:** ١- شەڤ و رۆژ. ٢- دەم و مرن.
**أثرى:** مالێ وی زێدەبوو.
**الأثفية:** پێکوچک.
**أثقل:** گرانتر.
**أثكل:** زەلامێ جەرگسۆتی.
**أثل:** بوو خودان عەسل و بنیات.
**الإثل:** گیایەکێ ئاڤی یە ژ نفشێ گەزێ ئانکو کەڤزێ بەلێ گرترە و فێقیەکی ددەت دبێژنێ: (حب الإثل).
**الأثل:** جۆرە دارەکە ل دۆرێت ئاڤا ل عەردێت خیز شین دبت، بەلگێت وێ دهوبرن و کولیکێت وێ وەکی ئویشیانە، ژ بۆ جوانی دهێتە چاندن، دارێ وێ یێ قائم و باشە ژ بۆ چێکرنا سێنیک و فەرسەخینییێت مەزن دهێتە ب کارئینان.
**الاثلة:** ١- کەلوپەلێ ناڤمالێ. ٢- ئامویرێت کاری.
**الأثلق:** ١- فلفلا دێم. ٢- نەینۆک.
**الأثلم:** **١- دەڤلۆ. ٢- کەم؛** پرتەک ژێ ڤەکری.
**إثم:** ١- گونەھـ. ٢- مەی.
**آثم:** گونەهکار.
**الإثمار:** ١- بەرهەمدان. ٢- بەرهەمئینانن.
**الأثمد:** کل؛ سورمە.
**أثمر:** ١- بەرهەم دا. ٢- هێلا بەرهەمی بدەت.

**أثناء:** ل وی دەمی.
**الإثناعشري:** ١- ڕویڤیکەکە د ناڤبەرا مەعدێ و ڕویڤیکا زراڤ دا.
**أثنولوجيا:** زانستێ توخمێت مرۆڤی و سخلەت و ئەخلاقێ وی یە.
**أثنى:** پەسنا وی کر.
**الإثنين:** ١- دو. ٢- دوشەمب.
**الأثيث:** جهێ گەلەک گیا لێ.
**الأثير:** ١- فەلەکا نەهێ یە، کۆ دبیتە فەلەکا گۆیا ئاگری. ٢- جەوهەرێ شیری. ٣-کەرەستەیەکە نا هیتە کێشان، دەنگ و گەرمی ژ پێلێت وی چێدبن. ٤- کاریگەر.
**الأثيل:** ١- خودان عەسل. ٢- ب ڕه و ڕیشال. ٣- مکوم و ستویر. ٤- ستویر ب ڕه و ڕیشال.
**الأثيم:** گونەهبار.
**أج:** سویربوو.
**الإجئيلال:** ترس.
**أجاب:** بەرسڤ دا.
**الإجابة:** ١- بەرسڤدان. ٢- ل نک سۆفیا دو بەرسڤدانن، ئێک ئەوە یا دبیتە (إجابة إمتثال) کو بەرسڤا فەرمانا خودێ یە، یا دووێ ژی دبیتە (إجابة إمتنان) کو دبیتە بجهئینانا وێ داخوازێ یە ژ لایێ خودی ڤە یا خەلک ژێ دکەن.
**أجاج:** سویر.
**الأجارة:** ١- خەلاتکرن. ٢- بەختدان و پارازتن. ٣- ب کرێدان.
**أجاز:** دەستویری دا.
**الإجارة:** مۆرکرنا گرێبەستەکێ ل دۆر قرەبوکرنێ ب دراڤی.
**الإجازة:** دەستویرینامە؛ دەستویری.
**الإجاص:** حولیک.
**إجاص شائك:** حولیرەشک.
**أجان:** شەرگەها مرۆڤی.
**الإجانة:** تەشتا جلشویشتنێ.
**الإجبار:** شۆلپێکرنا ب خورتی.
**أجبر:** نەچارکر.
**أجبى:** فرۆت بەری بگەهیت.
**الأجة:** دژواریا گەرمێ.
**إجتاز:** دەربازبوو.
**إجتبى:** ١- خڕکر. ٢- ژێ گرت.
**الإجتباء:** ژێکرتن.
**الإجتباء المحض:** ل نک سۆفیا ئەو ژێگرتنە یا خودێ د دەرحەقێ بەندێ خۆ دا دکەت نە ژ بەر کریارێت وی.
**الإجتذاب:** هەڤکێشان.
**الإجتراء:** ڤەکیان.
**الإجتلاب:** ئینان.
**إجتلى:** خۆ ل هویڤییێ گرت.
**الإجتماع:** کومبوون.
**الإجتماعي:** جڤاکی.
**إجتمع:** کۆمبوو.
**الإجتناء:** چنین.
**إجتنى:** چنی.
**الإجتناب:** خۆ دانەپاش.
**الإجتهاد:** ١- زیرەکی. ٢- دانا فەتوێ.
**إجتهد:** زیرەکبوو، فەتوە دا.
**الإجتياح:** ستاندن و ڤێڕاچوون.
**الإجتياز:** دەربازبوون.
**أجج:** هێرشکر.
**الإجحاف:** کێمکرنا زێدە ژ حەدی.
**أجحر عنه:** لێ پاشکەڤت؛ لێ گیرۆبوو.
**أجحره إلى:** بەرێ وی دایێ.
**أجحف:** ١- زۆرداریکر. ٢- حەق خوار.
**أجدا:** بێ منەت کر.
**الأجدع:** دفنبڕی.

**الأجذم:** ئەوێ ئێشا پنیا لێ.
**أجذم:** دەستبڕی.
**أجر(بتشدید الجیم):** کرێکر.
**الأجر:** ١- خەلات. ٢- پاداشت.
**الإجراء:** ١- کریار. ٢- هەرکاندن. ٣- چارەسەری. ٤- کارێ چارەکرنێ.
**أجرب:** گوری.
**الإجرة:** کرێ.
**الآجرة:** ١- کەرپویچ. ٢- قرمید.
**الأجرد:** ١- پویتکورت. ٢- رویت؛ بێ پویت. ٣- بێ زبن و کورتان.
**أجرس:** تشتێ خرمرخم ژێ دهێت دەمێ دهێتە خوارن.
**أجرسي:** ناڤێ جۆرەکێ خورمێ یە.
**الأجرع:** خیزێ گیا لێ شین نەبت.
**أجرم:** جنایەتکارتر.
**أجری علیه:** ل سەر بەردەوام کر.
**أجری له الحساب:** ل سەر نڤیسی.
**أجری:** هەرکاند؛ برێڤەبر.
**أجزل:** ١- مشەکر؛ کرە گەلەک. ٢- مەزنکر.
**الأجشع:** یێ تەماعتر.
**أجفل:** زوی رەڤی.
**الأجـل:** ١- دەمـێ مرنـێ. ٢- دویماهیا عەمری. ٣- دەرفەت. ٤- دەم.
**أجل(بتشدید الجیم):** ب پاش ئێخست.
**أجل:** بەلێ.
**الإجل:** کەرێ ژ هەر جۆرێ حەیوانەکی.
**الإجلاء:** دەرئێخستن.
**الإجلاس:** روینشتندان.
**الإجلال:** ١- رێزگرتن. ٢- مەزنکرن.
**الآجلة:** رۆژا قیامەتێ.
**إجلس:** بروینە.
**الأجم:** ١- بویش. ٢- دارستان.
**أجم:** شاریا؛ گەرما وی دژوار بوو.
**أجم:** کۆچ؛ بێ شاخ.
**الإجماع:** ١- تێکرایی؛ باهرا پتر. ٢- رێککەڤتنا ب تەڤایی ل سەر تشتەکی.
**الإجتماع المرکب:** رێکەڤتنا ل سەر حوکمەکی دگەل نەرێکەڤتنێ ل سەر ئەگەرێ حوکمی پویچ دکەت، بۆ نموونە حەنەفی و شافعی د رێکەڤتی نە کو دلڕابون و دەستکرنا ژنا بیانی دەستنڤێژێ دئێخن، بەلێ ل نک حەنەفیا ب دلڕابوونێ یە و ل نک شافعیا ژی دەستکرنە.
**الإجمال:** ١- تەڤاییکرن. ٢- قەنجی.
**الأجمة:** بویشێ شێری.
**أجمع:** هەمی.
**أجمل:** جوانتر.
**الآجن:** گەنی.
**أجن:** گەنیبوو، ئانکو رەنگ و تام وبێهن هاتنە گوهۆرین.
**الأجنف:** یێ خوار.
**أجنی:** دا؛ بەخشی.
**الإجهاد:** وەستاندن.
**الإجهار:** بلندگۆتن، گۆتنا ب دەنگێ بلند.
**الإجهاش:** دەست ب گری کرن.
**الإجهاض:** ژبەربرنا بچویکی.
**الأجهر:** کەسێ ب رۆژێ نەبینت.
**أجهز:** هێرش کرە سەر و کوشت.
**أجود:** باشتر.
**الأجوف:** یێ خلۆلە.
**الأجیج:** دەنگ و پێژنێت مرۆڤا بێت کەس تێ نەگەهت.
**الأجیر:** ١- پالە. ٢- خولام. ٣- کرێگرتی.
**الأجیر الخاص:** ئەو پالەیە یێ ژ دەمەکی بۆ دەمەکی دهێتە گرتن، ل وی دەمی چ شۆل بکەت یان ژی شۆل نەکەت هەر کریا خۆ وەربگریت.
**الأجیر المشترک:** ئەو پالەیە یێ بۆ گەلەک کەسا شۆل دکەت.

**أجير الوحد:** ل (أجير الوحد) بزڤرە.
**الأح:** سپیلکا هێکێ.
**أح(بالتشديد):** کوخی.
**الأحابيش:** کۆما (أحبوش)ە دبیتە کۆما مرۆڤا یا هەر ئێک ژ عیلەکێ.
**الإحاح:** ١- تێهن. ٢- کەرب.
**الأحاد:** ژمارەییێت کت.
**أحاط:** ١- ل دۆر زڤری. ٢- هەمی ڤەگرت.
**الإحاطة:** زانینا تشتی ب شێوەیکێ تەکووز ژ هەمی لایان ڤە.
**الإحالة:** ١- رەوانەکرن؛ هنارتن. ٢- ڤەگوهازتن. ٣- ل بەرچاڤ دانان. ٤- د (علم الطبيعة) دا دبیتە: گوهۆرینا کاودانێ تشتی وەکی ساریێ بۆ گەرمییێ یان بەروڤاژی.
**أحب:** ڤیا؛ حەژێ کر.
**الإحباط:** ١- بێهویڤیکرن. ٢- پویچکرن.
**أحبش:** کۆما هەر ئێک ژ عێلەکێ و کۆما وێ (أحابش)ە.
**أحبوش:** کۆما هەر ئێک ژ عێلەکێ و کۆما وێ (أحابيش)ە.
**إحتال:** حیلەکر.
**الإحتباس:** راوەستیانا تشتی و نە دەرکەڤتنا وی.
**الإحتباس الحراري:** نەدەرکەڤتنا گەرمێ ژ کویفێ بایێ ل دور عەردی ژ بەر نەدەرکەڤتنا تیژکا پیلدرێژا رۆناهیێ ژ ئەگەرێ زیدەبوونا غازێت (ثاني أوكسيد الكاربون وميثان واوكسيد النايتروس) بێت **کو** نەهێلن گەرما عەردی دەرکەڤیتە عەسمانی کو د ئەنجام دا دبیتە ئەگەرێ بلندبوونا پلەییێت گەرمێ ل سەرانسەری دنیایێ وحەلیانا جەمەدێ ل هەردو جەمسەرێت عەردی.
**الإحتجاب:** خۆڤەشارتن؛ خۆ پەردەپۆشکرن.
**الإحتجاج:** دیارکرنا نەرازیبوونێ.

**الإحتجام:** ١- خوینبەردانا پشتێ. ٢- پێکوەرهاتن و مانا وەک خۆ.
**إحتجر الشئ:** کرە کۆشا خۆ.
**الإحتدام:** دژواربوون.
**الإحتراب:** ڤێکراچوون و شەرێدگەلێککرن.
**الإحتراز:** خۆپارازتن.
**الإحتراس:** هشیاری.
**الإحتراش:** نێچیرا حەفتیارا.
**الإحتراف:** پیشەداری؛ خۆکرنا خودان پیشە.
**الإحتراق:** سۆتن.
**الإحترام:** رێزگرتن.
**أحجية:** تشتیک، مامک.
**الإحتساب:** ١- هلبژارتن. ٢- گۆتنا: (خودێ بەسسی منە).
**الإحتشاد:** خرڤەکرن.
**الإحتشام:** ١- خولامەتی. ٢- شەرمکرن.
**الإحتضار:** ١- کەتنا بەر مرنێ. ٢- ئامادەبوون.
**إحتضر:** کەتە بەر مرنێ.
**إحتضن:** کرە د کۆشا خۆ دا.
**إحتطب:** دار بۆ خڕکرن و برن.
**إحتف به:** ل دۆر زڤری.
**الإحتفاظ:** پارازتن.
**الإحتفال:** ئاهەنگگێڕان.
**إحتفظ:** هلگرت و پارازت.
**إحتفل:** ١- ئاهەنگ گێرا. ٢- پویتەکر.
**الإحتقار:** ١- بچویکرن. ٢- کێمکرن.
**الإحتقان:** تێ وەستیان.
**إحتقب:** چانتە هلکرت.
**إحتقر:** ب چاڤەکێ کێم بەرێ خۆ دایێ.
**الإحتكار:** هلگرتنا متای بۆ رۆژا گرانییێ یان گرانبوونێ.
**الإحتكاك:** تێکدان؛ تێکهوسین.
**إحتكل:** ل بەر ئالزی و ئاشکرا نەبوو.
**الإحتلاب:** دۆشین.
**الإحتلال:** داگیرکرن.
**الإحتلام:** شەیتانهاتنەیا جەحێلی.

**إحتلم:** شەیتان هاتیَ.
**الإحتماء:** ١- خۆپارازتن. ٢- داخوازا هاریکاریێ.
**الإحتمال:** ١- دویرنەدیتنا رویدانا تشتی. ٢- هلگرتن. ٣- د فەلسەفێ دا: تیۆرەکا یۆنانی یە باوەریا بێ گومان رەتدکەت و هەمی زانینێ ل سەر بنیاتێ هاتویاتێ ئاڤادکەت. ٤- د (اللاهوت)ێ دا دبیتە: ئاراستەکرنا کریارێ بۆ کارێ ب جهئینانێ.
**الإحتمالیة:** بیرازەکا فەلسەفی یە دبێژت چو رێ ناچنە راستیا رەهائی تنێ ئیحتمالا تێدا هەی.
**إحتمل:** ١- هلکرت. ٢- هزرکر کو دێ چێبت.
**إحتمی بە:** ١- داخوازا هاریکاریێ ژێ کر. ٢- خۆ پێ پارازت.
**الإحتواء:** ١- ڤەگرتن. ٢- ستاندن.
**إحتوی:** ڤەگرت؛ تێدایە.
**الإحتیاج:** پێدڤیبوون.
**الإحتیاز:** ١- ڤەگرتن؛ حەواندنا تشتی. ٢- ب دەسڤەئینان.
**الإحتیاط:** یەدەک؛ تشتێ زێدەیێ بۆ دەمێ پێدڤی دهێتە هلگرتن.
**الإحتیال:** حیلەکرن.
**الإحثال:** خوارنا خراب.
**الإحجام:** راوەستاندن.
**أحجم عن کذا:** پشت و پشت زڤری ژ ترسادا.
**الأحد:** ١- ئێک. ٢- ئێکێ نەهژمارەک ل پێش و نە ئێک ل پاش. ٣- یێ خۆ ڤەدەرکری و هێلایە ب تنێ. ٤- یێ ئێکانە. ٥- یێ بێ وێنە. ٦- ژ ناڤێت خودێ یە. ٧- ئێکشەمب. ٨- ل نک سۆفیا ناڤێ ذاتێ خودێ یە بەلێ ب ژێکرتنا گەلەک ناڤ و سالوخەت. ٩- یێ ئێک و ڤەدەر.
**أحد(بالتشدید):** ١- کرە ئێک. ٢- باوەری تنێ ب وی ئینا. ٣- گۆتی: (لا إلە إلا اللە).

**إحدی بنات طبق:** ١- مسیبەت؛ بەلا. ٢- مار.
**الأحداث:** کۆما (حادثة)ە کو دبیتە رویدان.
**الإحداث:** ڤەدیتنا تشتێ دەم ل پێش.
**الإحداثیات:** کۆمە و کتا وێ (إحداثیة)ە؛ ئەو نمرە و ژمارەنە یێت کو جهـ و سەمت و دویربیێت جهەک ژ جها ل سەر نەخشێ دەڤەرەکێ پێ دهێنە دەستنیشانکرن ژ بۆ ڤیکەڤتنا وی.
**أحدب:** پشتقۆف.
**أحدث:** ریت.
**أحدی علیە:** تنگژی.
**أحدوثة:** تشتێ ژ نوی چێکری.
**الإحدیة:** ١- ئێکانەتی. ٢- ل نک سۆفیا تەجەللایا ژاتێ خودێ یێ خورستە یە بێی ناڤ و سالوخەت.
**الأحری:** یێ چێتر.
**الإحراریة:** ناسناڤێ سنسلا نەقشەبەندیایە هەر ژ (أبو بکر الصدیق) خودێ ژێ رازی بت و پێدا هەتا دگەهیتە مولانا خالد دامەزرێنەرێ رێبازا (المجددیة) یان ژی (الخالدیة).
**الإحراز:** بدەستڤەئینان.
**الأحراش:** دەحل و بویش.
**الإحراق:** سۆتن.
**الإحرام:** کاروبارێت دەستپێکرنا روکنێت حەجێ.
**أحرج:** ١- بەرێ ویدا. ٢- حەراجکر. ٣- ئێخستە تایێ شەرمێ.
**الأحرف الذلاقة:** پیتیت تیژ یان برەک، دبنە (٦) پیت سێ ژێ ب لێڤا دهێنە گۆتن دبێژنێ(الذلقیة) ئەو ژی (باء، فاء، میم)ن، و هەر سێێت دی ب سەرێ ئەزمانی دهێنە گۆتن دبێژنێ(الذولقیة) ئەو ژی (لام، راء، نون)ن.

**الأحرف الشمسية:** ئەو پیتن ییّت کو دکەڤنە سەرێت ناڤا و دەمێ ب (ال)ێ دهێنە ناساندن پیتا (ل) نەهێتە خواندن کو دبنە ئەڤە(ت، ث د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ظ، ط، ل، ن).

**الأحرف القمرية:** ئەو پیتن ییّت دکەڤنە سەرێت ناڤا و دەمێ ب(ال)ێ دهێنە ناساندن پیتا (ل) دهێتە خواندن کو دڤێ ڕستێ خڕڤەبووینە (إبغ حجک وخف عقیمه).

**أحرق:** سۆت.

**الأحرق:** یێ پتر دسۆژیت.

**أحرى:** باشتر؛ ژهەژیتر.

**أحزن:** ١- خەمگینتر. ٢- یێ زڤرتر.

**أحس:** هەستکر.

**الإحساس:** هەست.

**الإحسان:** ١- قەنجی. ٢- کرنا قەنجییێ. ٣- ئەو عبادەتە یێ مرۆڤ ب وی ڕەنگی دکەت هەر وەکی خودێ دبینت.

**أحسن:** باشتر.

**أحسن الخالقين:** باشترین چێکەر کو خودێ یە.

**أحسن القصص:** باشترین چیرۆک کو د قورئانێ دا هاتینە.

**أحسن تقويم:** باشترین موکمی قایمی یا چێکرنێ.

**أحسنت:** ئافرین؛ تە قەنجکر.

**الأحشاء:** هناڤ.

**أحصى:** ئامارکر.

**الإحصاء:** ئامار؛ سەرژمێرێ.

**الإحصار:** ١- نەهێلان و زیندانکرن. ٢- نەهێلانا کرنا کارەکی.

**الإحصان:** ١- پارازتنا ژنێ ب دانەشوی یا وێ و زەلامی ب ژنئینانا وی. ٢- موکمکرن وئاسیکرن.

**أحصن:** پارازت.

**أحصى:** ١- هژمارت. ٢- هژمارا وی زانی.

**الإحضار:** ئامادەکرن؛ حازرکرن.

**الإحضارية:** داخوازنامەیا کەسەکی پێ ل دادگەهێ ئامادە دکەن.

**الأحطب:** یێ لەغەر و لاواز.

**أحفاد:** کۆما (حفيد)ە کو دبیتە نەڤی.

**أحق:** حەقتر.

**أحقاب:** کۆما (حقب)ە کو دبیتە هەشتێ سال، دیسان بۆ دەمی ژی دهێت.

**أحقاد:** کۆما (حقد)ە کو دبیتە کین.

**الأحقاف:** کۆما (حقف)ە کو دبیتە گرێت خیزی ییّت لێکبادایی.

**الإحقاق:** ١- بجهئینان. ٢- حەقکرن. ٣- فەرکرن.

**أحقر:** ١- بچویکتر. ٢- بێ بهاتر.

**أحک:** بێ ددان؛ لەمۆ.

**إحكام:** موکمکرن؛ زەپکرن.

**الإحكام:** ١- مکومکرن. ٢- باش گرتن. ٣- ل نک سۆفیا ئەوە کو ئەگەر خودێ ڤیا بەندەکی ب هیزبێخت ل سەر وی تشتێ وی بڤێت دێ جلکێ سالوخەتێت ذاتێ خۆ ل بەرکت.

**الأحكام:** کۆما (الحكم)ە کو دبیتە بڕیارا دادوەری یان یاسایا دا دادێ.

**أحكام إنتقالية:** ئەو یاسانە ییّت کو بەروەخت چاڤدێریێ ل کاودانا دکەن هەتا کو یاساییّت ب دۆم دهێنە دانان.

**أحكم:** ١- زاناتر. ٢- عادلتر. ٣- موکمتر.

**أحكم الحاكمين:** ١- عادلترین عادل. ٢- زاناترین زانا. ٣- دەستهەلاتدارترین دەستهەلاتدار.

**الأحل:** ١- زەلامێ لەغەر. ٢- زەلامێ بێ هش و بیر.

**الإحلاء:** شرینکرن.

**الأحلاف:** ١- کۆما (حلف)ە ئانکو پەیمان یان قولپ. ٢- بێت سویندخواری.
**إحلال:** ١- پەیداکرن. ٢- حەلالکرن.
**أحلام:** کۆما (حلم)ە کو دبیتە خەون، هەر وەسا عەقل ژی.
**أحلی:** شرینتر؛ جوانتر.
**إحليل:** میزی.
**أحم:** ڕەش.
**الإحماء:** ١- گەرمکرن. ٢- شاراندن.
**الإحماد:** پسنکرنا باش.
**الإحماض:** ترشکرن.
**الأحماض:** کۆما (حامض)ە کو دبیتە ترش.
**إحمال:** بارکرن.
**أحمد:** ئەوێ ژ خلکی پتر سوپاسدار و رازی.
**أحمر:** سۆر.
**الأحمران:** گوشت و مەی.
**أحمر الصباغين:** ڕووناس.
**الإحمرار:** سۆربوون.
**الأحمس:** سالا سەخت و بێ خێر.
**الأحمق:** بێعەقل.
**الإحناء:** خزارکرن.
**الأحنف:** ١- ڕاست و دورست. ٢- پێ خوار.
**أحوج:** پێدڤیتر.
**الأحوال:** کۆما (حال)ە ئانکو کاودان، ل نک سۆفیا ئەو تشتە یێ دکەڤیتە دل یان دل دکەڤیتێ ئەو ژی دو جۆرن: أ- کرامات الأولیاء: کو ژ ئیمانێ و تەقوایێ چێدبن. ب- الأحوال الشیطانیة: کو ژ وان کارا چێدبن یێت کو خودێ وپێغەمبەرێ وی سلاڤ لێ بن فەرمان ب نەکرنا وان کرین.
**أحور:** چاڤبەلەک.
**أحوط:** پتر دپارێزت.
**أحول:** چاڤوێر.
**إحياء:** زیندیکرن.
**أحياء:** کۆما (حی)ە کو دبیتە زیندی، زیندەوەر.
**أحيانا:** هنەک جاران.
**أحيل:** فێلبازتر.
**أخ:** برا.
**إخاء:** براینی.
**الأخاضر:** زێر و گوشت و مەی.
**إخافة:** ترساندن.
**إخباء:** ڤەشێران.
**الإخبات:** ١- کەتنا ناڤ عەردێ ڕاست و بەرین. ٢- نەمانا ل بەر چاڤا. ٣- پشتراستبوون ب خودێ و ژێترسیان. ٣- ل نک سۆفیان دەستپێکا تەناهیا دلی ب ئیمانێ کو خۆپارێزی شەهوەتێ بکوژیت و حەزا عبادەتێ بێئاگەهیێ نەهێلیت و سەبرهاتنا ب خودێ داخوازا نەهێلیت.
**أخبار:** کۆما (خبر)ە کو دبیتە نووچە؛ دەنگوباس.
**الإخبار:** گەهاندنا نووچەی.
**الأخبثان:** میز و گوی.
**أخت:** خویشک.
**إختار:** هلبژارت.
**إختان:** خیانەتکر.
**الإختتان:** سونەتکرن.
**الإختباء:** خۆڤەشارتن.
**إختبار:** ١- جەرباندن، سەربۆرکرن. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: سەربۆرکرنا ڕاستگۆیا ژ لایێ خودێ حەق ڤە.
**إختبر:** بجەرببینە.
**الإختتام:** ب دویماهیهاتن.
**الإختتان:** سونەتکرن.
**إختتم:** ب دویماهی ئینا.
**الإختداع:** خاپاندن.
**الإختراص:** درەوکرن.
**الإختراع:** چێکرن؛ ئافراندن.
**الإختراف:** بێهشوبیربوون.

**الإختراق:** سمتن؛ تێبەهین.
**الإخترام:** بڕین.
**إخترص:** درەوکر.
**إخترع:** چێکر؛ ئافراند.
**إخترق:** سمت؛ تێبەهی.
**إخترم:** بڕی.
**إختزال:** ژێبڕینا کێم بکەت.
**إختزل:** ژێ بڕی و ڤەکر و کێمکر.
**إختص:** ١- تایبەتمەندی کر. ٢- جوینەک هلبژارت بۆ یا وی دڤێت.
**الإختصار:** کورتکرن.
**الإختصاص:** تایبەتمەندی.
**الإختصاصي:** تایبەتمەندی.
**الإختصام:** لێککەڤتن.
**إختصم:** شەرکر.
**الإختطاب:** ١- خوتبەخواندن. ٢- دگەل ئێکئاخڤتن.
**الإختطاف:** راڕەڤاندن.
**الإختفاء:** خۆڤەشارتن.
**إختفى:** بەرزەبوو.
**الإختلاب:** ١- خرشکرن. ٢- بزداندن.
**الإختلاج:** لڤین.
**الإختلاس:** دزیا یاسایی ئانکو یا ڕیکەکا فەرمی بۆ هاتیە دیتن کو ژبنڤە دزی بت و ژ سەر ڤە نە، بۆ نموونە کەسەک پێنجی تشتا بکڕیت و بهایێ وان بدەت و د پسۆلێ دا هەشتێیا بنڤیست ئانکو بهایێ سیهت تشتیت دی بکەتە بەرویکێ.
**إختلاط:** تێکهەلی؛ تێکهەلبوون.
**الإختلاع:** ١- خەلاندن. ٢- ژنبرن. ٣- ژنیراکرن.
**الإختلاف:** نەوەکئێکی؛ ژێکجودایی.
**إختلال:** تێکچوون.
**إختلج:** لڤی.
**الإختناق:** خەندقین.
**إختنق:** خەندقی.

**الإختیار:** ١- هلبژارتن. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: هلبژارتنا ئەوا خودێ بۆ وان هلبژاتی نەیا خۆ.
**الإختیال:** خۆمەزنکرن.
**الأخثم:** یێ دفن مەزن.
**الأخدب:** یێ بەژن درێژ.
**الأخدر:** شەڤا تاری.
**الأخدري:** کەرێ کویڤی.
**الأخدع:** ١- دەمارا ستۆی. ٢- یێ دژوار.
**الأخدعان:** هەردو دەمارێت ستۆی.
**الأخدنة(النمال):** جانەوەرەکێ شیردەرە و هێکا د کەت، ل ئۆسترالیا هەیە.
**الأخدود:** ١- خەندەک. ٢- تیک. ٣- چالا درێژ.
**أخذ:** ١- وەرگرت. ٢- گرت و تێبر. ٣- بر.
**الأخذ:** ١- وەرگرتن. ٢- گرتن وتێبرن.
**أخر(بالتشدید):** ١- ب پاش ئێخست. ٢- گیروکر.
**الأخرى:** ١- یا دیتر. ٢- رۆژا قیامەتێ.
**الإخراب:** خرابکرن.
**الإخراج:** ١- دەرئێخستن. ٢- د دادگەها دا دبیتە: دویرکرنا هەڤرکەکی ژ هەردو هەڤرکا ژ کارێ هەڤرکیێ. ٣- د زانستێ جانەوەران دا دبیتە: دەرئێخستنا پشماییت ب زیان ژ لەشی وەکی خوهێ. ٤- د شانۆگەریێ و سینەماییێ دا دبیتە: دەرهینان ئانکو ڤەگوهازتنا شانۆگەریی یان چیرۆکێ ژ دەقی بۆ کارێ دراماییی.
**الأخرب:** ١- یێ خرابتر. ٢- یێ گوهـ شەق. ٣- د عرووزێ دا دبیتە ڕاکرنا (میم) و (نون)ا ژ تەفعلێ وەکی ڕاکرنا وان ژ (مفاعیلن) دا ببیتە (فاعیل) کو ل شوینا وی (مفعول) دهێتە دانان. ٤- یێ ترسنوک.
**الأخرة:** ب گرانی.
**الآخرة:** ١- دویماهی. ٢- رۆژا قیامەتێ.

**أخرج:** دەرئێخست.
**الأخرس:** لال.
**أخرق:** ١- بێعەقل. ٢- ئاقلسڤک.
**الأخرم:** ١- یێ دفنبری. ٢- د عرووزێ دا دبیته ڕاکرنا پیتا ئێکێ ژ تەفعیلێ وەکی ڕاکرنا وێ ژ (فعولن) دا ببیته (عولن) و ژ (مفاعلتن) دا ببیته (فاعلتن).
**الأخزر:** چاڤهویر.
**الأخزل:** پشتشکەستی.
**الأخزم:** مارێ نێر.
**الأخس:** یێ بێبها.
**إخسار:** خوسارەتکرن.
**الأخسر:** خوسارەتتر.
**الأخشب:** ١- یێ ستویر. ٢- یێ ڕق.
**الأخشم:** دفنمەزن.
**أخشن:** گرتر.
**إخشوشب:** ڕەق بوو وەکی داری لێ هات.
**أخص:** تایبەتیتر.
**الإخصاء:** خەساندن.
**إخصائي:** تایبەتمەند.
**الإخصاب:** ڤێککەڤتنا دو شانەیان: شانەیا نێر(تۆڤێ نێر) و شانەیا مێ (هێک)ێ دا کو ببیته تشتەکێ بجان.
**أخضر:** کەسک.
**الإخضرار:** کەسکبوون.
**الأخضع:** بندەستکری.
**إخضوضر:** کەسکبوو.
**أخطأ:** ١- خەلەتکر. ٢- خەلەتبوو.
**الإخطار:** ئاگەهدارکرنا ب هۆشداری؛ ئاگەهدارکرنا ب مەترسی.
**الأخطبوط:** ژ ئاژەلێت دەریایێ یە هەشت پێ پێت ب سەرێ وی ڤە.
**الأخطر:** بمەترسیتر.
**الأخطل:** ١- گوهبچویک. ٢- یێ شاشتر. خەلەتتر. ٣- کەرەمرۆڤ. ٤- ناسناڤێ شاعرێ ئەمەوی یە یێ ناڤێ وی (غیاث بن غوث).
**الأخطم:** ١- دفندرێژ. ٢- یێ ڕەش.
**أخف:** سڤکتر.
**أخفى:** ڤەشارت.
**الإخفاء:** ڤەشارتن.
**الإخفار:** ١- شکاندنا سۆز و پەیمانا. ٢- غەدرکرن.
**الإخفاف:** سڤککرن.
**الإخفاق:** خوسارەتبوون؛ نەسەرگرتن.
**الأخفش:** چاڤڕاشکەستی و باچرو.
**أخفض:** نزمتر.
**الإخلاء:** ١- خالیکرن؛ ڤالاکرن. ٢- د یاسایێ دا دبیته: هێلانا پارچەیا عەردی و زڤڕاندنا وی بۆ خودانی.
**إخلاء السبيل:** بەردانا و ئازادکرنا گونەهباری ل دویڤ بڕیارا دادوەری.
**الأخلاء (باتشديد اللام):** کۆما(خليل)ە کو دبیتە هەڤال.
**الأخلاء:** ١- زەلامێت بێ ژن. ٢- ژنێت بێ مێر.
**الإخلاص:** ١- ئەختوباری. ٢- کرنا عبادەتێ بێ ڕویمەتی. ٣- عبادەتێ تنێ بۆ خودێ. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە: دەرئێخستنا چێکریا ژ هەر سەرەدەریەکا دگەل خودێ دهێتەکرن، یان خوڕستیا کاری ژ ڕویمەتیێ و بایێ نەفسێ. ٥- ناڤێ سوورەتەکا قورئانێ یە.
**أخلاف:** کۆما(خليفة)یە کو دبیتە شوینگر، شوینوار.
**الإخلاف:** شکاندنا سۆز و پەیمانا.
**الإخلال:** تێکدان.
**أخلف:** ب جهـ نەئینا.
**الأخلف:** ١- مرۆڤێ چەپ. ٢- مارێ نێر. ٣- کەرەمرۆڤ.
**أخلى:** ڤالاکر.
**الأخمص:** ١- چالا پێی. ٢- قوونتاخا تڤەنگێ.
**الإخناق:** خەندقاندن.
**الأخنس:** دفنکورت.

**الأخنسية:** جوینەکێ خوارجابوو؛ دویڤچوویێت (أخنس بن قبس)ی بوون.
**إخوان الشياطين:** برایێت شەیتانا.
**إخــوان الصــفا:** ١- برایێــت ب ئــەختوبار. ٢- جڤاتــا وان زانایــا بــۆ یــاکو ل نیڤــا سەدســالیا چــارێ کــۆچی ل ب بەغــدا و بەســرایێ هاتیــە پێکئینــان و کــاردکر ژ بــۆ تێکهـــەلکرنا شـــەریعەتێ ئیســـلامێ و فەلسـەفا یۆنانی و بـەلاڤکرنا پەندا یۆنـانی ل وەلاتــێ ئیســلامێ و شــیان ب وەشــاندنا نیزیکـی (٥٠) نامـەیان ل دۆر وێ چەنـدێ رابن.
**الإخوانيات:** کۆما (إخوانية)ە کو دبیتە نامـەیا براینییێ.
**الأخوص:** چاڤتەبقی.
**أخوف:** بترستر.
**الأخوق:** ١- مرۆڤێ ب چاڤەکـــی. ٢- بەرین.
**إخونة:** سفرەکا زادی.
**أخوي:** برایی.
**الأخيار:** ل نک سۆفیان خودانێت دیتن و کـار و بزاڤن یێت کـو رێکا عـەسمانی دیتـین و ئێدی پویتـە ب ئەگـەرێت عـەردی نـەکرین و خۆ ب بەنکێ خودێ ڤـە گرتین و پویتـە ب پەیوەندییێت چێکریا نەکرین.
**الأخية:** کنفەکە دو تـا دکـەن و دکەنـە د ئـەردی را وەکـی خەلـەکێ دیـار دکـەت، دەوارا پـێ گرێ ددەن.
**أخيذ:** ئێخسیر؛ دیل؛ گرتی.
**الأخيذة:** کەلـەپوبرت؛ پویرە.
**أخير:** باشتر.
**الأخير:** یێ دویماهییێ.
**الأخيف:** یێ چڤەکێ وی رەش و یێ دی شین.
**أخيـــل:** ١- خالـــدار. ٢- ب مـــەزناهیتر. ٣- غوریرتر.
**الأخيل:** بالـندەیێ بووکجوهی؛ کەرکێ کـەراجۆ؛ قـەرەژۆک؛ کـەرهاژۆ؛ قەلـەشـینک؛ قرهـاژۆ؛ کەراجۆک؛ کەرکێ کەراژۆ.
**الأخيلة:** گیایێ بێویژان.
**الأخيليــا:** جــۆرەکی گیایـــە؛ بـــەلگێت وی بێهنــــدارن و کولیلکێـــت وی د ســـپی و ئــەجوانی نــە، بلنــدیا وی دگەهیتــە (١٠) سەنتیمیترا.
**الأخينوس:** جۆرەکێ گیایە ل بەر لێڤێت رویبار و کانیــا شــین دبــت، کولیلکێــت ســپی ددەت(یۆنانی) یە.
**الأخيـون:** گیایەکـە ژ نفشـێ ئـەزمانگاکی وەک دەرمان ژ بـۆ راکرنا بلغـەمی و زێدەمیزتنێ ئاکو چارەکرنا میزەواقییێ دهێتە ب کارئینان (یۆنانی) یە.
**أدا:** کیان، وەکی کیانا دەوی.
**الأداء:** ١- بجهئینان. ٢- ئەداکرنا ئەرکی.
**آداب:** کۆما (أدب)ە کو دبیتە تۆرە.
**الأداة:** ئالاڤ؛ ئامیر.
**أدار:** ١- برێڤەبر. ٢- لێک زڤراند.
**الإدارة:** کارگێری.
**أدام:** بازرگانی کەڤلی.
**الإدام:** پێخوارن.
**أدام:** بەردەوامی پێ دا.
**الإدامــة:** ١- بەردەوامکرن. ٢- سەخبێرکرن.
**الإدانة:** گونەهبارکرن.
**الأداني:** یێت نێزیک.
**الإداوة:** ١- ئامانــەک بــوو ژ کــەڤلی دهاتــە چێکرن بۆ زادی. ٢- مەسین.
**أدب:** ١- تۆرە. ٢- هەر زانینەکا ب ئـاخڤتن و نڤیسینێ ڤە گرێدایێ.
**الإدبار:** پشتدان.
**أدبر:** ١- رەڤی؛ پشت دا. ٢- مر و چوو.
**إدخال:** داکرن.

**إدخر:** هلگرت.
**أدخل:** کره ژۆر؛ داکر.
**إدراج:** ل ناڤکرن.
**الإدرار:** ١- میز. ٢- میزتن. ٣- هەرکاندن. ٤- بەخشین.
**الإدراک:** زانینا تەڤایا تشتی.
**الإدران:** ڤریژیکرن.
**الأدرد:** لەمۆ؛ بێ ددان.
**أدرک:** ١- زانی. ٢- ڤێراگەهەشت.
**الأدرة(بالضم والسکون):** یێ گونۆبووی.
**الأدرم:** ١- یێ ژ تێرگوشتییێ هەستییێ وی ئاڤابووی. ٢- یێ بی ددان.
**الأدرية(الغنوصية):** رێبازەکا فەلسەفی یا ئایینی یە، دویڤچوویێت وێ دبێژن: مە نیاسینەکا تەکووز و بلند و سرۆشتی دەربارەی خودێ و ناڤێت وی یا هەی.
**إدريس:** ١- پێغەمبەرە سلاڤ لێ بن. ٢- ل نک سۆفیا ژ (الدرس) هاتیە ئانکو زانینا دهێتە وەرگرتن(العلم المکتسب).
**أدع:** گازی بکە.
**الإدعاء:** دبێژت لێ نەجهێ باوەریێ یە، یان دەلیل پێ نینن.
**الإدغام:** تێبرنا پیتەکێ و شداندنا یا ل دویڤ د خواندنێ دا.
**الأدغم:** دفنرەش.
**أدفى:** ١- شاخێت وی درێژبوون. ٢- یێ پەڕ درێژە.
**أدفر:** ١- تیژبوو. ٢- گەنیبوو. ٣- خرابوو.
**أدق:** ١- زراڤتر. ٢- هویرتر.
**أدک:** ١- حێشترا بێ کۆهان. ٢- هەسپ.
**أدکن:** ١- تاریتر. ٢- تاری.
**أدل:** گەلەک بێ منەت.
**الإدلاء:** ١- داهێلانا دەلوێ. ٢- کرنا ئاخفتنێ یان دانا ئعترافێ.
**الإدلاج:** تاریبوون.
**الإدلال:** ١- ب کارئینانا دەلیلی ژ بۆ دیارکرنا مەبەستێ یا سەلماندنا تشتی. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە ڕامانەکا زیدە ب شانازیێ ب کارێ خۆ یان زانینا خۆ هەتا ڕاددەیەکی کو هزر بکەت وی ڕێزەکا مەزن یا ل نک خودێ هەی وی ژ هەژی خەلاتی وی دکەت.
**الأدلم:** لێڤشۆر.
**آدم:** ١- بابێ هەمی مرۆڤانە سلاڤ لێ بن. ٢- ل نک سۆفیان دبیتە: عەقلێ ئێکێ، (ئەو نەفسا کتا خودێ ئەڤ جۆرێ مرۆڤا ژێ چێکری).
**الأدم:** پێخوارن.
**الأدمة( بالضم والسکون):** ئەسمەری.
**الأدمة(بالتحریک):** ١- سەرڤەیا کەڤلی. ٢- ژناڤدایا کەڤلی.
**الإدماج:** ١- لێکدانا دو تشتا کو ببنە ئێک. ٢- د شعرێ دا دبیتە: لێڤەکرنا پەیڤەکێ د ناقبەرا نیڤا مالکا ئێکی و نیڤا مالکا دووێ دا.
**إدمان:** هیبوونا بێ هێلان.
**أدمن:** مسکێ خوڕست.
**آدمي:** مرۆڤ.
**أدن:** پشتخوار.
**الإدناء:** نێزیککرن.
**أدناء:** کۆما (دنيء)ە کو دبیتە یێ کێم و چونە.
**أدناه:** ١- نێزیککر. ٢- نزمکر.
**الأدنى:** ١- یێ نێزیک. ٢- یێ نزم. ٣- یێ نێزیکتر.
**الإدهاش:** حێبەتیکرن.
**إدهان:** دوریاتی؛ منافقی.
**أدهم:** رەش.
**أدى:** ١- گەهەشت. ٢- قەتاند.

**الأديب:** ١- تۆرەڤان. ٢- یێ بتۆرە.

**الأديم:** ١- پیستێ گەمارکری. ٢- یێ ب زۆرداری هاتیە کوشتن.

**إذ:** ئالاڤەکە ژ بۆ کارێ ژ نیشکەکێ ڤە دهێتە ب کارئینان، دیسان رامانا دەمی بۆری ددەت.

**إذ:** دەمێ..

**إذا:** ئەگەر؛ ئالاڤێ مەرجی یە.

**أذاب:** حەلاند.

**الإذابة:** حەلاندن.

**أذاة:** ئێشاندن.

**آذار:** مەها ئادارێ.

**أذاع:** بەلاڤکر.

**الإذاعة:** رادیۆ؛ ئێزگە.

**أذاق:** هێلا تام بکەتێ.

**الإذاقة:** تامکرندان.

**الإذالة:** ١- رەزیلکرن. ٢- د عرووزێ دا دبیتە زێدەکرنا پیتا (أ)ا سەر تەفعیلێ وەکی (متفاعلن) دا ببیتە (متفاعلان) و دا (فاعلن) ببیتە (فاعلان).

**الأذان:** ١- بانگ. ٢- راگەهاندن.

**الآذان:** کوما (أذن)ە کو دبیتە گوهـ.

**آذان الجدي:** گیامامبەلک.

**آذان الفأر:** گیایەکێ بۆنداره، ل چیایێ بلند شین دبت، تایێت وی دزراڤن، و بەلگێت وی ەکی یێت د ریحانانن و کولیلکێت وی سپینە ب سەر سۆری ڤە، وەک دەرمان دهێتە ب کارئینان.

**الإذخار:** ١- هلگرتن بۆ دەمێ پێدڤیبوونێ. ٢- جەبلخانەکرن.

**الإذخر:** ١- گیایێ شین. ٢- جۆرەکێ گیایە یێ بێهنخۆشە، تایێت وی دزراڤن و بەلگێت وی درێژن و دسۆرن یان دزەرن، د کەڤن دا وەک دەرمانێ هندەک ئێشا دهاتە بکارئینان.

**الأذفر:** یێ بێهنا وی ب هێز.

**أذكى:** زیرەکتر.

**الإذكار:** بیرئینان.

**الأذل:** رەزیلتر.

**أذل(بتشديد اللام):** رەزیلکر.

**الأذلم:** لێڤشۆر.

**إذن وإذا:** پیتا بەرسڤدانێ یە.

**أذن:** ١- دەستویری دا. ٢- گوهێ خۆ دایی. ٣- راگەهاند.

**الإذن:** ١- گوهـ. ٢- یێ گوهێ خۆ ددەتە ئاخڤتنا هەر کەسەکی. ٣- ل نک سۆفیا دبیتە: شیاندنا دهێتە کرن ل سەر تشتێ دەستویری پێ دهێتە دان.

**الآذن:** گوهمەزن.

**أذن الحمار:** ئەزمانگا.

**أذنب:** گونەهکر.

**آذى:** ئێش گەهاند.

**أذى:** ئێش.

**الإذهاب:** برن.

**الآذي:** پێل.

**أذية:** ئێش.

**الأذين(الأيمن والأيسر):** نیڤا دلی یا سەری یە.

**آراب:** پیدڤی.

**الإراث:** کوچک.

**الأراجيف:** پروپاگندە.

**أراح:** بێهن کەتێ.

**الإراحة:** بێهنڤەکرنا تشتەکی.

**الإرادة:** ١- حەز و شیان. ٢- نیازا کرنا کارەکی. ٣- حەز و مەبەست.

**إرادي:** بدەست.

**الإراقة:** رێهتن؛ رژتن.

**أراك:** دارا سیواکێ یە.

**الأرام:** مامزا سپی.

**إرب:** ١- ئەندام. ٢- پرت.

**أرب:** ١- پێویستبوو؛ پێدڤیبوو. ٢- قەلسیکر. ٣- بهێز کەت. ٤- شەهرەزابوو. ٥- بسپۆربوو.
**أرب:** هەرکی.
**إربا إربا:** ١- ئەندام ئەندام. ٢- پرت پرت. ٣- پارچە پارچە.
**أرباب:** کۆما(رب)ە کو دبیتە خودان.
**إرباك:** تێکدانا سیستەمی کاری.
**الإرب:** ١- ئەندامێ لەشی. ٢- پرت.
**الأربة:** ١- گرێکا موکم. ٢- بوینباغ؛ (رباط)ا ستۆیی.
**الإربة:** ١- حەز. ٢- ئارمانج. ٣- پێویست.
**الإربعاء:** چارشەمب.
**أربعة:** چار.
**أربعين:** چل.
**أربك:** ١- رەش. ٢- حێشترا رەش.
**أربون:** دەستبەعی.
**أربيان(ربيان):** جانوەرەکێ دەریایێ یە ژ نفشێ کێڤژالا.
**الأربية:** سێڤسێڤکا رەهنی.
**الإرة:** ١- قەلیا شڤانا. ٢- ئاگر. ٣- قەدید؛ گوشتێ هشککری. ٤- دوژمناتی. ٥- بەزێ کوهانا حێشترێ.
**الأرة:** تۆتیکەکا گەلەک رەنگین وجوانە، زوی پەیڤ و کورتەسترانا ژبەردکەت و دبێژت، ل ئەمریکا ناڤین و پشکا زۆری ژ ئەمریکا باشۆر دژیت.
**الإرتباط:** پەیوەندی.
**الإرتثاث:** برینداربوون ب گرانی و دەرئێخستنا وی ژ مەیدانا شەری هێشتا پیچەکا رحێ تێدا.
**إرتبز:** ئاشکرابوو.
**إرتبط:** پەیوەندی گرێدا.
**إرتجى:** هویڤیکر.
**الإرتجاء:** هویڤیکرن.
**إرتج:** لەرزی.
**الإرتجاج:** لەرزین، لڤین.
**الإرتجاز:** ئرجووزە خواندن، (أرجوزة) جۆرەکێ شعرێ یە ژ بەحرا (الرجز).
**الإرتجاع:** ١- زڤراندن. ٢- زڤرین.
**الإرتجاف:** لەرزین.
**الإرتجال:** گۆتنا سەرپێ.
**الإرتحال:** کۆچکرن؛ وەغەرکرن.
**الإرتداء:** جل ل خۆ کرن.
**الإرتداد:** ڤەزڤرین؛ ڤەگەریان.
**الإرتداع:** پاشزڤرینەڤە.
**الإرتزاق:** ١- گەریان ل دویڤ رزقی. ٢- رزقخوازتن.
**الإرتسام:** ١- وێنەچێکرن. ٢- بجهئینانا فەرمانێ.
**الإرتشاء:** بەرتیلخوارن.
**الإرتشاف:** ڤەخوارن.
**الإرتصاد:** زێرەڤانیکرن.
**الإرتضاء:** خوازتنا رازیبوونێ.
**الإرتضاع:** شیرخوارنا بچویکی.
**الإرتطام:** ڤێکەڤتنا تشتەکی ب تشتەکی.
**الأرتع:** تەکووز؛ دەراندەر.
**أرتع:** بچەرم؛ خۆشیا ببەم.
**الإرتعاء:** چەراندن.
**الإرتعاب:** ترسان؛ بزدیان.
**الإرتعاد:** ڤەلەرزین.
**الإرتعاش:** لەرزین.
**الإرتفاع:** بلندبوون.
**الإرتفاق:** هەڤالینی.
**الإرتقاء:** ١- بلندبوونا پلەیێ. ٢- بلندبوون.
**الإرتكاب:** کرن، لێ بۆ کارێت خراب.
**الإرتكاز:** راوەستانا ستوینکی.
**الإرتماء:** خۆبەردانا خوارێ بۆ سەر تشتەکی.
**الإرتماس:** گۆرکرن؛ ڤەشارتن.

**الإرتهان:** ڕەهینەکرن.
**الإرتواء:** تێرڤەخوارن.
**إرتوى:** تێر ڤەخوار.
**الإرتياب:** بگومانبوون.
**الإرتياح:** بێهنڤەدان.
**الإرتياش:** ١- لبەرکرنا جلکێ باش. ٢- حالخۆشکرن.
**الإرتياض:** وەرزشکرن.
**أرث:** ئاگر هلکر.
**الإرث:** میرات.
**إرج:** بێهن.
**أرج:** ١- بێهنەکا خۆش ژێ هات. ٢- خۆ گرانکر.
**الإرجاء:** پاشئێخستن.
**أرجاء:** کۆما (رجو)یە کو دبیتە جهـ، یان دەڤەر.
**الإرجاع:** زڤڕاندن.
**الإرجاف:** کرنا بێبەختی و درەوا.
**أرجح:** دورستتر.
**أرجوان:** سۆرێ تاری.
**الأرجوانية:** دەربرینەکا ئەدەبی یەن دبیتە ب کارئینانا پەیڤێت جوان و نازک و ب ڕامان د نڤێسینێ دا.
**أرجوحة توازن:** حێلحێلینک.
**الأرجوحة:** هێزک؛ جولانک.
**الأرجوزة:** ئەو هەلبەستا ترجیعی یە یاکو ل سەر کێشا (بحر الرجز) دهێتە ڤەهوینان.
**أرجون:** غازەکا کێمە د بای دا دکەنە کولۆپا.
**إرحال:** کۆچکرن.
**أرحم:** دلۆڤان، دلۆڤانتر.
**أرخ:** دەمێ وی زانی.
**إرخ:** گۆلکا چێلا کویڤی.
**الإرخاء:** سستکرن.
**أرخبيل:** کۆمکا گزیرتێت دنێزیکی ئێکن.
**أرخص:** ئەرزانتر.
**أرخم:** دژوارتر ل سەر ئەزمانی.
**أرخيولوجيا:** زانستێ شوینوار و هونەرێت کەڤن (یۆنانی یە).
**أردأ:** بێخێرتر؛ خرابتر.
**الإردام:** خۆجهبوون.
**الإردب:** ئامانەکێ پیڤانێ یە ل وەلاتێ (مصر)ی دهێتە ب کارئینان دبیتە (٢٤) خسم.
**أرذل:** نزم، نزمتر.
**أرز(بضم الراء):** برنج.
**أرز(بسكون الراء):** جۆرە دارکە یا ب ناڤودەنگە ب موکومی و باشی یا دارێ وێ، گەلەک جۆر ژێ هەنە ژ وانا (أرز لبنان)، و(أرز الأطلسي)، و(أرز جبال هملايا).
**أرز(بتشديد الراء):** ١- چوو کونا خۆ. ٢- زڤڕی. ٣- تەزی. ٤- هاریکر و ب هێز ئێخست. ٤- تێکچوو.
**آرز:** ١- خۆجهـ و موکم. ٢- سار و تەزی.
**إرساء:** ١- ڕاوەستاندنا گەمیێ ل کناری. ٢- موکمکرن.
**الإرسال:** ١- هنارتن. ٢- گۆتنا فەرمۆدا پێغەمبەری بێی کو بێژیت ژ کیست دەڤێ فلان کەسی یە. ٣- درێژکرن. ٤- پەخشکرنا دەنگ و ڕەنگا ب ڕیکا ڕادیۆ و تەلەفزیۆنا.
**إرسال المثل:** د (علم البديع) دا دبیتە بکارئینانا پەندێ د شعرێ دا.
**الإرسالية:** ١- کۆمەکا قاسدێت ئایینی نە دهێنە هنارتن و ڕاسپاردن ژ بۆ بەلاڤکرنا ئاینێ ل جهەکێ دەشتنیشانکری. ٢- د بازرگانیێ دا دبیتە: ئەو متایێ ژ جهەکی دهێتە هنارتن بۆ جهەکی.
**أرستقراطي:** کەسێ ژ تەخا ماقویلا.

**الأرستقراطیة:** ١- تەخا ماقویلا. ٢- حوکمێ تەخا ماقویلا (یۆنانی) یە.
**أرسل:** هنارت.
**أرش:** بەرتیل.
**إرشاد:** نیشادان.
**أرشد:** نیشادەر؛ نیشادەرتر.
**أرشق:** زراف؛ زراڤتر.
**الأرشم:** ئەوێ پنیەکا رەش ل دفنا وی.
**الأرشمندریت:** خودانێ پلەیەکا فەلاتییێ یە د دێرێ دا (یۆنانی یە).
**الإرصاد:** زێرەڤانیکرن.
**إرصاد الحساب:** ١- دیارکرنا و ئامادەکرنا پارەی. ٢- ئامادەکرنا و تەرخانکرنا پارەی بۆ کارەکی.
**الأرض:** ١- عەرد. ٢- ئەختەرا سییێ یە بۆ نێزیکییێ ژ رۆژێ، (١٥٠) کیلۆمیترا یێ ژێ دوبرە، نێزیکی (٢٤) دەمژمیرا ل دۆر خۆ دزڤریت، و نێزیکی (٣٦٥) رۆژا ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و تنێ ئێک دویڤەلانک ل دۆر هەیە کو هەیڤە.
**الأرض المقدسة:** عەردێ پیرۆز؛ بیتە دەورۆبەرێت باژێرێ قودسێ، هندەک دبێژن مەبەست شامە (بلاد الشام).
**إرضاء:** رازیکرن.
**إرضاع:** شیردان.
**الأرضة:** کرمێ داری.
**أرضی:** رازیکر.
**أرطماسیا:** گیایەکە ل بیابانا شین دبت، خەلکێ سووریێ دبێژنێ: (شیح).
**إرعاء:** چەراندن.
**إرعاب:** ترساندن.
**إرعاد:** برویسیڤەدانا عەوری.
**إرعاش:** لەرزاندن.
**أرعب:** بزداند؛ ترساند.
**أرعن:** دین؛ هار.
**الإرغاب:** لبەرشرینکرن.
**الإرغام:** مەجبوورکرن.
**أرغب:** ل بەر شرین کر.
**الأرغل(بالضم):** دودک؛ ئامیرەکێ مۆزیکی یە ژ دو لەڤەنێت کونکری و دو پیکا پێک دهێت؛ ب دەڤی پف دکەنێ و ب تبلا دەنگا دگوهۆڕن و دکەنە ئاواز.
**أرغم:** ١- ب ئاخێ ڤەنا. ٢- نەچارکر. ٣- ب زۆری پێ کر.
**الأرغن(الأرغنون):** ئامیرەکێ مۆزیکی یێ یۆنانی یە، ب تبلا دهێتە لێدان.
**أرغن إلیه:** بەرێ خۆ دایێ و راوەستا.
**أرفأ إلیه:** ١- بەرێ خۆ دایێ. ٢- ژێ نێزیکبوو.
**الإرفاد:** دان؛ بەخشین.
**الإرفاق:** ب نەرمی د گەل کرن.
**أرفع:** ١- بلندتر. ٢- زراڤتر.
**أرق:** خەوچڕبوو؛ خەوا وی نەهات.
**الأرق:** خەوچڕکی.
**الأرق(المن):** شۆبە؛ جۆرەکێ مێشەمۆرا یە دکەڤیتە داروباری.
**الأرقان(الیرقان؛ الإرقان؛ الأراق):** زرک؛ ئیشا کولبونا مێلاکێ(داء الصفیر).
**الإرقان:** ١- دارا خەنایێ. ٢- زەعفەران (یۆنانی) یە.
**أرقش:** چنیچنی؛ نقشکقشک ب رەنگێ سپی و رەش.
**أرقط:** چنیچنی؛ نقشکنقشک ب رەنکێ سپی و رەش.
**أرقل:** لەزکر.
**أرقم:** مارێ چنیچنی؛ نقشکنقشک ب رەنکێ سپی و رەش.
**أرقیطون:** د بنیات دا (أرقیسون)ا یۆنانی یە، گیایەکێ بەلگ درێژە و رەنگێ وی ب سۆری ڤەیە، بەرێ ژ بۆ نەخۆشیێت دەڤ و ددان و سینگا دهاتە ب کارئینان.
**أرقی:** ١- پلەبلندتر. ٢- باشتر.
**أرک:** ١- ژ دارا سیواکێ ختوار. ٢- زکی وی ژ بەر خوارنا بەلگێت دارا سیواکێ ئێشا. ٣- برینا وی ساخبوو.

**إركاب:** سیارکرن.
**أركـان:** ١- كۆمـا (ركن)ە كـو دبیتـه کـوژی. ٢- پلەیەکا لەشکەری یا ل دۆر جەنگێ یە ب چەنـد خۆلـەکا وەردگـرن. ٣- كۆمـا وان سەرکردێت لەشکەری یە ییێت کو ب دانانا نەخشـەیێت شـەڕی ڕادبـن. ٤- ئـەو تشـتێت سـادەنە ییێـت کەرەسـته ژێ چێـدبن. ٥- ل نک خەلکێ بەرێ دبوونه (ئاگر و با و ئاڤ و ئاخ) کو بنیاتێ چێکریانن.
**أركست:** مەمکێت وێ هاتن.
**آركیولوجیـا:** زانسـتێ شـوینواران، ل (أرخیولوجیا) بنێرە.
**أركـون:** ١- کیخـە. ٢- سـەرۆک. ٣- قـازیێ مەزن. ٤- پێشەوایێ فەلا.
**إرم ذات العمـاد:** بـاژێرەک بـوو د ناڤبـەرا یەمەنێ و حەضرەموتێ دا ژ لایێ شـەددادێ کـوڕێ عـادی دا هاتیـە ئاڤـاکرن ل دویـڤ سـالوخەتێت پێغەمبـەرا ییێـت دەربـارەی بەحەشـتێ دکـرن، دبێـژن ژ زێـر و زیـڤ و جەوهور و یاقووتا ئاڤاکربوو.
**الأرم:** ئالایێ دهێته دانان وەک دەلیل.
**الإرم:** ئەو بەرە یێ دهێته دانـان ل سـەر ڕێکێ وەک نیشان.
**أرم:** بێ بنیات کر؛ چو ژێ نەهێلا.
**أرمة(بالضم):** ئالا.
**أرمد:** چاڤکول.
**أرمل:** ژنمری.
**أرملة:** بیژن.
**أرمـن:** مللەتـەکی ژ نفشـێ هنـدوئوروپی ل ڕۆژئاڤای دەریا قـەزوین دژیـن، وەلاتێ وان دبێژنـێ ئەرمەنسـتان، هـەر ل سـەردەمێ عیسـا پێغەمبـەری سـلاڤ لـێ بـن- ییێـت بووینه فەلە، بەلی وەکی جوهیا ژ بۆ کارێت بازرکـانی وەلاتـێ خـۆ هـیلان و ل جیهـانێ بەلاڤەبوون.
**أرن(بتشـدید النـون):** دەنگـێ خـۆ د گریـێ دا بلندکر.
**أرن:** چەلەنگبوو.
**الأرنب:** کێڤریشک.
**أرنبة الأنف:** تمبلکێ دفنێ.
**أرنف:** گوهێت خۆ شۆرکرن.
**الإرهاب:** ترساندن؛ بزداندنا خـەلکلی ب ڕیکا گەف و کوشتن و پەقاندنا.
**الإرهـاص:** ١- ئـەو مـوعجزاتن ییێـت کـو دەربارەی پیغەمبـەرەکی دەربارەیا هاتنا وی دبـار دبـن. ٢- ئـەو مـوعجزاتن ییێـت پێغەمبەرەک دکەت بەری کو ببیته پێغەمبەر ئانکو ب قاسدیـا خودێ بهێتە ڕاسپاردن. ٣- مـوعجزەکـا ل دۆر هاتنـا پێغەمبـەرەکی دیـار ببیـت بـەری هاتنـا وی. ٤- ئاڤاکرنـا دیواری ب ئاخێ. ٥- ئاڤاکرن.
**إرهاق:** ١- وەستاندن. ٢- وەستیان.
**أرو:** پەزکویڤی.
**أروى:** پەزکویڤی.
**الإرواء:** ئاڤدان.
**أرواث:** كۆما (روث)ە کو دبیته زبل.
**أروح:** بووحتر؛ بجانتر.
**الأروق:** ١- یێ ددانێت وی ییێت سەری ژ ییێت خوارێ درێژتر. ٢- یی ب شاخ.
**أروم:** ١- کێلک؛ كۆمـەکا بەرایە وەک نیشـان ل جهـەکی دخێتـه دانـان. ٢- ڕیهـ و ڕیشال.
**أرومة:** ڕیهـ و ڕیشال.
**أروكاریا:** جۆرە دارەکا بلنده جهێ وێ ئـەمریکا باشـۆرە، بـەلگێت وێ ب سـتری نـە، ژ بـۆ جوانیێ دهێته چاندن.
**أرول:** بزنمشک.
**الأرومة:** ١- ڕها تشتی. ٢- بنیاتێ تشتی.
**أروى:** پەزا کویڤی.
**أروية:** ١- پەزکویڤی. ٢- کەلێ کویڤی.
**الآرى:** تەولا دەواری.
**أرى:** خەلەکا هەفساری یا دکەڤیتـه بـن زرچـەنا دەواری.
**الأري:** ١- هنگڤین. ٢- هنگڤینێ د شانێ دا.

**أري(بتشيد الراء):** هلكر؛ ئاگر بەردایێ.
**أرية:** ئاخویرا دەوارا.
**أريب:** زانا؛ عاقلدار.
**الأريــة:** طــەولا دەواری؛ جهــێ لــێ دهێتــە گرێدان.
**الأريج:** بێهنا خۆش.
**أريس:** مەزنتر.
**الأريكة:** ١- تەختێ ب كولە. ٢- كورسی.
**أز(بتشديد الزاء):** دەنگكر.
**إزاء:** بەرانبەر.
**أزاح:** ژ سەر بر؛ ژ سەر راكر؛ دویركر.
**الإزاحة:** ژ سەر كر؛ دویركرن.
**أزاد:** زێدەكر.
**الإزار:** ١- دەرسـۆک. ٢- خێلـی. ٣- ل نـک سـۆفیا دبیتـە: پـەردا ڤەشـارتنا كارتێكرنـا شـیانێت خـودایی ل سـەر یێـت د (الـذات القديمـــــة) دا دبیتـــــە كـــــەڤناری و د (المحدثات) دا دبیتە نوبیاتی.
**الأزارقــة:** خـەوارجن دویڤچوویێـت (نـافع بـن الأزرق)ن، دبێـژن: ئیمـامێ (علي بـن أبي طـالـب) یـێ كـافربووی ژ بـەر تـەحكیمێ و بكـوژێ وی ژی (عبـدالرحمن بـن ملجـم المـــرادي) كـــافرە وهـــەمی هـــەڤالێت پێغەمبـەری سـلاڤ لـێ بـن ژی یێـت كافربووین.
**آزر:** هاریكر؛ پشتەڤانیكر.
**أزاغ:** خواركر.
**إزالة:** راكرن؛ ژێبرن.
**أزب:** هەركی.
**إزب:** ١- كورت. ٢- دمۆر.
**أزبر:** ١- زەلامێ مەزن. ٢- زەلامـی ب بـەر و مل و بهێز. ٣- زیاندەر.
**الأزبک(بالضم):** ئیلەكە ل تركستانا رۆسـی و تركستانا ئەفغانی دژیت كو دبنە پاشماییێت لەشـكەرێ مـەغۆلی یێـت ل دۆرێـت گـۆلا (ئۆرال) و دەریا قەزوین ماین.
**أزج:** درێژ ئاڤاكر ئانكو زنجكانی.
**أزح:** ١- ژجهچوو. ٢- حـولسی. ٣- گیرۆبوو.

**الإزدحام:** قەرەبالغ؛ لێک قەرشین.
**أزاد:** جۆرەكێ خورمێ یە.
**إزداد:** زێدەبوو.
**إزدان:** ١- جوانبوو. ٢- خەملاند. ٣- جوانكر.
**الإزدراء:** كێمكرن.
**الإزدراد:** داعویران.
**الأزدران:** هەردو مل.
**أزدرخت(أزادارخت):** دارەكـە دبێژنێ(زنزلخت) كولیلكێت شین ددەت دارێ وێ یێ قائمـە. (فارس) یە.
**الإزدراد:** ئـەو ڤـەژەنا كـاری یـە ئـەوا دهێلیـت خوارنا هاتیە ڤەجوین بهێتە داعویران.
**إزدرم:** داعویرا.
**أزدف:** تاریبوو.
**الإزدلاف:** ١- نێزیكبـوون. ٢- پێشداچوون.
**الإزدهار:** ١- هلگرتنـا تشـتی. ٢- پێشكەڤتن.
**إزدهر:** ١- وەرار كەڤتێ. ٢- پێشكەڤت.
**الإزدواج:** جۆتبوون.
**الإزدواجية:** ١- سالۆخەت یان كـاودانێ تشـتی جـۆت. ٢- د حوكمـی دا دبیتـە: هـەبوونا دو دەسـتەلاتداریا د رێڤـەبرنا دەولـەتێ دا ب ریكەكا نەشەرعی.
**الإزدياد:** زێدەبوون.
**إزار:** هیزار.
**إزرة:** هیزار.
**الأزر(بسـكون الـزاء):** ١- ل دۆر زڤـرێــن. ٢- پشتەڤانی. ٣- هێز.
**الأزر(بضم الزاء):** ئـەو دیـوارە یـێ ددەنـە بـەر دیوارەكی دا نەكەڤت.
**الإزر:** بنیات.
**آزر:** ١- هـاریكر. ٢- ڤێـرا گەهەشـت ئـانكو هندی وی لێهات. ٣- ب هێز ئێخست.
**أزرار:** كۆما(زر)ە كو دبیتە قولپک.
**أزرق:** ١- شین. ٢- گەلەكا زەلال.

**أزعج:** خۆشی تێکدا.
**أزعجه الى المصيبة:** پالداییێ.
**أزعجه عن موضعه:** ژ جهێ وی ڕاکر یان ژێ دەرئێخست.
**الأزعر:** ئەوێ کێم پویت ب سەری ڤە.
**أزعق:** ترساند.
**أزعم:** سەرۆکاتی کر.
**الأزف:** حالێ خراب.
**أزف(بكسر الزاء):** ١- نێزیکبوو. ٢- لەزکر. ٣- ساخبوو.
**الأزف(بفتح الزاء):** ١- تەنگاڤی. ٢- حالێ خراب.
**الآزفة:** ڕۆژا قیامەتێ.
**أزق:** ١- ڕح ژێ بر؛ تێبر. ٢- تەنگبوو.
**أزكى:** پاکتر.
**الأزل:** ١- دەمێ بەردوام. ٢- دەمێ بێ بەراهی و دویماهی. ٣- دەمێ نەدیار. ٤- بەردەوامیا هەبوونێ د دەمێت بوورین یێت بێ دویماهی دا.
**أزل:** تەنگبوو.
**الأزل:** کەڤناری.
**الأزلية:** دەمێ بێ دەستپێک و بێ دویماهی.
**الإزلاق:** حولساندن.
**الأزلام:** ئەو تیر بوون ل سەردەمێ جاهلیەتێ پشک دهاڤێتنێ.
**الأزلى:** یێ چێتر؛ یێ ژهەژیتر.
**الأزلي:** ١- یێ بەردەوام. ٢- یێ عەدەم ل بەراهیێ نە. ٣- یێ هەر هەی.
**أزم:** ١- گرانبوو. ٢- دژواربوو. ٣- لەق دانا. ٤- خەلا وی دژواربوو. ٤- باش هاتە بادان. ٥- خۆ داپاش. ٦- گرت.
**أزمة:** ١- قەیران؛ ئاریشەیا سەخت. ٢- خەلا.

**الإزميل:** ١- جەرکێ ئاڤێ. ٢- کولنگ؛ قەزمە. ٣- زەلامێ بهێز. ٤- زەلامێ لاواز.
**الإزهار:** ١- پێشئێخستن. ٢- ڕۆهنکرن.
**الإزهاق:** ١- دەرئێخستن. ٢- بەتاکرن. ٣- مراندن.
**الأزهر:** ١- یێ سپی و ڕوهن. ٢- ڕۆناهی. ٣- هەیڤ.
**أزهر:** کولیلک دان.
**الأزهران:** هەردو ڕۆناهی کو دبنە ڕۆژ و هەیڤ.
**أزهق:** ١- بەتالکر؛ پویچکر. ٢- ژ ئامانجێ دەربازکر. ٣- لەزکر.
**الأزهوقة:** یێ د لەزێ دا بوویە تشتەکێ عنتیکە.
**الأزوت:** جۆرەکێ غازێ یە یا بێ ڕەنگ و بێهن و تامە، پتر ژ سێ چارێکێت بای ژێ پێکدهێت.
**الأزور:** یێ چوویە لایەکێ ریکێ ژ لەزێ.
**الإزورار:** ژ ڕێدەرکەڤتن و چەپدان.
**الأزوط:** ئەوێ چاڤەکێ وی ژ یێ دی مەزنتر، یان ڕەشکا وێ خوار.
**آزى:** نێزیکبوو.
**أزيز:** ١- دەنگێ بروسیا. ٢- دەنگێ قازانێ ل دەمێ کەلینێ. ٣- بوڤێنا مێشا هنگڤینی.
**آس:** ١- گەهەشتێ. ٢- بێبهاکر.
**أس:** بنیات و تخوبێت خانی دانان.
**الأس:** بنیات.
**الآس:** ڕێل.
**آس بري شائك:** ڕێلا دڤشتێ.
**أسا:** ١- دەرمانکر. ٢- بۆ خۆ کرە پێشەوا.
**أساء:** ١- خرابیکر. ٢- خرابی گەهاند.
**الإساءة:** خرابی.
**الإسار:** ١- ئێخسیرکرن. ٢- بەند و قەیدێت گرێدانێ.
**أساس:** بنیات.

**أساس(بتشدید السین):** پێزەڤەنگ؛ فەساد.
**أساطین:** کۆما(إسطوانة)یە کو دبیتە ستوین.
**أساف و نائلة:** دو صەنەم بوون ل مەکەهێ، دبێژن د بنیات دا دو مرۆڤ بوون زنا د کەعبێ دا کربوون و خودێ خەفس لێ کر بوو و کربوونە بەر ناڤێ ئێکی(أساف بن عمرو)بوو و یێ دی(نائلة بنت سهیل)بوو، ل دەستپێکێ تنێ دو پەیکەر بوون پاشی(عمرو بن لحی) هێلا بهێنە پەرستن.
**أسام:** چەراند.
**أسامة:** شێر.
**الإسباءة:** تاریاتیا شەڤێ.
**الإسبال:** ١- بارینا بارانێ. ٢- بارینا روندکا. ٣- ڕیهتنا ئاڤێ. ٤- گەلەک ئاخڤتن. ٥- دەستبەردان.
**السبانغ البري:** سپیناغا دەشتێ.
**أسبت:** لێبوو شەمبی.
**الإسبرغولة الحمراء:** گولهنار.
**الأسبق:** یێ پێشتر؛ یێ بەری وی.
**الأسبقیة:** پێشاهی.
**أسبل:** ١- باری (باران). ٢- بەردا خوارێ؛ داهێلا. ٣- ڕژیا. ٤- دەستێت خۆ داهێلان.
**الأسبل:** یێ سمبێل درێژ.
**الأسبوع:** حەفتی.
**إسبانخ:** گیایێ ئسپیناغ.
**إسبیداج(إسفیداج):** سپیاتی یا رساسی (فارسی) یە.
**أست:** ١- پاشیا مرۆڤی. ٢- بنیات.
**الإستئثار:** بۆ خۆ هلبژارت یان هلگرت.
**الإستئذان:** دەستویری خوازتن.
**الإستئصال:** بنبرکرن.
**الإستئناف:** دەستپێکرن.
**إستاء:** عێجز بوو؛ دلێ وی ما.
**إستأثر:** بۆ خۆ هلگرت.
**إستأجر:** کرێکر.
**الإستأذان:** دەستویری خواستن.
**إستأذن:** دەستوری خواست.
**الأستاذ:** ١- مامۆستا؛ سەیدا. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: خودانێ بریڤەبرنا شیاندنێ (تصریف التمکین) و ڕوهنکرنا دیارکرنێ (التبیین)، زانایەکێ ڕەهایی یە.
**إستارة:** پەردە.
**إستأسد:** بوو شێر.
**إستأسر:** خۆ دا ئێخسیرکرن.
**إستأصل:** قوتبڕکر.
**إستاک:** سیواک ددانێت خۆ دا.
**إستألک:** نامەیا وی بر.
**إستأمان:** باوەری پێ ئینان.
**إستأمن:** باوەری پێ ئینا.
**إستأنس:** سەبرێ وی پێ هات.
**إستئناف:** ١- دەستپێکرن. ٢- جارەکا کرن.
**إستأنف:** ١- دەستپێکر. ٢- جارەکا دی کر.
**إستأنی:** ل هویڤیێ ما؛ خۆ ل هویڤیێ گرت.
**الإستئهال:** ژ هەژیبوون.
**أستاذ:** ١- مامۆستا. ٢- ڕێڤەبەر. ٣- زانا، (فارسی) یە.
**أستاذ المهنة:** هۆستا.
**الإستار:** ١- چار. ٢- چار مسقال و نیڤ، (فارسی) یە.
**إستباح:** حەلال کر.
**إستباق:** دبرئێکراکرن.
**إستبان:** ١- دیارکر. ٢- روهنکر.
**الإستبانة:** دیاربوون؛ ئاشکرابوون.
**إستبحر:** ب کویری و ب بەرفرەهی وەرگرت.
**الإستبداد:** ١- کارکرنا ب ڕایا خۆ ب تنێ. ٢- کارکرنا ب ڕایا خۆ و نە ب یاسایێ. ٣- زۆرداری.

**الإستبداع:** ئافراندن.
**الإستبدال:** گوهۆرین.
**إستبدل:** گوهۆڕی.
**الإستبراء:** ١- داخازا گەردەن ئازاكرنێ یان بەریكرنێ. ٢- خۆژێخلاسكرن. ٣- خۆ پاقژكرن ژ دەستنڤێژا ستویر و زراڤ.
**الإستبرق:** پەروكێ ئارموبشی یێ ستویر (فارسی) یە.
**الإستبسال:** ١- حەژێكرنا شەڕێ بێ یەمان. ٢- حەژێكرنا خۆدانەكوشتنێ.
**الإستبشار:** ١- كەیفخۆشبوون. ٢- ب مزگینییێخۆشبوون و شادبوون. ٣- ڕویخۆشبوون.
**إستبشر:** كەیفا وی هات.
**الإستبصار:** داخوازا دیتنێ.
**إستبصر:** داخوازا ڕێنیشادانێ كر.
**الإستبطاء:** ١- خۆگیرۆكرن. ٢- خۆ دەست یان پێ گرانكرن.
**الإستبعاد:** دویركرن.
**إستبعد:** دویر دانا.
**إستفذ:** خۆ ب تنێ هێلا ژ بۆ كرنا كاری.
**إستبقى:** ژێ هێلا.
**الإستبقاء:** ١- هێلان. ٢- خوازتنا هێلانا تشتی.
**الإستتار:** ١- خۆ ڤەشارتن. ٢- ل نک سۆفیا ئەوە كو مرۆڤی بكەڤیتە د ناڤبەرا تە و غەیبێ دا، دیسا دبێژن: ئیشارەتەكە بۆ ئاڤابونا سالوخەتێت نەفسێ د تەكووزیا هێزا سالوخەتێت دلی.
**الإستتباع:** ١-ل دویڤچوون؛ ب دویڤكەڤتن. ٢- دانەدویڤێكا تشتی.
**إستتر:** ڤەشارت.
**الإستتمام:** ١- تمامكرن. ٢- خوازتنا تمامكرنێ.

**إستثفر:** ١- كرە د ناڤ پێت خۆ ڕا(كوری). ٢- د ناڤ پێت خۆ ڕا كێشا و كرە د كۆشا خۆ دا(لێڤا دەهمەنێ یا پشتێ).
**الإستثفار:** كرنا كوریێ د ناڤ لنگا ڕا.
**الإستثقال:** گرانكرن.
**الإستثمار:** بەرهەمئینان.
**الإستثناء:** ژێ دەرئێخستنا تشتەكی ژ كۆمەكا تشتا.
**إستجابة:** ١- بەرسڤدان. ٢- قەبویلكرن.
**الإستجادة:** خوازتنا باشیا تشتی.
**الإستجار:** خۆ هاڤێتە سەر بەختێ وی.
**إستجاز:** داخوازا دەستویریێ ژێ كر.
**الإستجازة:** داخوازا دەستویریێ.
**إستجاع:** ژێ تێر نەبوو.
**الإستجداء:** دەستڤەگرتن؛ خازخازۆكی.
**الإستجداد:** نویكرن.
**الإستجلاء:** ڕاكرن؛ دەرئێخستن ژ جهـ و واری.
**الإستجلاب:** ١- ئینان. ٢- داخواكرنا ئینانا تشتی.
**إستجلى:** ئاشكرا كر.
**الإستجمار:** بەر د خۆ دان؛ خۆ پاقژكرن ب بەری.
**الإستجماع:** خڕڤەبوون.
**الإستجمام:** بێهنڤەدانا ل سەیرانگەهـ و هاڤینگەهان.
**إستجمع:** كۆمكر.
**الإستجهال:** خۆبسەرڤەنەبرن؛ خۆخشیمكرن.
**الإستجواب:** پرسیارژێكرن.
**الإستحاضة:** دیتنا خوینی ژ لایێ ژنكێ پشتی ژڤانی یان بەری وی.
**الإستحالة:** ١- گوهۆرین ژ كاودانەكی بۆ كاودانەكێ دیتر وەكی ڤڕسینا ئاڤێ. ٢- نەشیانا بێ گومان. ٣- د (علم الطبیعة) دا دبیتە: گوهۆڕینا كاودانا بێی گوهۆڕینا نفش و جۆری وەكی قەڕسینا ئاڤێ.
**إستحب:** ڤیا، حەژێ كر.
**الإستحباب:** خۆشرینكرن.

**إستحث:** هاندا.
**الإستحداث:** ١- نـــویکرن. ٢- ئافرانـــدن. ٣- چێکرن.
**الإستحداث:** ئافراندن.
**الإستحدام:** گەرما بەزێ.
**إستحر:** لێ گەرها.
**الإستحسان:** ١- پەسەندکرن.٢- ژێ رازیبوون. ٣- هێلانا قیاسی د شەریعەتی دا و کرنا تشتێ بۆ خەلکی باشتر.
**إستحسن:** دیت کو یێ باشە.
**الإستحصال:** ١- دەستکەفتن. ٢- بدەستڤەئینان.
**الإستحضار:** ١- ئامادەکرن؛ بەرهەڤکرن. ٢- ئینان.
**الإستحفاظ:** ژبەرکرن.
**الإستحقار:** کێمکرن و بێ روومەتکرن.
**الإستحقاق:** ١- دەمێ دانا حەقی. ٢- ژهەژیبوون.
**الإستحکام:** ١- موکمکـــرن. ٢- تونـــدکرن. ٣- زەپکرن.
**الإستحلاء:** شرینکرن.
**الإستحلاف:** دانەسوینخوارن.
**الإستحلال:** ١- خوازتنا حەلالیێ. ٢- حەلالکرن.
**الإستحمام:** سەرشویشتن؛ حەماملەمویشکرن.
**الإستحواذ:** ب سەردازالبوون.
**الإستحیاء:** شەرمکرن.
**الإستخارة:** خواستنا هلبژارتنا کارەکی یان تشتەکی کو ب هویڤیا خودێ ڤە بیت ب رێکا شەرعی.
**الإستخباء:** ١- خێڤەتڤەدان. ٢- خۆ د بن خیڤەتێ ڤەکرن ئانکو چوونا بن خیڤەتێ.
**الإستخبار:** لێگەریانا پێزانینا ل دۆر تشتی.
**الإستخبارات:** دەزگەهەکێ فەرمی یە سیخوڕیێ دژی دژمنی دکەت و هەر تشتێ تەناهیا دەولەتێ یا ناڤخۆیی و دەرڤەیی دکەت.
**الإستخدام:** ب کارئینان.
**الإستخراج:** دەرئێخستن.
**الإستخصاص:** تایبەتمەندکرن.
**الإستخفاء:** ١- خۆڤەشارتن. ٢- ڤەشارتن.
**الإستخفاف:** ١- سڤکیپێکرن. ٢- سڤککرن.
**الإستخلاص:** ١- خوڕستکرن. ٢- قورتالکرن.
**الإستخلاف:** ١- ل پاشخۆهێلان. ٢- ل شوینا خۆدانانا کەسەکی.
**الإستدارة:** ١- گروڤرکرن. ٢- زڤڕین بۆ لایەکی.
**الإستدامة:** ١- بەردەوامیپێدان. ٢- خوازتنا بەردەوامیێ بۆ تشتی.
**الإستدانة:** قەرکرن.
**الإستدبار:** ١- پشتدان. ٢- پشتدان و چوون.
**الإستدراج:** ١- بێهنفرەهکرن ل کەسەکێ گونەهکار هەتا کو باش ژ هەژی سزای ببت. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: دیارکرنا کەرامەتا ل نک کەسەکێ دویر ژ عبادەتێ خودێ. ٣- د (منطق) دا دبیتە: کرنا پەیڤەکا بهێلیت یێ بەرانبەر ژ هەلویستێ خۆ بهێتە خوارێ وەکی (هارون) گۆتیە (موسی)ـای (یا بن أم لا تأخذ بلحیتي ولا برأسي ٠٠) بابەتێ براینیێ ئینا بیرا وی دا دلۆڤانیێ پێ ببەت.
**الإستدراک:** ١- ڤێراگەهەشتن. ٢- د (علم البدیع) دا دبیتە کو شاعر د نیڤمالکا ئێکێ دا بابەتێ خۆ ب گومان بێژیت و د نیڤمالکا دووێ دا ب ئاشکرایی بێژیت.
**الإستدعاء:** خوازتنا ئامادەبوونێ.
**الإستدلال:** ١- خوازتنا نیشادانا رێک و ئالاڤا بۆ ئارمانجێ. ٢- وەرگرتنا دەلیلی. ٣- دەرئەنجام. ٤- د (منطق)ی دا دبیتە: خۆڤەگوهازتن ژ ڕاستیەکێ ب ڕاستیەکا دی ب ڕیکا وان پەیوەندیا یێت د ناڤبەرا هەردوان دا. ٥- ڤەکۆلینا عەقلی یا سیستەمکری یە ژ بۆ گەهەشتنا ڕاستیێت دیار و ئاشکرا.

**الإستذكار:** بیرئانین.
**الإستذلال:** ڕەزیلکرن.
**الإستراتيجية:** هونەرەکێ لەشکەری یە وان ئالاڤا ڤەدگریت ییێت دگرنگ د کارێ سەرکێشیا لەشکەران دا (یۆنانی) یە.
**إستراتيجي:** گرنگ.
**الإستراحة:** بێهنڤەدان.
**الإستراق:** دزین.
**إستربح:** فایدەکر.
**الإسترجاع:** ١- خوازتنا زڤراندنا تشتی. ٢- گۆتنا: (إنا لله وإنا إليه راجعون). ٣- زڤراندن.
**إسترجع:** ١- زڤراند. ٢- گۆتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون).
**الإسترحام:** خوازتنا دلۆڤانییێ.
**إسترحم:** داخوازا دلۆڤانییێ کر.
**إسترخص:** دەستویری ژێ خواست.
**إسترخى:** خۆ بەردا عەردی یان سەر تشتەکی ب مەبەستا بێهنڤەدانی.
**الإسترخاء:** ١- سستکرن. ٢- خاڤکرن. ٣- خوازتنا بێهنڤەدانێ.
**الإسترداد:** ١- ڤەزڤڕاندنا تشتی. ٢- داخوازا زڤراندنا تشتی. ٣- سکالایا زڤراندنێ د یاسایێ دا دبیتە: ئەو سکالایا ئەو کەس پێشکێش دکەت یێ تشتێ وی ژێ هاتیە ستاندن دا بۆ بهێتە زڤراندن.
**إسترزق:** داخوازا رزقی ژێ کر.
**الإسترزاق:** خواتنا ڕزقی.
**الإسترشاء:** ١- خوازتنا بەرتیلێ. ٢- بەرتیلکرن.
**الإسترشاد:** خوازتنا ڕینیشادانێ.
**إسترشد:** داخوازا نیشادانێ کر.
**الإسترضاء:** خوازتنا ڕازیبوونێ.
**الإسترضاع:** خوازتنا شیردانێ.
**إسترضع:** داخوازا شیری کر.
**الإسترعاء:** خوازتنا چاڤدێرییێ.
**إسترق:** ب دزیڤە کر.
**الإسترقاق:** کۆلەکرن؛ بەندەکرن.
**الإسترهاب:** ترساندن.
**الإسترواح:** بێهنگرتن؛ بێهتێچوون.
**الإستزادة:** خوازتنا زیدەکرنێ.
**الإستزارة:** خوازتنا سەرەدانێ.
**الإستسقاء:** خوازتنا ئاڤدانێ یان بارانێ یان ئاڤێ.
**الإستسلام:** خۆدانەدەست، خۆتەسلیمکرن؛ خۆ ڕادەستکرن.
**إستسلم:** خۆ دا دەست؛ خۆ ڕادەستکرن.
**إستشار:** پرسیارا خۆ پێ کر.
**الإستشارة:** ١- داخوازا شیرەتێ. ٢- داخوازا بۆچوونێ.
**الإستشارات:** د سیستەمێ دیموکراتی دا دبیتە: دان و ستاندنێت د ناڤبەرا سەرۆکێ دەولەتێ و جڤاتا نوینەران دا ل دۆر لێکڤەکرنا چانتەییێت وەزیرییێ.
**إستشاط:** کەربێ گرت.
**الإستشاطة:** لەزا کەبێ.
**إستشر:** داخوازکر ددانێت وی تیژ بکەن.
**الإستشراق:** رۆژهەلاتناسی.
**الإستشعار:** ١- ل بەرخۆکرنا جلکی بێ بنکراسک. ٢- هەستپێکرن.
**إستشف:** ١- تیرا بەرێ خۆ دا یێ ل پشت. ٢- بۆ وی یێ ل پشت وی دیاربوو. ٣- هزرا خۆ تێداکر. ٤- هندی د ئامانی دا ڤەخوار.
**الإستشفاء:** داخوازکرنا ساخبوونێ.
**إستشفاع:** داخوازکرنا مەهدەرێ.
**إستشفع:** داخوازا مەهدەرێ کر.
**إستشكل:** ١- ل بەر خەلەتبوو. ٢- بۆ بوو ئاریشە.

**الإستشمام:** بێهنکرن.
**إستشنع:** دیت یێ کریت و خرابە.
**الإستشهاد:** شەهیدبوون.
**إستشهد:** ١- شەهیدبوو. ٢- شەهدەدا.
**إستصبى:** ١- کریارێت بچویکا کرن. ٢- سەرەدەریا بچویکا د گەل کر.
**الإستصباح:** چراهلکرن.
**الإستصحاب:** ١- دگەلخۆبرن. ٢- هەڤالکرن.
**إستصحب:** ١- دگەل خۆ بر. ٢- خواستە هەڤالینییێ.
**الإستصراخ:** ١- خوازتنا هاریکارییێ. ٢- ڤیژیڤەدان.
**إستصرخ:** داخوازا هەوارێ کر.
**الإستصعاب:** بزەحمەتئێخستن.
**إستصعب:** سەختبوو.
**الإستصغار:** بچویکحسێبکرن.
**إستصغر:** ٢- حسێبکر کو یێ بچویکە. ٢- دیت یێ بچویکە.
**إستصغى:** داخوازا گوهدانێ کر.
**الإستصفاء:** زەلالکرن.
**إستصفح:** داخوازا لێبۆرینێ کر.
**الإستصلاح:** چاککرن.
**الإستصناع:** خوازتنا سازکرنێ.
**الإستصواب:** ڕاسڤەکرن؛ دورستکرن.
**إستصوب:** دیت یێ دورستە.
**إستضاء:** ١- داخوازا ڕۆناهییێ کر یان ڕۆناهی ب تشتەکی پەیداکر. ٢- پرسیارا خۆ ب ئێکی کر. ٣- ڕۆهنکر.
**الإستضاءة:** داخوازا ڕۆهنکرنێ.
**أستضاف:** داخوازا مێهڤانکرنێ کر.
**الإستضعاف:** لاوازکرن.
**إستضعف:** دیت یێ لاوازە.
**إستطاب:** دیت یا خۆشە.
**الإستطابة:** خۆشدیتن؛ ب تامدیتن.
**إستطار:** ١- فڕاند. ٢- بەلاڤەبوو.
**إستطاع:** شیا.
**الإستطاعة:** شیان.
**إستطاف:** ل دۆر زڤڕی.
**إستطال:** درێژبوو.
**الإستطالة:** درێژبوون.
**إستطان:** خۆجهبوو؛ بۆ خۆ کرە وار.
**الإستطباب:** خوازتنا دەرمانا.
**الإستطراب:** دلخرابوونا ژ خۆشیا ئاوازەکی.
**الإستطراد:** درێژکرنا ئاخڤتنێ هەتا کو بێیە حەمدی خۆ خودان دچیتە ناڤ بابەتەکێ دی.
**الإستطراف:** کەنارگیری؛ خوداناڕەخەکی.
**إستطرب:** هژیانا وی ژ گولێبوونا سترانێ دژواربوو.
**إستطرد:** پێڤەچوو.
**إستطرق:** ١- داخوازا لێدانا بەرکا ژێ کر دا پێشبینییێ ل دۆر پاشەڕۆژا وی بکەت و بەختێ وی بخوینت. ٢- بۆ خۆ کرە ڕێ.
**الإستطعام:** خوازتنا زادی.
**إستطعم:** ١- داخوازا خوارنێ کر. ٢- تام ژێ دیت.
**إستطل:** ١- هاتە هنداڤێ. ٢- کوریا خۆ بلندکر(دەواری).
**الإستطلاع:** سەحکرن.
**الإستطلاق:** ١- ئازادکرن خوازتن. ٢- بەردان.
**إستطلع:** ١- داخوازا دەرکەڤتنێ کر. ٢- پرسیارا ڕاستییێ ژێ کر.
**إستطلع:** سەح بکێ.
**إستطم:** دەمێ برینا وی یان قوساندنا وی هات(موی).
**إستظرف:** داخوازا جوانی و ژیرییێ کر.
**إستظل:** قەستکرێ و روینشتە بن؛ خۆ دا بن.

**الإستظلال:** ١- چوونا بن سیبەرێ. ٢- داخوازکرنا سیبەرێ.
**الإستظهار:** پشتەڤانیخوازتن.
**إستظهر:** داخوازا پشتەڤانییێ کر.
**إستعاد:** ١- داخوازا دوبارەکرنێ کر. ٢- داخوازا زڤرینێ کر.
**الإستعادة:** خوازتنا زڤراندنێ.
**إستعاذ:** خۆ پێ راسپێرا.
**الإستعاذة:** خۆپارازتن ب خودێ ژ تشتەکی.
**إستعار:** ب ئێمانەت بر.
**الإستعارة:** ١- داخوازکرنا رامانەکێ یان سالوخەتەکی یان سخلەتەکێ نەگونجای بۆ تشتەکێ دەستنیشانکرنا پێخەمەت ب هێزکرنا دەربرینێ. ٢- وەرگرتنا تشتەکی ژ کەسەکی ب ئێمانەت.
**إستعاض:** داخوازا قەرەبۆکرنێ کر.
**الإستعاضة:** خوازتنا قەرەبۆکۆنێ.
**إستعان:** داخوازا هایکاریێ کر.
**الإستعانة:** داخوازکرنا هاریکاریێ ژ کەسەکی.
**الإستعباد:** کۆلەکرن؛ بندەستکرن ژ بۆ کۆلاتیێ.
**إستعبر:** ١- خەمێ گرت. ٢- روندکا وی هاتەخوارێ.
**إستعتاب:** ١- گازندەژێکرن. ٢- داخوازکرنا لێبۆرینێ.
**إستعتب(أعتب):** داخوازا رازیبوونێ کر.
**الإستعجاب:** عەجێبگرتیکرن.
**الإستعجال:** لەزکرن.
**الإستعجام:** ژئاخڤتنکرن.
**إستعجب:** حێبەتیبوو.
**إستعجزه:** دیت یێ بێ شیانە.
**إستعجل:** لەز لێ کر.
**إستعجم:** ١- مژداربوو؛ ئاسێبوو و تێنەگەهەشت. ٢- نەشیا باخڤت.
**إستعد:** خۆ ئامادەکر.
**الإستعداد:** خۆئامادەکرن.
**إستعدى:** داخوازا هاریکاریێ کر.
**الإستعذاب:** ١- شرینکرن. ٢- تام ژێ دیتن.
**إستعذب:** ١- داخوازا ئاڤا شرین کر. ٢- دیت یێ خۆشە.
**إستعذر:** هێجەت دانا بەر.
**الإستعراب:** عەرەببوون.
**الإستعراض:** نیشادا شیانا.
**إستعرض:** بەرچاڤکر.
**إستعرق:** رهێت خۆ د عەردی دا برن.
**إستعز(بتشديد الزاء):** شیایێ.
**الإستعسار:** بزەحمەتێئێخسن.
**إستعسل:** هنگڤین خوازت.
**الإستعصاء:** لێئاسێبوون.
**الإستعصام:** خۆ پێ پارازتن.
**إستعصم:** ١- خۆ گەهاندە ئەوێ وی ب پارێزت. ٢- گرت و نەبەردا. ٣- پەنا برە نک. ٤- خۆ پێ بهێزئێخست و موکمکر.
**إستعصى:** ١- فەرمان ب جهـ نەئینا. ٢- لێ ئاسێبوو. ٣- بزەحمەت کەت.
**إستعضد:** ب داسێ بڕی.
**الإستعطاف:** داخوازا دلۆڤانییێ.
**إستعطف:** داخوازا دلۆڤانییێ کر.
**إستعطى:** داخوازا دانێ کر.
**الإستعظام:** ١- دیت یێ مەزنە. ٢- مەزنبوون.
**أستعظم:** ١- خۆ مەزنکر. ٢- دیت کو تشتەکێ مەزنە.
**إستعف(بتشديد الفاء):** هێلا و نێزیک نەبوو.
**الإستعفاء:** داخوازا لێبۆرینێ.
**الإستعفاف:** دەهمەنپاقژیکرن.
**إستعفر:** رەنگێ وی ئاخەوی بوو.
**إستعقب:** ل دویڤ نامیسێ یان خرابێ گەریا.
**الإستعلاء:** ١- داخوازا بلندییێ. ٢- خۆ ل سەر بلند کر.

**الإستعلاج:** چارەخوازتن.
**الإستعلام:** داخوازا پێزانینا.
**الإستعلامات:** ١- ئوفیسا پێزانینا یا کومپانیەکێ یان دەزگەهەکێ. ٢- پرسگەه.
**إستعلم:** داخوازا زانینێ کر.
**إستعلن:** هاتە ئاشکراکرن.
**إستعلى:** ١- بلندبوو. ٢- شکاند و ب سەر زالبوو.
**إستعم:** کرە مامێ خۆ.
**الإستعمار:** ١- داخوازا ئاڤاکرنێ. ٢- ئمپریالیەت. ٣- کارێ داگیرکرنا وەلاتێت پاشکەفتی ژ بەر سامانێت وان یێت سرۆشتی ب هێجەتا ئاڤاکرنێ(ئیمپریالزم).
**الإستعمال:** بکارئینان.
**إستعمر:** ١- کرە ئاڤاکەر. ٢- داگیرکر ژ بۆ ئاڤاکرنێ.
**إستعمل:** ١- بکارئینا. ٢- کرە بەرپرسێ باژێرەکی.
**إستعمه:** کرە مامێ خۆ.
**إستعهد:** ل سەر کرە مەرج و سۆزا وی نڤیسی.
**إستعوى:** ژێ خوازت برەوت.
**إستغاث:** داخوازا هاریکاریێ و پشتەڤانیێ کر.
**الإستغاثة:** داخوازا هەوارهاتنێ، یا هاریکار و پشتەڤانیێ.
**إستغار:** ١- توند و گربوو و قەلەبوو. ٢- وەرمی. ٣- ڤیا بچیتە عەردێ نزم یان قەستا عەردێ نزم کر. ٤- هێرش کرە سەر.
**إستغبى:** دیت کو دەبەنگە.
**إستغر:** هاتە خاپاندن.
**الإستغراب:** عەجێبگرتن.
**الإستغراق:** ١- وەرگرتنا هزرێ. ٢- خۆبەردان د ناڤ هزرێ دا. ٣- ڤەکێشانا دەمی. ٤- ڤەگرتنا گشت تشتا ب دورستی.
**إستغرب:** حێبەتیبوو.
**إستغرق:** ١- دۆمکێشا؛ ڤەکێشا. ٢- تێ گەهەشت. ٣- کویر چوویێ.
**إستغزر:** تشتەک دا داکو پتر پێ وەربگریت.
**إستغش:** ژ زەغەلکارا حسیبکر.
**إستغشى:** ب سەر خۆ دادا یان خۆ پێ نخاڤت.
**الإستغفار:** خوازتنا لێبۆرینێ.
**إستغفر:** داخوازا لێبۆرینێ کر.
**إستغفل:** خۆ ل خافلبوونا وی گرت.
**إستغل:** ١- دەرامەتێ وێ وەرگرت. ٢- مفا ژێ وەرگرت. ٣- بۆ خۆ ب مفا دیت.
**الإستغلاظ:** ستویربوون.
**الإستغلاق:** دائێخستن.
**الإستغلال:** ١- بکارئینان. ٢- مفاژێکرن پشتی بدەسکەڤتنا دەلیڤەی.
**إستغلظ:** ستویربوو.
**إستغلق:** ڤەکرنا وی ب زەحمەت کەت؛ ئاسێبوو.
**إستغلى:** دیت یێ گرانبهایە.
**الإستغناء:** ١- بێمنەتی. ٢- زەنگینبوون.
**إستغنم:** ١- پویرە ب دەستڤەئینا. ٢- بۆ خۆ ب دەرفەت دیت. ٣- ب دەست خۆ ئێخست. ٤- کرە پویرە. ٥- دەرفەتێ ب دەستئێخستنێ ب مفا دیت.
**إستغنى:** ١- بێ منەتبوو. ٢- زەنگین بوو. ٣- داخوازا زەنگینیێ کر.
**إستغوى:** ڤیا دسەردا ببەت.
**إستفاء:** ١- زڤری. ٢- بر.
**إستفاد:** مفا دیت.
**الإستفادة:** مفادیتن.

**إستفاض:** ١- بەلاڤبوو. ٢- پرسیارا زێدەهیێ کر. ٣- فرەهبوو. ٤- بناڤ ڤە چوو. ٥- فرەهبوو و دارێت وی زەحفبوون(نهال).

**الإستفاضة:** خوازتنا زێدەهیێ.

**إستفاق:** هشیاربوو.

**الإستفتاء:** ١- داخوازا دانا فەتوایێ یان بەرسڤێ. ٢- راپرسین.

**الإستفتاح:** ١- ڤەکرن. ٢- داخوازا سەرکەفتنێ.

**إستفتح:** ١- داخوازا ڤەکرنێ کر. ٢- داخواز سەرکەڤتنێ کر. ٣- دەستپێکر. ٤- ڤەکر.

**إستفتر:** ١- هاتە ژپاشگوهڤەهاڤێتن. ٢- هیلا بێهنا خۆ ڤەدەت ئانکو بێ هیلا دا بێنا وی ڤەببیت.

**إستفتى:** داخوازا فەتوایێ کر.

**إستفحل:** مەزنبوو و دژواربوو.

**إستفخذ:** خۆ چەماند و رادەستکر.

**إستفخر:** ژ شانازیکارا هژمارت.

**إستفدح:** دیت یێ گرانە.

**الإستفراد:** ١- کتکرن. ٢- تنێ خۆ هێلا ئانکو خۆ بێ هەڤال و هەڤکویف هیلا.

**الإستفراغ:** ڤالابوون.

**إستفرخ:** بوو خودان تێژک.

**إستفرد:** ١- دیت یێ ب تنێ یە. ٢- ژ ناڤ هەڤالا دەرئێخست و ڤەدەرکر. ٣- بێ هەڤکویفبوو.

**إستفرع:** دەستپێکر.

**إستفرغ:** ڤالابوو.

**إستفرك:** تژیبوو و شدیا(دانێ دگولیێ دا).

**إستفز:** ١- ترساند. ٢- ژ خانیێ وی دەرئێخست. ٣- دەرئێخست. ٤- سڤکی پێکرن و گازی کرێ. ٥- کوشت. ٦- ئاریا؛ ئازریا.

**إستفزاز:** ئاراندن.

**الإستفسار:** پرسیارکرن.

**إستفص:** دەرئێخست؛ ئینادەر.

**إستفصل:** داخاوازا ژێکجوداکرنێ کر.

**إستفضل:** ١- هندەک ژێ هێلا. ٢- پاشمایەک ژێ هێلا.

**إستفظعه:** دیت یێ ژ توخوبیی دەرکەڤتی یە.

**الإستفعال:** دانەکارکرن.

**إستفل:** کێمترین پرت بر.

**إستفلح:** سەرکەڤتن ب دەستڤەئینا.

**إستفلحى:** کاروبارێ خۆ ب رێڤە ببە، ئانکو من تو تلاق دای(پەیڤا بەردانێ بوو بەری ئیسلامێ).

**إستفلك:** گوروڤربوو؛ خربوو.

**إستفلى:** خوازت کو ئێک ب نێرتە سەرێ وی.

**الإستفهام:** پرسیارکرن.

**إستفهم:** داخوازا تێگەهاندنێ ژێ کر.

**إستقاء:** دلێ خۆ راکر.

**الإستقاء:** خوازتنا ئاڤێ.

**إستقات:** داخوازا قویتی کر.

**إستقاد:** ١- خۆ چەماند بۆ ب جهئینا فەرمانا. ٢- ژ دادەوەری خوازت کو کوژەکی ب کوژتی ڤە گرێ بدەت. ٣- سەرکێشی دا دەست.

**إستقال:** ١- داخوازکر پەسەنکرنا دەست ژ کاریبەردانا وی بەن. ٢- ژێ خوازت ژ کەڤتنێ رابکەت. ٣- ژێ خوازت هەلوەشینت. ٤- گرێبەست هلوەشاند.

**الإستقالة:** ١- دەستژکاریبەردان. ٢- داخازا پەسەندکرنا هێلانا کاری.

**إستقام:** ١- ب راستی ل سەر کاری ما. ٢- ل وی راست هات؛ بۆ لێهات. ٣- راستەرێبوو.

**الإستقامة:** ١- راستەرێبوون؛ مانا راست و درست ل سەر کاری. ٢- راستبوون. ٣- ب جهئینانا عبادەتی دگەل نەهیلانا گونەها.

**الإستقباح:** کرێتدیتن.
**الإستقبال:** ١- پێشوازیکرن. ٢- بەرێ خۆ دان. ٣- دەمێ داهاتی.
**إستقبح:** دیت یێ کرێتە.
**إستقبل:** ١- بەرێ خۆ دایێ. ٢- پێشوازیکر. ٣- بەر ب وی ڤە چوو.
**إستقتل:** کوشتن خوازت، ڤیا بهێتە کوشتن و نەمینت.
**إستقد:** بەردەوامبوو.
**الإستقدام:** بەر ب پێش چوون.
**إستقدر:** کرە قەدەر.
**إستقدم:** کەتەپێشییێ.
**إستقدر:** خوازت بکەتە بەهرا وی.
**الإستقذار:** دلڕەشکرن ژ تشتی.
**إستقذره:** ١- دلێ خۆ ژێ ڕەشکر. ٢- دیت یێ پیسە.
**إستقذف:** ١- هاڤێت. ٢- بێبەختیەک ب دویڤڤەنا.
**إستقر:** خۆجهبوو.
**إستقرأ:** ١- ژێ خواست بخوینت. ٢- ناڤەرۆک دا خواندن ژ بۆ دیارکرنا رامان و نهینی و تشتێ مژدار.
**الإستقراء:** ١- ب دویڤ دا چوون. ٢- خواندنا ناڤەرۆکا تشتی و دیارکرنا رامان و بابەتێت مژدار و دەرەهیکرنا نهینی یا لایەنێت دی ل دویڤ سیستەمێ مەنطقی یێ کارێ شرۆڤەکرنێ. ٣- سەلماندنا حوکمی ل سەر هەمی تشتی ب ڕێکا سەلماندنا وی ل سەر باهرا بپرا وی، هەر وەکی تو بێژی: هەر حەیوانەک لەقلەقا خۆ یا خوارێ ل دەمێ خوارنێ دلڤلڤیت ژ بەر کو مرۆڤ دلڤلڤینن، ئانکو تە ب ڕێکا مرۆڤی سەلماند کو هەمی حەیوان لەقلەقکا خۆ یا خوارێ ل دەمێ خوارنێ دلڤلڤین.

**الإستقرار:** خۆجهبوون.
**الإستقراب:** خۆنێزیککرن.
**الإستقراض:** خوازتنا قەرکرنێ.
**الإستقراع:** ١- توندبوون. ٢- پویتک ژێڤەبوون. ٣- خوازتنا قوتانا دەرگەهی. ٤- خوازتنا کێشانا پشکێ.
**إستقرب:** ژ خۆ نێزیک کر.
**إستقرض:** داخوازا پارا ب دەین ژێ کر.
**إستقرض:** داخوازا ژێ کر دەینەکی دگەل بکەت.
**إستقرع:** دژواربوو.
**إستقرن:** بوو هەڤالێ وی.
**إستقرى:** ل دویڤ چوو ژ گوندەکی بۆ گوندەکی.
**الإستقسام:**١- خوازتنا لێکڤەکرنا تشتی. ٢- خوازتنا سویندخوارنێ.
**أستقسم:** ١- داخوازا لێکڤەکرنێ کر. ٢- سویندخوار.
**إستقشب:** دلێ خۆ ژێ رەشکر.
**إستقص:** ١- خوازت سزا بدەت. ٢- خوازت تۆلێ ڤەکەت.
**إستقصر:** ١- حسێبکر یێ کورتە. ٢- دانا کو قوسیری یا کری.
**إستقصى:** ١- گەلەک لێ ڤەکۆلا. ٢- ل دویڤچوو.
**الإستقصاء:** ١- ل دویڤچوون. ٢- خوازتنا دویماهیا تشتی. ٣- گەهەشتنا دویماهیا تشتی.
**الإستقصار:** کەرتکرن.
**إستقض:** ١- دیت یێ ب تۆز و زڤرە. ٢- داخوازا هەرفاندنێ کر.
**إستقضى:** ١- داخوازا ئەداکرنا دەینی ژێ کر. ٢- کرە قازی.
**إستقطر:** ڤیا بکەتە دلۆپ دلۆپ.

**إستقطع:** داخوازا ژێڤەکرنا پرتەکێ کر.

**إستقفل:** هاتە دائێخستن.

**إستقفى:** ژ پشتێ ڤە هاتێ و دانا پاتکا وی.

**إستقل:** ١- دیت یێ کێمە. ٢- هلگرت و بلندکر. ٣- بلندبوو. ٤- شیایێ. ٥- زۆرداری لێکر. ٦- ژ بچویکا حسیبکر. ٧- بارکر و چوو. ٨- سەرخەبوونا خۆ وەرگرت.

**الإستقلال:** سەرخەبوون؛ سەربخۆیی.

**إستقم:** ١- راست ببە. ٢- بەرێ خۆ بدێ.

**إستقن:** ما دگەل پەزی و ب هوبڤیا شیرێ وی ڤە ما.

**إستقوس:** پشتا وی قۆف بوو.

**إستقوى:** بوو خودان هێز.

**إستكار:** ١- بار ل پشتا خۆ کر. ٢- لەزکر.

**إستكان:** رزیلبوو و خۆ چەماند و بندەستکر.

**الإستكانة:** ١- خۆجهی و تەنابوون. ٢- خۆچەماندن؛ خۆشکاندن.

**الإستكبار:** خۆمەزنکرن ل سەر بێهێز و لاوازا.

**إستكبر:** ١- دیت یێ مەزنە. ٢- خۆ مەزنکر.

**الإستكتاب:** داخوازا نڤێسینێ.

**إستكتب:** ١- داخوازا نڤیسینێ کر. ٢- کرە نڤیسەرێ خۆ. ٣- کۆتێ بۆ من بێژە دا بنڤیسم.

**الإستكتام:** خوازتنا نەدەرەهیکرنا تشتی.

**إستكتمه:** ژێ خواست کو نهینیا ڤەشێرت.

**الإستكثار:** ١- زێدەکرن. ٢- خوازتنا زێدەکرنێ.

**إستكثر:** ١- زێدەکر؛ مشەکر. ٢- دیت کو گەلەکە.

**إستكثف:** دیت کو یێ تیرە.

**إستكد:** داخوازا گەلەک شۆلی کر.

**الإستكراه:** کارپێکرنا بکوتەکی.

**إستكرش:** ١- ناڤچاڤێت وی تێکچوون. ٢- زکێ وێ مەزن بوو و هەر خوار. ٣- زک بوو چێبوو.

**إستكرم:** ١- دیت یێ مەردە. ٢- ڤیا یێ مەرد بیت.

**إستكره:** دلێ خۆ ژێ رەشکر.

**إستكرى:** کرێکر.

**إستكسى:** داخوازا جلکی ژێ کر.

**الإستكشاف:** ١- کارێ لێگەریانێ ژ بۆ دیتنا تشتەکی. ٢- داخوازا زانینا تشتێ نەهاتی یە زانین. ٣- کریارەکە دهێتە کرن ژ بۆ زانینا پێزانینا ل دۆر دوژمنی.

**إستكشط:** تیڤلاند.

**إستكف:** ١- گۆمبوو. ٢- لەپەک لێدا. ٣- دەستێ خۆ ل بەر ڤەگرت. ٤- دەستێ خۆ دانا سەر. ٥- د بن دەستی را بەرێ خۆ دایی. ٦- گرۆڤربوو. ٧- ل دۆر زڤرین. ٨- وەکی دستاری زڤری. ٩- داخوازکر بەلا خۆ ژێ ڤەکەت.

**إستكفأ:** ١- خوازت یا د سێنیکا خۆ برێژت. ٢- پرسیارا بەرێ سالەکێ ژێکر.

**إستكفى:** داخوازا بێ منەتکرنێ ژێ کر.

**الإستكفاف:** ١- دەستکێشان ژ تشتی. ٢- بەسکرن. ٣- خوازتنا بەسکرنێ.

**إستكلأ:** ١- بر. ٢- جەروان لێ مشەبوو.

**إستكلب:** ١- وەکی صەی رەوی. ٢- هاربوو و خۆ ل خەلکی دا.

**الإستكمال:** تەکۆزبوون؛ تمامبوون.

**إستكمل:** تەکۆزکر؛ تمامکر.

**إستكن:** ١- خۆ ڤەشارت. ٢- زڤری مالا خۆ.

**إستكوى:** داخوازا داخکرنێ کر.

**إستلاط:** کرە کوڕی خۆ.

**إستلاق:** پێڤەنویسیا.

**إستلأم:** ١- زریپۆش ل بەر کر. ٢- ژن ژ مۆنا ئینا. ٣- وەرگرت.

**إستلام:** ١- ژ هەژی لۆمێ بوو. ٢- ئەو کر یا وی ژ هەژی لۆمەکرنێ بکەت.

**الإستلام:** وەرگرتن.
**إستلان:** دیت یێ نەرمە.
**إستلانە:** ژ نەرما هژمارت.
**إستلب:** دلێ وی تاقی کر.
**إستلبن:** داخوازا شیری کر.
**إستلجم:** دا خوازکر هەفساری بدەتە سەر.
**الإستلحاق:** ڤێراگەهاندن.
**إستلحج:** ئاسێبوو و ڤەنەبوو.
**إستلحق:** کرە کورێ خۆ.
**إستلحم:** ١- تێکئالیا. ٢- فرەهبوو.
**إستلذ:** دیت یێ ب تامە.
**إستلذه:** گۆتی یا ب تامە.
**الإستلزام:** پێدڤیبوون.
**إستلزم:** دیت یێ فەرە.
**إستلط:** کرە ئەرک.
**إستلطف:** دیت کو یێ ب دولۆڤانی یە.
**الإستلقاء:** رازان؛ خۆدرێژکرن.
**إستلقح:** دەمێ ئاڤسکرنێ هات.
**إستلقی:** رازا؛ خۆ درێژکرە سەر تشتەکی.
**إستکتم:** داخوازکر بڤەشێرت(نهینی).
**إستکمل:** تەکووزبوو.
**الإستکمال:** خوازتنا تەکووزکرنێ.
**إستل:** ئینادەر؛ ژ جهـ کێشا.
**الإستلاب:** تالانکرن.
**الإستلال:** ژجهـکێشان و دەرئێخستن.
**الإستلام:** وەرگرتن.
**إستلب:** تالانکر.
**الإستلحاق:** ١- ڤێراگەهاندن. ٢- خوازتنا ڤێراگەهاندنێ.
**إستلذ:** ١- خۆشی دیت. ٢- خۆشی خوازت.
**الإستلذاذ:** ١- خۆشیدیتن. ٢- خوازتنا خۆشیێ.
**الإستلزام:** پێدڤیبوون؛ فەربوون.
**إستلزم:** پێدچیبوو.
**إستلقی:** رِازا.

**الإستلقاء:** رِازان.
**أستلم:** وەرگرت.
**إستلهم:** ژێ خواست ب کەتە د هزرا وی دا.
**إستلهی:** ١- ل بەندێ ما. ٢- داخوازا راوەستیانێ ژێ کر.
**إستلوی:** قوتبرِکر.
**إستلیث:** وەکی شێری لێهات.
**إستمات:** ١- مرن بۆ خۆ خواست. ٢- ل دویڤ تشتی ب هەمی رِەخا کەڤت. ٣- سستبوو. ٤- کەڤنبوو و درِیا.
**إستماح:** ١- داخوازا دانێ کر. ٢- داخوازا مەهدەرێ کر.
**الإستمارة:** فۆرم.
**الإستماع:** گوهدان؛ گوهراگرتن.
**إستمال:** ١- بۆ خۆ کرە مال. ٢- مالێ وی زێدەبوو.
**الإستمالة:** داخوازا تاگیریێ.
**إستماله:** ب نک خۆ ڤە راکێشا.
**الإستمتاع:** خۆشی وەرگرتن.
**إستمتع:** مفا و خۆشی ل دەمەکێ درێژ دیتن.
**إستمجد:** ١- داخوازا مەزناهیێ کر. ٢- بۆ خودان سالوخەتێت باش.
**إستمخر:** ١- بەرێ دفنا خۆ دایێ. ٢- سەحکرێ کا ژ کیژ لایێ ڤە دهێت بشتا خۆ دایێ(با).
**إستمخض:** ١- مەیینا وی گیرۆبوو. ٢- ژانێت بچویکبوونێ هاتنێ.
**إستمد:** ١- داخوازا هاریکاری و پشتەڤانیێ کر. ٢- حوبر ژێ ئینادەر.
**الإستمداد:** داخوازا هاریکاریێ.
**إستمر:** ١- بۆری. ٢- چوو. ٣- بەردەوامبوو. ٤- ما و خۆجهبوو. ٥- دیت یێ تەعلە.
**إستمرأ:** دیت یێ خۆش و ب تامە.
**الإستمرار:** بەردەوامی.
**إستمری:** دۆهت.
**الإستمزاج:** تێکهەلیکرن ژ بۆ نیاسینێ.

**إستمزج:** تێکهەلیا وی کر دا بنیاست.
**الإستمساک:** گرتن.
**إستمسک:** گرت.
**إستمسک بە:** ١- خۆ پێ پارازت. ٢- خۆ پێڤەگرت. ٣- خۆ گرت. ٤- نەهات.
**الإستمطار:** داخوازا بارانێ.
**إستمطر:** ١- داخوازا بارانێ کر. ٢- پێدڤی بارانێ بوو.
**إستمع:** گوهێ خۆ داییێ.
**إستمکن:** شیا و پێچێبوو.
**إستمل:** بێزاربوو.
**إستملأ:** تژیکرن خوازت.
**الإستملاء:** داخوازا تژیکرنێ.
**الإستملاح:** ١- سویرکرن. ٢- لاو دیتن.
**الإستملاک:** نڤیسینا ملکی، تاپوکرن.
**إستملاه:** پرسیار ژێ کر بۆ بێژت دا بنڤێست.
**إستملحه:** ١- ژ لاوا هژمارت. ٢- دیت یێ لاوە.
**إستملک:** کرە ملکێ خۆ.
**إستمل:** بێزاربوو.
**الإستملال:** بێژاربوون.
**إستمن:** داخوازا قەنجیێ کر.
**إستمنی:** دەستپەڕکر.
**الإستمناء:** دەستپەڕ.
**إستمنح:** داخوازا دانێ کر.
**إستمهی:** ١- هێزا خۆ یا بەزێ هەمی ب کارئینا. ٢- ڕیزبەت دوژمنی قەتکرن و ب ناڤ کەڤتن و شکاندن.
**الإستمهال:** ١- دەرفەتدان. ٢- دەرفەتخوازتن.
**إستمهد:** ڕائێخست.
**إستمهل:** ١- داخوازا دەرفەتێ ژێ کر. ٢- داخوازا خۆلێگرتنێ لێکر.
**إستناء:** ١- ب کوتەکی رابوو. ٢- کەڤت. ٣- پێڤەرابوو. ٤- بۆ یێ گرانبوو پشتا وی پێڤە چەمیا. ٥- دگەل سپیدێ ل رۆژئاڤاییێ ئاڤابوو و هەر وێ گاڤێ ئێگەدی ژ پێشڤە ل رۆژهەلاتێ هەلات. ٦- دویرکەڤت. ٧- داخوازا دانەکێ کر.

**إستناب:** داخواز ژێ کر ببتە جێگرێ وی.
**الإستنابة:** ئەوە کو دەستهەلاتدارییەکا دادی تایبەتمەند دەستهەلاتداریەکا دادی یان ڕێڤەبەری راسپێرت ژ بۆ ئەنجامدانا هندەک کارێت تایبەت نەخاسمە د کارێ دویڤچوون و گوهدانا شاهدا دا.
**إستناخ:** دمەخەلچوو.
**الإستناد:** پشت پێ بەستن، پالدانێ.
**إستنار بە:** شیایێ و ب سەر کەڤت.
**إستنار:** ١- رۆهنکر. ٢- رۆناهیا وی بەردەوامکر. ٣- رۆناهی دا.
**إستناص:** ١- گیرۆبوو. ٢- سەرێ خۆ بلند کر. ٣- لڤی دا غار بدەت.
**إستناط:** دگەل هنارت.
**إستناع:** ١- هژیا. ٢- پێشکەڤت. ٣- دۆم کێشا.
**إستنال:** داخوازا گەهەشتنێ کر.
**إستنام:** ١- نڤست. ٢- ڤیا بنڤت. ٣- خۆ ب درەوڤە دخەوبر. ٤- ل نک وی وەکی ئێکێ نڤستی ئارام بوو. ٥- سەبری وی پێ هات.
**إستنبأ:** ١- داخوازا دەنگوباسا ژێ کر. ٢- لێ گەریا.
**الإستنباط:** دەرئێخستنا رامانێت ڤەشارتی و بەرزە ژ دەقەکی ب هێزا عەقلێ خۆ.
**إستنبث:** بزاڤ د ڤەکۆلینێ دا کر.
**إستنبح:** هێلا برەوت.
**إستنبط:** ١- ئاڤا وی دەرئێخست. ٢- دیارکر پشتی بەرزەبوونێ. ٣- ئافراند. ٤- دەرئێخست. ٥- رامانا ڤەشارتی دیارکر.
**إستنبل:** ١- داخوازا تیرەکێ ژێ کر. ٢- باشێ وی بر.
**إستنبە:** هشیاربوو.
**الإستنتاج:** دەرئەنجام.
**إستنتج:** ١- داخوازا بەرهەمیئینانێ کر. ٢- ئەنجام ژ پێشەکیا دەرئێخستن.

**إستنتل:** ١- کەتە پێشیێ. ٢- خۆ بۆ ئامادەکر. ٣- چوونە پێش.
**الإستنثار:** ١- پێوەربوون. ٢- کفکرن.
**إستنثر:** ئاڤ کرە دفنا خۆ و کفکر.
**إستنجى:** ١- قورتالبوو. ٢- ژێ قورتالکر. ٣- لەزکر. ٤- رەڤی. ٥- د رها را بری. ٦- چنی. ٧- قەسپ خوارن. ٨- تارەتا خۆ گرت.
**الإستنجاء:** تارەتگرتن.
**إستنجب:** داخوازا پاکەعەسلا کر.
**إستنجد:** ١- هەوارا خۆ برە نک. ٢- بوو دلێر. ٣- بهێزکەڤت. ٤- لێ بستەهبوو.
**إستنجر:** داخوازا ب دویماهیئینانێ کر.
**أستنجز:** پێدڤیا خۆ ب دەستڤە ئینا.
**إستنجش:** ١- دەرئێخست.
٢- راهێلایێ و ژ جهەکی برە جهەکی.
**إستنجع:** لێگەریا.
**إستنجل:** ئاڤزە لێ مشەبوون.
**إستنجى:** ١- لەزکر. ٢- قورتالبوو. ٣- رەڤی. ٤- ژ رهـ و ریشالا ئینادەر. ٥- چنی. ٦- قوینا خۆ پاقژکر.
**إستندر:** ١- دیت کو تشتەکێ کێمە. ٢- ب دویڤ کەڤت. ٣- ل دویڤ هات.
**إستنزع:** داخوازا ژێگەریانێ ژێ کر.
**إستنزل:** ١- ئینا خوار. ٢- داخوازا هاتنەخوارێ کر. ٤- ژ بلندیا خۆ هاتە خوار.
**إستنزه:** ١- داخوازا خۆ دویرکرنێ کر. ٢- داخوازا سەیرانێ کر.
**الإستنساخ:** کۆپیکرن.
**إستنسخ:** ١- کۆپیکر؛ ئێکا دی ل بەر چێکر. ٢- داخوازا کوپیکرنێ کر.
**إستنسر:** خۆ کرە قورت.

**إستنشأ:** ١- داخوازا چێکرنێ کر. ٢- ل دویڤ چوو.
**إستنشى:** ١- بێهنکر. ٢- لێچوو و زانی.
**الإستنشاق:** باهلکێشان.
**إستنشد:** داخواز ژێکر شعرێ بوو بخوینت.
**إستنشر:** داخوازا بەلاڤکرنێ کر.
**إستنشط:** کۆمبوو و قرڤچی.
**إستنشق:** ١- هلکێشا؛ کرە دفنا خۆ. ٢- بێهنکرێ.
**الإستنصار:** داخوازا پشتەڤانییێ.
**إستنصت:** راوەستا گوهێ خۆ دایێ.
**إستنصح:** داخوازا شیرەتێ کر.
**إستنصر:** ١- داخوازا سەرکەڤتنێ کر. ٢- هەوارا خۆ برە نک.
**إستنصف:** ١- داخوازا عەدالەتێ کر. ٢- حەقی خۆ ب دورستی ژێ وەرگرت.
**إستنصل:** ١- ژێ ئینادەر. ٢- ژ بنێ ئینادەر.
**إستنضج:** کەلی.
**إستنضح:** ئاڤ هاڤێتە قوونا خۆ پشتی دەستنڤێژێ.
**إستنضر:** دیت یێ تەر و نازک و جوانە.
**الإستنطاق:** دانەئاخڤتن.
**إستنطق:** ١- دگەل ئاخڤت. ٢- داخوازا ئاخڤتنێ ژێ کر. ٣- و ل دویڤ زاراڤێ یاسایێ دبیتە:
داخوازا راپۆرتێ ژێ کر.
**إستنطقه:** دا ئاخڤتن.
**إستنظره:** ١- خۆ لێ گرت. ٢- داخوازا خۆلێگرتنێ ژێ کر ئانکو یا دەرفەتێ.
**إستنظف:** داخوازا یێ پاقژ کر.
**إستنعش:** زفتبوو پشتی سستییێ.
**إستنفد:** ١- خلاسکر. ٢- ڤالاکر.
**إستنفر:** ١- رەڤی. ٢- هێلا برەڤت. ٣- داخوازا هاریکاریێ و پشتەڤانییێ کر.
**إستنفض:** دەرئێخست.

**إستنفع:** داخوازا مفای کر.
**إستنفق:** خلاسکر.
**الإستنقاذ:** ١- ڕزگاریخوازتن. ٢- ڕزگارکرن.
**إستنقذ:** ڕزگارکر.
**إستقدم:** کەتە پێش؛ ببەرێ گەڤت.
**إستنقع:** ١- خۆ هاڤێتە ئاڤێ دا هین ببت. ٢- خرببوو. ٣- داخوازا شکاندنا تێهنکێ کر. ٤- بلندبوو. ٥- زەرببوو و هاتە گوهۆرین.
**الإستقطاب:** ١- ڕاکێشان. ٢- جەمسەرکرن. ٣- کێمبوونا هێزا لڤینکار ژ ئەگەرێ کریارێت کیمیاوی یێت د پاتریێ دا چێدبن.
**الإستکفاء الإقتصادي:** ئەوە کو وەلاتەک ژ لایێ ئابۆری ڤە خۆ ژ وەلاتێت دی بێ منەت بکەت ئانکو ئەو ب خۆ هەمی پێدڤییێت خۆ دابین بکەت.
**الإستنکاح:** خوازتنا ژنئینانێ.
**الإستنکار:** دیارکرنا نەرازیبوونێ.
**الإستنکاف:** ژخۆنەگرتن.
**إستنکح:** ١- مارکر. ٢- ژنەک ژێ ئینا. ٣- ب سەر زالبوو.
**إستنکر:** ١- خۆ پێ نەئینادەر. ٢- ئعتراف پێ نەکر. ٣- نەنیاسی.
**إستنکف:** ١- خۆ مەزنکر. ٢- ژخۆنەگرت.
**أستنکه:** ١- بێنکرە بێهنا دەڤێ خۆ. ٢- بیهنکرە دەڤێ وی.
**الإستنهاض:** خواتنا ڕابوونێ.
**إستنهض:** خوازت ڕابیتەڤە.
**إستنهد:** داخوازکر بێهنا خۆ ژ خەما دا ژ کوبراتیا سینگێ خۆ دەربیخت.
**إستنهر:** ١- بوو رویبار. ٢- فرەهبوو. ٣- بۆ چوونا خۆ جهەکێ باش ژ عەردی گرت.
**إستنهض:** داخوازا رابوونێ کر.

**إستنهی:** گۆتێ بەسکە.
**إستنوی:** بەرکێ وێ هاڤێت(قەسپ).
**إستهاف:** تێهنێ گرت.
**الإستهال:** خۆپیسکرن.
**إستهال:** دیت یێ ترسیایە.
**إستهان بە:** بێ بها کر.
**إستهب:** هێلا رابیت(با).
**إستهتر:** ١- ب دویڤ بایێ خۆ کەت و د خەما چو نینە. ٢- ب عاقل نەکەت.
**إستهج:** ١- ب خۆکر و گوهێ خۆ نەدا کەسەکی. ٢- لەز لێ کر.
**الإستهجان:** کرێتدیتن.
**إستهجن:** دیت یێ کرێتە.
**إستهد:** دیت یێ لاوازە.
**إستهدی:** نیشادانا ڕیکا دورست خوازت.
**الإستهداء:** خوازتنا ڕینیشادانێ.
**الإستهداف:** ١- ستێرک لێگرتن. ٢-کرنەنیشان.
**إستهدج:** ب ڤەهەژیان ڤە برێڤەچوو.
**إستهدف:** ١- ڕەقراوەستا. ٢- بلندبوو و کەتە هەمبەری. ٣- مەزنبوو هەتا وەکی ئارمانجێ لێهاتی.
**إستهدی:** ١- داخوازا ڕێکا راست و دورست کر. ٢- داخوازکر دیاریەکێ بدەنێ.
**إستهرج:** ب هێزکەڤت و بەرفرەهبوو.
**إستهرم:** ١- دانا ڕێزا پیرا. ٢- دیت یێ پیرە.
**إستهزء:** ١- شکاند. ٢- ب سرێ کوشت. ٣- مر. ٤- لڤاند. ٥- یاری پێکرن.
**الإستهزاء:** تورانەپێکرن.
**إستهزم:** ١- ڕاتەڤاند. ٢- داخوازا ڕاتەڤاندنا وی کر. ٣- دیتن یێت رەڤین.
**إستهش:** دیت یێ سڤکە.
**إستهضب:** بوو بانی.
**إستهطع:** لەزکر.

**إســـــتهل:** ١- بارینـــا وی دژواربـــــوو. ٢- دەستپێکا بارانی دیارکر. ٣- روندک کر. ٤- بەریَ خۆ دانە هەیڤێ. ٥- دیاربوو. ٦- هـــەیڤا وی دیـــاربوو. ٧- ژ کــەیفادا گەشــبوو. ٨- ل دەمێ بـوونێ دەنگێ خـۆ بلند کر (بچویکی). ٩- پێ ڤەکر یان پێ دەستپێکر (هەلبەستا خۆ). ١٠- کرە قیژی. ١١- هەلات. ١٢- دیاربوو.

**الإستهـلاک:** ١- خـلاسکـرن. ٢- ژنـاڤبرن. ٣- مەزاختن.

**الإستهلال:** ١- هەلاتنا هەیڤێ. ٢- دەستپێکرن. ٣- جوانیـــا دەســـپێکرنا هەلبەســـتێ. ٤- لڤانـدنا ئندامـەکی ژ لایێ بچـویکێ ژ نوی بوویی کو دبیتە ئیشارەت کو یێ ب رحە و دێ ژیت.

**إستهـلک:** ١- نـەهێـلا؛ تێبر. ٢- مـەزاخت. ٣- کار و لەز تێدا کرن.

**إستهنأ:** ١- خوار. ٢- داخوازا پشتەڤانیێ کر. ٣- داخوازا دانێ کر.

**الإســـــتهواء:** ١- نڤانــــدنا مەغناتیســـــی. ٢- ل دویڤ خۆ برن.

**إستهواه:** ١- ل دویڤ بایێ خۆ بر. ٢- عەقلێ وی ژێ ستانــــد. ٣- ئەڤینا خۆ ل بەر شرینکر.

**أســتهیم(بالبناء للمجهــول):** عــەقلێ وی ژ ئەڤینێ نەما.

**إستوی:** ١- راستبوو. ٢- تەکووزبوو. ٣- خۆجهبوو.

**الإســتواء:** ١- خۆجهبــوون. ٢- تــەکووزبوون. ٣- وەکئێکلێهاتن.

**الإستوائي:** یێ سەر ب هێلا ئستوائی ڤە.

**إستوثر:** ١- دیت یێ نەرمە. ٢- زێدەکر.

**إســــتوثق:** ١- دەکومێنـــت ژێ وەرگـــرت. ٢- تەئکید ل پاراستنا وی کر. ٣- پـەیمان ژێ خواست.

**إستوثن:** ١- ما و ب هێزکەت. ٢- تێژکێت وێ دگەل مەزن بوون (حێشـتر). ٣- قەلـەو بوو. ٤- زێدەبوو.

**إستوجب:** ١- پێدڤیبوو. ٢- ژ هەژی بوو.

**إستوجز:** کورتکر.

**إستوجف:** بر.

**إســتوحش:** ١- کویـــڤیبوو. ٢- خــەریببوو. ٣- سەبرێ وی پێ نـەهات. ٤- خەلک ژێ چوون(جهـ).

**إستوحل:** تەڤن ما پێڤە.

**إســتوحی:** ١- داخـوازا هاریکـاریێ ژێ کـر. ٢- داخـــوازا تێگەهانــــدنێ ژێ کـــر. ٣- داخوازا لەزێ ژێ کر.

**إستوخم:** ١- جوی و نەداعویرا. ٢- ل بەر گران بوو. ٣- دیت یێ گرانە.

**إستوخی:** داخوازا سەحوسیا ژێ کر.

**إســتودع:** ١- خــاتر ژێ خواســت. ٢- کــرە ئێمانەت. ٣- کرە د عومباریێ ڤە.

**إستودع:** داڤێ ب ئێمانەت.

**إستودی:** ئیعتراف ب حەقێ وی کر.

**الإســتودیو:** جهــێ وێنـەگرتنێ یـان دەرهینانـا فلما(فرەنسی) یە.

**إستورد:** ١- ئینـا ، ئـامادەکـر. ٢- قەسـتکری. ٣- ژ دەرڤەی وەلاتی ئینا.

**إستورط:** ١- مر. ٢- لێ ب زەحمەت کەت. ٣- کەتێ.

**إستوری:** ١- کریسـک ژێ چوون. ٢- پرسیارا دیتنا وی ژێ کر.

**إستوزر:** ١- کرە وەزیرێ خۆ. ٢- بر.

**إستوزع:** داخوازا ئیلهامێ کر.

**إستوزی:** ب سەرکەڤت.

**إستوسخ:** پیسبوو.

**إستوسع:** ١- فرەهبوو. ٢- دێت یێ فرەهە.

**إستوسق:** ١- كۆمبوو و هاتە ڕێڤەبرن. ٢- هاتە ڕێكخستن. ٣- بۆ ب ساناهی كەڤت.
**إستوسن:** ١- گەلەک خەوا هات. ٢- خەوێ چاڤێت وی گرت. ٤- هشیاربوو. ٥- دلگرتیبوو.
**إستوشم:** داخوازا دەقدانێ كر.
**إستوشی:** ١- هاندا. ٢- لێ گەریا و كۆمكر.
**إستوصد:** بۆ خۆ كرە گۆڤ.
**إستوصف:** ١- ژێ خواست بۆ سالوخەت بدەت. ٢- ژێ خواست دەرمانێ وی بۆ دیار بكەت.
**إستوصل:** داخوازا پەیوەندییێ ژێ كر.
**إستوصی:** وەسیەتا وی قەبیل كر.
**إستوضح:** ١- داخوازا رۆهنكرنێ كر. ٢- هەولدانا رۆهنكرنێ كر. ٣- چاڤەكێ خۆ گرت و لێ نیری. ٤- كێم و رەزیل بوو. ٥- بێهنا خۆ لێ فرەهـ كر.
**إستوطن(إتطن):** بۆ خۆ كرە وار یان وەلات.
**إستوعب:** ١- هەمی بر. ٢- ژ بنی ئینادەر. ٣- هەمی وەرگرت. ٤- بەرفرەهكر.
**إستوعد:** داخوازا ژڤانی ژێ كر.
**إستوعر:** دیت یێ سەخت و ب زەحمەتە.
**إستوعره:** دیت یێ سەختە.
**إستوعل:** ١- خۆ دانە سەرێ چیای. ٢- قەستكرێ.
**إستوعی:** ١- تێگەهەشت. ٢- هەمی بر.
**أستوفد:** هنارت وەک شاند.
**إستوفر:** ١- مشەكر. ٢- پەیداكر. ٣- ئەداكر.
**إستوفز:** نەیێ رحەتبوو.
**إستوفض:** ١- لەزكر. ٢- بژالەبوو. ٣- كرە دەر. ٤- نەفیكر.
**إستوفق:** داخوازا سەركەڤتنێ ژێ كر.
**إستوفی:** ئەداكر؛ ب دورستی دایێ.
**إستوقح:** ڕەقبوو.

**إستوقد:** ١- هلبوو. ٢- هلكر.
**إستوقر:** ١- قەلەو بوو. ٢- بارێ وی گرانبوو. ٣- بر.
**إستوقع:** ١- خۆ ل هویڤیا رویدانا وی گرت. ٢- ژێ ترسیا. ٣- پێویستی سەقاكرنێ بوو (شیر).
**إستوقف:** داخوازا راەستانێ ژێ كر. ٢- راوەستاند.
**إستوقفه:** داخوازا راوەستانێ ژێ كر.
**أستوكع:** ١- مەعدا وی موكمبوو. ٢- موكمبوو. ٣- قەلەوبوو.
**إستوكف:** بۆ دلۆپ و چوو.
**إستوله:** عەقلێ وی تێكچوو.
**إستولی:** ١- شیاییێ و دەستێ خۆ دانا سەر. ٢- بەری هەمیا گەهەشتێ. ٣- كەتە دەستی.
**إستوهب:** خوازت.
**إستوی:** ١- راستبوو. ٢- خۆجهبوو. ٣- قەستكرێ. ٤- كونترۆلكر و دیاربوو. ٥- جەحێلینیا وی ب دویماهی هات. ٦- كەلی.
**الإستیاء:** عێجزبوون؛ دلمان.
**أستیأس:** هویڤی برِی.
**إستیبس:** هشكبوو.
**الإستیجاز:** كورتكرن.
**الإستیحاش:** ١- بێهەداربوون. ٢- بێهتەنگبوون.
**الإستیخارة:** بەركوشكەكە كەهەنێت مەلەكی ل بەرخۆ دكن (یۆنانی) یە.
**الإستیراد:** ئینان ژ دەرڤە.
**إستیسر:** ١- ب دەستكەڤت. ٢- چێبوو.
**الإستیضاح:** خوازتنا رۆنكرنێ.
**الإستیعاب:** وەرگرتنا هزرێ.
**الإستیفاء:** ١- تێراكرن. ٢- بدویماهیهاتن. ٣- داخوازا تمامكرنێ.
**الإستیقاظ:** هشیاربوون.

**الإستيقاع:** خۆگرتن ل هويڤيا ڕويدانا تشتەكی.
**الإستيقان:** بێگومانبوون.
**إستيقظ:** هشياربوو.
**أستيقن:** ١- زانی. ٢- باوەركر. ٣- گومان ل نک نەما.
**الإستيلاء:** دەستەسەركرن؛ ستاندن.
**الإستيلاد:** داپیركاریكرن.
**الأستيلين:** غازەكا ژەهرا بێ بێهن و ڕەنگە، د كارێ حەلاندنا كانا دا دهێتە ب كارئينان.
**الإستيهاب:** خواستنا دانێ.
**الإسحار:** سپێدەكرن.
**إسحاق:** ١- دويركرن. ٢- ناڤێ كوڕەكێ ئيبراهێم پێغەمبەری یە سلاف لێ بن، دبيتە بابێ يەعقووب پێغەمبەری سلاف لێ بن.
**الإسحاقية:** شيعەنە؛ وەكی شيعێت (النصيرية)، دبێژن: خودێ يێ د لەشێ (علي بن أبي طالب) دا ئاكنجيبووی.
**أسحت:** قوتبركر.
**الأسحم:** ١- بشكۆژا چچكی. ٢- عەورێ ڕەش. جەركێ مەيێ. ٣- خوينا هەڤپەيمان دەستێت خۆ دكەنە تێدا و پەيمانێ ددن.
**أسحم:** ڕەش.
**الأسحوان:** لاوێ بەژن بلند.
**أسخى:** مەردتر.
**الإسخان:** گەرمكرن.
**أسد(بفتحتين):** ب جورعەت كەت.
**الأسد:** ١- شێر. ٢- ناڤێ بورجێ پێنجێ يە ژ هەر دوازدە بورجێت عەسمانی.
**أسدالله:** ناسناڤێ (حمزة)يە مامێ پيغەمبەری سلاف لێ بن.
**الإسدال:** بسەردابەردان؛ بەردان.
**الأسدران:** ١- هەردو مل. ٢- دو دەمارن د چاڤی دا.
**الأسر(بالضم):** ميزەواقی.
**الأسر(بالفتح):** ديلكر، ئێخسيركر.
**الإسراء:** ١- چوونا ب شەڤ. ٢- ئێخسيركرن. ٣- چوونا محەمەد پێغەمبەر - سلاف لێ بن - ب شەڤ ل سەر پشتا بوراقێ ژ مەككەهێ بۆ (بيت المقدس) ل قودسێ. ٤- ناڤێ سوورەتەكا قورئانێ يە.
**إسرائيل:** بەندێ خودێ ناسناڤێ يەعقووب پێغەمبەری یە - سلاف لێ بن.
**الإسرائيليات:** ئەو گۆتن و دەنگوباسن يێت جوهيا داينە ناڤ يێت دينێ ئيسلامێ يان موسلمانا ژ جوهيا وەرگرتين.
**الإسراج:** هلكرنا چرای.
**الإسرار:** نهينيكرن؛ ڤەشارتن.
**الإسراع:** لەزكرن.
**الإسراف:** مەزاختنا زێدەی سنووری.
**إسرافيل:** ئەو فريشتەيە يێ هاتيە ڕاسپاردن بۆ ڕاگەهاندنا قيامەتێ ب پفكرنا بووقێ.
**الأسرب:** ڕساس (فارسی) يە.
**الأسرة:** ١- خێزان. ٢- زرێپۆشێ موكم.
**أسرع:** بەزەكتر.
**أسس:** ١- بنيات دانا. ٢- دامەزراند.
**الإسطار:** ڕێزكرنا پەيڤا.
**الإسطبل:** ئاخويرا دەوارا.
**الإسطاطيقي:** زانستێ جوانيێ؛ ڤەكۆلينێ ب گشتی ل دۆر جوانيێ دكەت؛ هەروەسا ل دۆر وی هەستێ جوانيێ د ڕحان دا پەيدا دكەت.
**أسطر الصين:** جۆرەكێ گيايە ژ بەر جوانيا كوليلكێت وی ل باغچەيا دهێتە چاندن، ڕەنگێ وی يێ سپی يە يان يێ گولگولی يە يان يێ بنەفشی يە، ديسا دبێژنێ: **(اللؤلؤية)**.
**الأسطراغالس:** جۆرەكێ كارایە، يێ ب ستری يە، جەلەک نفش ژێ هەنە، ستركێ ژێ دەردئێخن، ژ هندەكا ژ وان نفشا دەرمان چێدكەن.

**الإسطرلاب:** ئامیرەکێ کەڤنە ژ بۆ دیارکرنا جهێت ستێرا و شەڤ و رۆژا و گەلەک کاریت دی پێت فەلەکی.
**الأسطع:** ستۆیێ درێژ.
**الأسطقس:** بنیات و نژاد، کو دبیتە ئاڤ و عەرد و با و ئاگر(یۆنانی) یە.
**الأسطقسات:** کوما (سطقس)ە ئەو ژێ پەیڤەکا یۆنانی یە رامانا بنیات ددەت، دیسا ناڤێ هەرچار نژادایە پێت کو دبنە بنیاتێ مرۆڤ و جانەوەر و بێجانا: ئاڤ و ئاخ و با و ئاگرن.
**الإسطوانة:** ١- ستوین. ٢- بۆری.
**الأسطورة:** ئەفسانە؛ چیڤانۆک.
**الأسطول:** کۆمەکا کەشتیان یان فرۆکەیێت شەری یان بازرگانی یە یان کەشتییێت نیچیریێ (یۆنانی) یە.
**الإسعاد:** شادکرن.
**الإسعاف:** ١- چارەکرن. ٢- ڤێراگەهەشتن.
**أسعد:** شاد؛ شادتر.
**أسعر:** لەغەر؛ کێم گوشت.
**أسعف:** ١- دەرمان ڤێرا گەهاند. ٢- پێدڤیا وی ب جهـ ئینا.
**الأسف:** ١- مخابنی. ٢- خەم.
**آسف:** ببورە.
**الأسفار:** ١- کۆما(سفر)ە کو دبیتە پەرتووک. ٢- کۆما(سفر)ە کو دبیتە وەغەر.
**الإسفار:** ب وەغەردان.
**الأسفار الخمسة:** هەر پێنج کتیبێت موسا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن نە کو دبنە: ١- (سفر التکوین) ل دۆر پەیدابوونا هەبوونێ یە. ٢- (سفر الخروج)ل دۆر دەرکەڤتنا جوهیانە ژ وەلاتێ مسرێ. ٣- (سفر لاویان) ل دۆر شەریعەتێ جوهیانە. ٤- (سفر الإعداد) ل دۆر هێزا ماددی یا جوهیانە. ٥- سفر الإستثناء) کو دبیتە تمامکەرا هەر چار کتێبت دی.
**الإسفاف:** دژواریا نێرینێ.

**إستفسر:** برسیارکر.
**الأسفل:** ١- بن. ٢- خواریێ. ٣- ژێری.
**إسفنج:** ١- ئاژەلەکێ دەریائی یە، شکلێ داریێ ددەت، ژ بۆ کارێت پیشەسازی دهێتە ب کارئنان، دبێژنێ: (ئیسفەنجێ سرۆشتی). ٢- کەرەستەکێ پیشەسازی دکەنە دوشک و بالیفک و تشتێت دی، دبێژنێ: (ئیسفەنجێ پیشەسازی).
**الإسقاء:** ئاڤدان.
**الإسقاط:** ١- ئێخستن. ٢- بەرهاڤێتن. ٣- ژبەربرنا حالی.
**إسقام:** نەساخکرن.
**الأشقح:** سیسێ موی زەر.
**الإسقربوط:** ئێشەکە ژ نەمانا ڤیتامین (C) چێدبیت، نیشانێت وێ دبنە کێمخوینی و کولبوونا پرتیا و خاڤیا لەشی و دلرەشبوون ژ خوارنێ.
**الأسقف:** ١- پلەیەکا دینداری یە د دینی فەلا دا د سەر قەشاتیێ و د بن مەترانییێ دا یە،(یۆنانی) یە. ٢- زەلامێ کەلەدرێژ و هەستی ستوبر.
**الأسقفية:** پلەیا (أسقف)ی یە.
**إسقنقور:** تمساحێ دێمی (یۆنانی) یە.
**الإسقيل:** پیڤارا کافرا، (یۆنانی)یە.
**الإسكات:** بیدەنگکرن.
**إسكافي:** پنیدۆز.
**الإسكافية:** خەوارجن؛ دوڤچوویێت (أبو جعفر الإسکافي) نە، دبێژن: خودێ نەشێت زۆرداریێ ل عاقلدارا بکەت بەلێ دشێت ل بچویکا بکەت.
**الإسكان:** ١- خۆجهکرن. ٢- ڤەحەواندن.
**الأسكفة(العتبة):** دەرازینک.
**إسكلة:** بەندەر (ئیتالی) یە.
**الأسكوبة(الأسكابة):** ئەو دارکە یێ دکەنە د کونا د کونکی ڤەبووی را دا ئاڤ ژێ نەهێت.
**الأسكوفة:** دارێ دەرازینکێ.
**أسل:** روم.

**الأسلة:** سەرێ ئەزمانی.
**أسلة اللسان:** سەرێ ئەزمانی.
**إسلال:** دزی.
**الإسلام:** ١- دینێ (محمد بن عبدالله)ێ پێغەمبەرە یێ کو بەری (١٤٠٠) گازیا ل جهێ بوونا خۆ ل جزیرتا عەرەبی ل باژێرێ مەککەهێ بەلاڤکری و ل جیهانێ بەلاڤبووی، کو نوکە ژمارا دویڤچوویێت وی (موسلمان) ل سەرانسەری جیهانێ گەهەشتینە پتر ژ ملیار و نیڤ کەسا.
٢- خۆ تەسلیمی خودێ کرن و ب جهئینانا فەرمانێت وی بێی ڕەتکرن.
**الإسلام السياسي(الحزبي):** موسلمانەتیا وان حزب لایەنەیا ئەوێت دینێ ئیسلامێ ل دویڤ ئامانجێت خۆ ییێت دنیایی، کو د بنیات دا ژ لایێ لایەنێت دەرڤەیی هاتینە ڕاسپاردن و پشتەڤانیا وان دهێتە کرن، ئانکو ئیسلام کریە پێسترک ژ بۆ ب جهئینانا ئارمانجێت خۆ پشتەڤانێت خۆ، و پێ شیاین موسلمانێت سادە - یێت کو نەزانن حزبایەتی د دینێ ئیسلامێ دا یا حەرامە - دسەردا ببەن و ئالۆزیێ بۆ مللەت و وەلاتێت خۆ پەیدا بکەن.
**أسلم:** بێ زیانتر.
**الأسلوب:** ڕێباز؛ ستایل.
**أسلوب الحكيم:** شێوازێ ئاقلمەندی کو دبیتە ئێک ژ بابەتێت (علم البديع) ئەو ژی ئەوە کو مرۆڤ نە وەک یا د دلێ خۆ دا د گەل کەسەکی باخڤیت هەر وەکی ب شێوەزەکێ جوان و ئارام گەفێ ل کەسەکی بکەت، هەر وەکی کورد دبێژن: (بنەرم بگەهینیتە چەرمی).
**الأسلوت:** جانەوەرەکێ وەکی پلنگی یە ل کیشوەرێ ئەفریقیا دژیت.
**إسمأل:** چوو.
**إسم:** ناڤ.

**الأسماء الحسنى:** هەر (٩٩) ناڤێت پیرۆزێت خودێ نە.
**الإسماع:** هێلانا کەسەکی کۆ گول تشتەکی ببت.
**الإسماعيلية:** شیعەنە؛ دبێژن: ئیمامەتی یا (إسماعيل بن جعفر الصادق)ە، و دەربارەی خودێ دبێژن: خودێ نەهەیە ونەیە، و نەزانایە و نەنەزانە، و نەشیانداره و نە یێ بێ شیانە، و هەر وەکی ڤێ دەربارەی ساخەتیت وی ژی دبێژن.
**الإشمام:** ئامادەکرنا لێڤایە ژ بۆ گۆتنا (الضمة) بەلێ بێی گۆتن دا کو پیتا ل دویڤ بێژیت، ئەڤە د تەجویدێ دایە.
**إسم الإشارة:** ناڤێ ئاماژە پێدانێ وەکی (ذك) یان (هؤلاء).
**الإسم الأعظم:** ئەو ناڤێ خودێ یە یێ کو ڕامانا گشت ناڤێت وی ڤەدگرت، باهرا پترا بۆچوونا ئەوە کو (الله)ە.
**الإسم التام:** ئەو ناڤە یێ ژ بەر تەکووزا وی دهیتە (نصب)کرن ژ بەر کو نەیێ پێدڤی (إضاف)ێ یە، و تەکووزیا وی ب جار تشتایە کو دبنە: (تنوين، إضافة، نون التثنية، الجمع).
**إسم التفضيل:** ئەو ناڤە یێ ل سەر کێشا (أفعل) وەکی (أنور) یان (أحمد).
**إسم الجنس:** ئەو ناڤ یێ ل سەر نژادەکی دهیتە دانان وەکی(رجل) یان (إمرأة) کو ل سەر هەر میرەکی یان ژنەکێ دهێتە دانان.
**إسم الزمان:** ناڤێ دەمی وەکی (عام) (شهر).
**الإسم المتمكن:** ١- ئەو ناڤە یێ دهێتە ئعرابکرن وەکێ (زيد)ی. ٢- ئەو ناڤە یێ شکلی (حرف)و (فعل)ێ نەدەت. ٣- ئەو ناڤە یێ دویماهیا وی ل دویڤ ئعرابێ دهێتە گوهۆرین وەکی (رأيت زيدا) و(مررت بزيد).

**الإسم المنسوب:** ئەو ناڤە يێ كو (ياء النسب) ل دويماهيا وى وەكى (كردي).
**الإسم المقصور:** ئەو ناڤە يێ كو (ألف مفردة) ل دويماهيا وى وەكى (حبلى) يان (عصا).
**إسم المكان:** ناڤێ جهى يە وەكى (سهل) يان (صحراء).
**الإسم المنقوص:** ئەو ناڤە يێ كو (الياء الساكنة) يا پيتەكا (مكسور) بەرى وێ وەكى (القاضي).
**الأسمران:** گەنم و ئاڤ.
**أسمن:** قەلەوتر.
**الإسمنت:** چيمانتو.
**الإسمية:** رێبازەكا فەلسەفى يە دبێژت چو راستى ژ بۆ هەبوونا جوين و توخم و رەنگا نينە(نوميناليسم).
**أسن:** ١- ژيێ وى درێژ بوو، ب ناڤسال ڤەچوو. ٢- هاتە گوهۆرين. ٣- گەنيبوو.
**الآسن:** ١- گەنى. ٢- رەنگ و تامێت وى هاتنە گوهۆرين.
**أسن:** مەزنتر، بعەمرتر.
**الإسناد:** ١- پالدانا تشتى ل سەر تشتى. ٢- زڤراندنا فەرمۆدێ يان گۆتنێ بۆ خودانى. ٣- پشتەڤانى؛ پشتگرتن.
**أسنى:** سالەكێ ما.
**الإسهاب:** درێژكرن.
**الإسهال:** زكچوون.
**أسهب:** ١- عەقلێ نەما. ٢- درێژكر.
**الأسهل:** يێ بساناهيتر.
**الأسوء:** يێ خرابتر.
**الأسوار:** ١- كۆما(سوار)ە كو دبيتە بازن. ٢- كۆما(سور)ە كو دبيتە دەڤەنە؛ شويرهە.
**أسوار(بالضم):** بازن.
**الإسوار:** تيروەشينێ زێرەك.

**الأسوارية:** دويڤچوويێت (الأسواري)نە، ژ خەوارجانە وەكێ خەوارجيت (النظامية) دبێژن نەشێت وى تشتى بكەت ئەوێ ئەو دبێژت نينە بەلێ مرۆڤ دشێن بكەن.
**أسوة:** پێشەوا؛ ئەوێ هەمى چاڤ لێ دكەن.
**الأسود:** ١- مارێ مەزن. ٢- رەنگێ رەش.
**الإسوداد:** رەشبوون.
**الأسودان:** خورمە و ئاڤ.
**أسي:** خرابكر.
**آسي:** ١- سەرەخۆشى لێ كر. ٢- پێك ئينان.
**الآسي:** بەهيچن.
**الأسي:** خەم.
**أسيف:** غەمگين.
**آسيا:** كيشوەرێ ئاسيا.
**آسيا الصغرى:** ناڤێ كەڤنێ (تركيا) نوكە يە.
**إساء:** دەرمان.
**أسوان:** غەمگين.
**آسية:** ١- دختۆر. ٢- ستوين.
**أسيلة:** راست و نەرم و حولى.
**أش(بالتشديد):** بەلگ وەراندن.
**الأش:** نانێ هشك.
**الأشابة:** ١- خەلكێ تێكهەل ژ هەمى جوينا. ٢- كەدا حەرام تێهەلبووى.
**أشاب:** پيركر.
**أشاد:** پەسنا وى كر.
**الإشادة:** پەسنكرن.
**الإشارة:** ١- ئاماژە؛ گەهاندنا وێ تشتێ مرۆڤى نەڤێت ب دەڤى بێژيت ب رێكا ئيشارەتێ.
**أشاع:** بەلاڤكر.
**الإشاعة:** گوتگوتك؛ پرۆپاگندە.
**الأشاعرة:** دوڤچوويێت (أبى الحسن علي بن إسماعيل الاشعري)نە يێ ژ دويندەها (أبو موسى الأشعري) يێ سەحابى.
**الإشاك:** لەزكرن.

**الأشاهیب:** کۆما (أشهب)ە ئانکو ڕەنگ ئەسمەرێ سپیاتی ل سەر زال، ناسناڤێ کورێت (المنذر اللخمي) نە شاهێ دەولەتا (المناذرة)، ژ بەر کو هندی د لاوبوون.
**الأشب:** داروبارێ تێکرا یێ مرۆڤ تەشێت ژێ دەرباز ببیت.
**الأشباح:** کۆما (شبح)ە کو دبیتە هەلامەت.
**الإشباع:** ١- تێرکرن. ٢- د سەروایێ دا دبیتە نیشانا پیتا د ناڤبەرا (ألف التأسیس) و پیتا دبیتە سەروا دا وەکی (قاتل).
**أشتات:** بژالە.
**إشتاق:** خەریببوو.
**الإشتباک:** ١- تەڤلهەڤبوون. ٢- پێکوەرهاتن.
**الإشتباه:** گومانژێبرن.
**إشتبک:** ١- تەڤلهەڤبوو. ٢- تێکەلبوو. ٣- تێکئالزی.
**الإشتجار:** لێکەڤتن.
**إشتد:** دژواربوو؛ شدیا.
**الإشتداد:** دژواربوون؛ شدیان.
**الأشتر:** ١- یێ لێڤا وی یا خوارێ شەق (کەم). ٢- یێ قەیتانا چاڤێ وی ڤاژی یان دادرهای یان شۆربوویی.
**الإشتراء:** کڕین.
**الإشتراط:** مەرجگیرکرن.
**أشراف الإنسان:** دفن و گوهێت مرۆڤی.
**الإشتراک:** پشکداریکرن.
**الإشتراکیة:** ڕێبازەکە ئارمانجا وێ ئەوە جڤاکی بگوهۆرت ب ڕێکا بەلاڤکرنا مالی ل سەر هەمیا زێدەباری کارێ هەڤپشک و کەرستێ خوارنێ و کەلوپەلی(سوسیالیسم).
**إشترع:** شەریعەت دانا.
**إشتری:** کڕی.
**الإشتعال:** سۆتن.
**الإشتغال:** مژویلبوون.
**الإشتفاف:** ڤەخوارنا هندی د ئامانی دا.
**إشتفی:** ساخبوو.

**الإشتقاق:** چێکرنا پەیڤەکێ ژ پەیڤەکا دی بەلی ب مەرجەکی ب رامان و پێکهاتوویێ وەکی وی بیت و ب شێوەی ڤە یا جودا بیت.
**الإشتقاق الأکبر:** چێکرنا پەیڤەکێ ژ پەیڤەکێ یە لێ تنێ ژ لایێ دەرئێخستنا پیتاڤە وەکی چێکرنا پەیڤا (نعق) ژ پەیڤا (نهق).
**الإشتقاق الصغیر:** چێکرنا پەیڤەکێ ژ ڤەیڤەکا دی کو پیتێت وێ وەکی ئێک بن وەکی پەیڤا (ضرب) ژ پەیڤا (الضرب).
**الإشتقاق الکبیر:** چێکرنا پەیڤەکێ ژ پەیڤەکا دی کو رامان وەکی ئێک بن و پیت د ژێک جودا بن، وەکی چێکرنا پەیڤا (حبذ) ژ پەیڤا (الجذب).
**الإستقطار:** دەرئێخستنا مەیێ ژ هندەک فێقی ب ڕێکا دلۆپکرنێ.
**الإشتکاء:** گازندەکرن.
**إشتلی:** قورتالکر.
**الإشتمال:** ڤەگرتن.
**الإشتهاء:** دلچوون؛ حەزا خوارنێ.
**الإشتهار:** بناڤودەنگبوون؛ ناڤداربوون.
**الإشتواء:** بژارتن.
**إشتوی:** هاتە بژارتن.
**أشتی:** ١- لێ بوو زڤستان. ٢- باران نەهاتن بوو هشکی ل زڤستانێ.
**الإشتیاق:** خەریببوون.
**أشجر:** دار لێ هاتن.
**الأشجع:** ١- دلێر.٢- شێر. ٣- حێشترا ل بەراهیا کاروانی یان حێشترا.
**الأشجع:** مارێ مەزن.
**أشجع:** مێرتر؛ بجورعەتتر.
**الإشخاص:** کەشکرنا گوللەیێ یان تیرێ ژ ئارمانجێ.

**أشخص:** تیرا وی یا گوللەیا وی کەشکر (مەبەست ئەوێ ل بەر ئارمانجێ یە).
**أشخم:** کەلا گری گرت.
**أشد:** توندتر؛ دژوارتر.
**الأشدق:** ١- یێ ڕەهوانبێژ. ٢- یێ ب دەڤ و ئەزمان.
**الأشدخ:** چال، بەلێ چالێ پنیا وی درێژ ژ ئنیێ هەتا هنداڤی دفنێ.
**الأشدف:** ١- ئەوێ رویێ وی خوار. ٢- مرۆڤێ چەپ.
**الأشدق:** مرۆڤێ ڕەهوانبێژ و بئەزمان.
**أشر:** ژپێخۆ دەرکەڤتی(بطران).
**الإشر:** ددانێت مشاری.
**الأشر:** ١- سترکێ ب پێت کولی ڤە. ٢- گرێکا سەرێ کوریا کولی.
**أشرار:** کۆما(شریر)ە کو دبیتە جەنگەنە.
**الإشارة:** چەپەرکێ کەشکی ل سەر رادئێخن.
**الإشراف:** سەرپەرشتکاری.
**أشراف:** کۆما(شریف)ە کو دبیتە ماقویل، بلند.
**الإشراق:** ١- هەلاتن. ٢- تیۆرەکا فەلسەفی یە ژ لایێ ئەفلاتۆنیا نوی(الأفلاطونیة الحدیثة) ڤە هاتبوو بەلاڤکرن دبێژیت: هەبوون ژ زاتێ خودێ دەردکەڤیت هەروکی ڕۆناهی ژ ڕۆژێ دەردکەڤیت. ٣- ل نک سۆفیا ئەو ڕۆناهی یە ژ نک خودێ حەق ڤە دهێت کو هەر ئشراقەکێ لڤینەک بۆ دڤێت و هەر لڤینەکێ ئشراقەکا ل دویڤ ب ڤی ڕەنگێ بەردەوامی دکەڤیتێ.
**الإشراقي:** ل نک سۆفیا ئەو مریدە یێ دڤێت جەوهەرێ خۆ تژی ڕۆناهیا خودێ خەق بکەت.
**الإشراقیون:** دویڤچوویێت وێ ڕێبازا فەلسەفی نە یا باوەریێ ب پەندا ئیشراق (حکمة الإشراق) یان پەندا ڕۆژهەلاتی (الحکمة المشرقیة) دئینت، ئارمانجا وان ژی ئەو بوو هەڤگونجینەکێ بێخنە د ناڤبەرا وێ فەلسەفا ژ لایێ (الأفلاطونیة الحدیثة)ڤە و فەیلەسووفێت فارسا ڤە بۆ وان هاتی.
**الإشراک:** چێکرنا شریکەکی بۆ خودێ.
**أشرب:** تێکهەلکر.
**أشرف:** ١- ماقویلتر. ٣- بلندتر.
**أشرف:** ١- نێزیکبوو. ٢- سەحکرێ؛ دیت.
**أشرق:** ١- زاد دگەورێ ڕا ئاسێ بوو. ٢- گەش و ڕۆهن بوو.
**أشرک:** کرە شریک.
**الأشرم:** ١- لێڤکەم. ٢- دفنبڕی.
**الإشع:** ڕها پشتا دەستی.
**الإشعار:** پێ راگەهاندن.
**أشعار:** کۆما(شعر)ە کو دبیتە هەلبەست.
**الإشعاع:** ١- تیشک هاڤێتن؛ ڕۆهنکرن. ٢- بەلاڤبوونا هزری و شارستانی.
**الإشعال:** هلکرن.
**أشعب:** ١- شاخ ژێک فرِ. ٢- شاخسکەستی. ٣- ملپەحن.
**أشعة:** تیژک.
**أشعث:** پرچڤژ.
**أشعر:** ١- گەلەکێ ب پویرت. ٢- شاعرتر.
**أشعن:** ڤژاڤژ(پرچ).
**أشعل(شعل):** ئاگر بەردایێ؛ هلکر.
**الأشعل:** هەسپێ تنێ کوریا سپی.
**الإشغال:** ١- تژیکرن. ٢- مژویلکرن.
**الأشغال:** شۆل و کار.
**أشغل:** دا شۆلی.
**إشفاء:** ساخکرن.
**إشفاق:** ١- دلۆڤانی. ٢- ترس. ٣- ل نک سۆفیا مەقامێ ئێکێ یێ ترسێ یە و بیتە ترسا د گەل خوازتنا دلۆڤانییێ.
**أشفق:** ژێ ترسا کو تشتەک لێ بهێت.
**أشفی:** نێزیک بوو.
**الإشقاق:** ژێ دەرئێخستن.
**أشقح:** شلخەدا(مێشا هنگڤینی).
**أشقر:** پرچزەر.
**أشقی:** ڕەشبەختتر.

**إشقيل:** گیایەکە د کارێ چێکرنا دەرمانا دا دهێتە ب کارئینان، دبێژنێ: (پیڤازا مشکا).

**الإشكال:** چێبوونا ئاریشێ.

**أشكل:** ١- ئالزی. ٢- نیشانێت پیتا ل سەر دانان. ٣- بالەتە کەتێ(فێقی).

**الأشكل:** ١- یێ سپیاتیا وی سەر ب سۆری ڤە یان سۆراتی ل ناڤ. ٢- یێ سۆراتی د چاڤێ وی دا. ٣- سۆر و سپی.

**أشل:** فالنجی.

**أشلى:** سەییێت خۆ کشکرنێ.

**أشم:** بلند.

**الإشمام:** ١- بێهنکرن. ٢- ل نک رێزمانڤانان دبیتە ئاماژەکرن بۆ پیتەکێ ب لێڤا بێی دەرئێخستنا دەنگێ وێ.

**الإشمئزاز:** دلڕۆشبوون.

**إشمأز:** دلێ وی ڕەشبوو.

**الإشمام:** پێکڤەنانا لێڤا بێی دەرئێخستنا دەنگی ل دەمێ خواندنا قورئانا پیرۆز ب تەجوید.

**أشمط:** بۆز؛ خودانێ پرچێ نیڤ ڕەش و نیڤ سپی.

**الأشنان:** کەرەستەیەکە دەستا پێ دشۆن، گەلەک جۆرن؛ یێ ژ هەمی جۆر نازکتر جۆرێ سپی یە و دێژنێ: (بخرء العصافير) و د دویڤ دا جۆرێ زەرە و دبێژنێ: (الغاسول) و هەردو ژی تافیرکەرن (یۆنانی) یە.

**الأشنة:** جۆرەکێ گیانە ژ نفشێ گیاییێت کولیلک ڤەشارتی، ل جهێت ب ڕیس شین دبت ل سەر دار و بەرا یان ژی د ئاڤا شرین دا یان ژی د ئاڤا دەریایا دا، کەرەستەیێ کرۆلۆفیل تێدا نینە ئانکو نە یێ کەسکە، کو جۆرەکێ کەڤزێ یە.

**أشهى:** ١- خۆشتر. ٢- ب تامتر.

**الإشهاد:** ئامادەکرن؛ بەرهەڤکرن؛ حازرکرن.

**الإشهار:** ١- دیارکرن؛ ئاشکراکرن. ٢- ب ناڤودەنگکرن.

**الأشهب:** ١- بەلەک. ٢- ڕەنگێ ڕەشێ کو سپی ل سەر زال. ٣- سپییێ ب ڕەنگێ ڕەش تێکهەلبووی ئانکو خولیکی. ٤- بۆز وەکی هەسپێ بۆز. ٥- کارێ سەخت. ٦- شێر. ٧- سالا هشک و بێ باران. ٨- ڕۆژا ب هوڕ و سڕ و سقەم. ٩- خودان هێز و شیان.

**أشهد:** ئەز سویند دخۆم.

**الأشهر الحرم:** ئەو چار هەیڤن یێت خودێ شەڕ و کوشتن تێدا حەرامکرین کو دبنە ئەڤە: (ذو القعدة، ذو الحجة، المحرم، رجب)، عەرەبا ژی شەڕ و کوشتن تێدا حەرام کربوون تنێ ئێلا (بنو خثعم) و ئێلا (طيء) نەبن، وانا حەلال دکرن.

**الأشهل:** ١- زەلامێ چاڤ شین. ٢- ناڤێ بوتەکی بوو عەرەبان ل سەردەمێ جاهلیەتێ دپەرست.

**آشوب:** مرۆڤێت ژ هەمی جوینا.

**أشوب:** زەلامێ موییێت قژاڤژ و تاری.

**أشوق:** ١- خەریبتر. ٢- دویر.

**الأشيب:** ١- سەرسپی؛ ئەوێ سەرێ وی سپی. کال؛ موی سپی. ٢- پیر.

**الأشيم:** مرۆڤێ ب خال.

**أص:** ١- شکاند. ٢- حولیکر.

**أصاب:** ڤێکەڤت؛ ئارمانج گەست.

**الإصابة:** ١- هنگاڤتن. ٢- تۆشبوون.

**أصابع:** کۆما(إصبع)ە کو دبیتە تبل.

**أصابع الراعي:** گیاییێ نانێ چویچێ.

**أصاخ:** گوهداری کر؛ گوهێ خۆ داییێ.

**الأصالة:** ڕەسەنی.

**الإصباح:** ١- سپێدە. ٢- سپێدەگەهاندن.

**الأصبح:** ١- شێر. ٢- پرچا داڤێت سپی و سۆر تێ هەلبووین. ٣- گایێ چال؛ ئەنیا وی پنیەکا سپییا ب سەر سۆری ڤە لێ.
**أصبح:** ١- لێ بوو سپێدە. ٢- بوو.
**أصبر:** کوشت.
**الإصبع:** تل؛ تبل.
**الأصبغ:** ١- کوریسپی. ٢- گوهسپی. ٣- پەرچەمسپی.
**أصبغ:** بەرفرەهکر.
**أصبى:** دل لێ نەما.
**أصبوع:** تل؛ تبل.
**أصح:** دورستتر.
**أصحاب:** کۆما (صاحب)ە ئانکو هەڤال.
**أصحاب الفرائض:** ئەو میراتگرن یێت کو بەهر و پشکێت ڤەبری د میراتی دا هەین.
**الإصحاب:** د گەلخۆبرن.
**الأصحاب الراي:** خودانێت بۆچوونێ دەربارەی شەریعەتی کو دبنە دویڤچوویێت (أبو حنيفة النعمان بن المنذر).
**أصحاب السعير:** خەلکێ جەهنەمێ.
**أصحاب الشمال:** خەلکێ رۆژا قیامەتێ کاغەزا خێر و گونەها دهێتە دەستێ وان یێ چەپێ.
**أصحاب الكهف:** ئەو چاکن یێت (٣٠٠) سالا د شکەفتێ ڤە ماینە د خەو.
**أصحاب المشأمة:** خودانیت کورییێ ل رۆژا قیامەتێ کو دبنە (أصحاب الشمال).
**أصحاب الميمنة:** خەلکێ ل رۆژا قیامەتێ کاغەزا خێر و گونەها دهێتە دەستێ وان یێ راستێ.
**أصحر:** ١- دەرکەڤتە بیابانێ. ٢- بەرفرەهبوو.
**الإصدار:** دەرکرن؛ هنارتن بۆ دەرڤە.
**الأصداف:** ١- پێلێت دەریایێ. ٢- کۆما (صدفة) یە کو دبیتە قەلپکێ شەیتانۆکی.
**أصدر:** دەرئێخست، هنارتە دەرڤە.
**الأصدران:** دو رهێت خوینێ نە دکەڤنە بن جهنیکێت مرۆڤی.
**الأصدغان:** دو رهێت خوینێ نە دکەڤنە بن جهنیکا مرۆڤی.
**أصدق:** ١- راستگۆ. ٢- راستگۆتر.
**الأصدم:** ئەوە یێ تنی هەردو لایێت جهنیکا وی حەوێسبوون.
**أصدى:** ١- تێهنیکر. ٢- دەنگڤەدا.
**أصر:** ١- ل سەر هەلویستێ خۆ ما و دانەگێرا. ٢- رک ل سەر گرت.
**الإصر:** ١- سەنگ. ٢- بارێ گران. ٣- گونەه.
**الإصرار:** رشدبوون؛ رک ل سەرگرتن.
**الإصراف:** مەزاختن.
**الآصرة:** پەیوەندی.
**أصرم:** دەمێ چنینێ وی هات.
**الأصرم:** ١- گوهکەم. ٢- بەلنگاز.
**الأصرمان:** ١- شەڤ و رۆژ. ٢- گورگ. ٣- قەل.
**أصص:** شداند و باش گرێدا.
**إصطاد:** ١- ب حیله گرت. ٢- نێچیرکر.
**إصطاف:** هاڤین بۆراند.
**إصطام:** پیڤا خۆ هاڤێت(بالندە).
**الإصطباح:** ڤەخوارنا مەیێ ل دەمێ سحارێ.
**إصطبح:** ١- ل دەمێ سپێدێ مەی ڤەخوار. ٢- هەلکر.
**الإصبع(الأصبوع):** تبل.
**الأصبغ:** ١- کوریسپی. ٢- مەزنترین هلمشت.
**إصطبغ به:** پێ هاتە رەنگکرن.
**الإسطبل:** گۆڤا دەوارا.
**الإصطحاب:** دگەلخۆبرن؛ هەڤالکرن.
**الإصطدام:** ڤێککەڤتن.
**إصطدم:** ڤێ کەڤت.
**أصطرك:** جۆرێ دارەکێ یە ب ناڤێ: (اللبن) دهێتە نیاسین، دارەکا جوانە بەژنا وێ ژ (٣-٦) مێترایە، بەلگێت وێ ل بنی د سپینە و کولیلکێت وێ ژی د سپی نە وەکی یێت پرتەقالێ نە، ل کنارێت دەریا سپی یا مشە، وەک دەرمان ژی دهێتە ب کارئینان.
**إصطف:** بوونە رێز.

**الإصطفاء:** ١- هلبژارتن. ٢- ل نک سۆفیا دبیته: أ- هلبژارتنا پێغەمبەرا ژ لایێ خودێ ڤە. ب- ڤالاکرنا دلێ مریدی ژ لایێ خودێ ڤە بۆ علمێ نیاسینا ذاتێ خۆ.
**الإصطفاف:** ١- ریزبوون. ٢- خۆریزکرن.
**إصطفاه:** هلبژارت.
**الإصطكاك:** ڤێککەفتنا دو تشتا.
**الإصطلاح:** ئەو ڕێکەفتنە یاکو کۆمەک یان جوینەک دگەهیتێ ل دۆر پەیڤەکێ یان دانانا تشتەکی.
**الإصطلام:** ١- بنبڕکرن؛ قوتبڕکرن. ٢- ل نک سۆفیا دبیته: سالوخەتێ وێ خەریبیێ یە یا د دلی دا پەیدا دبیت و دل ل بن دەستهەلاتا وێ ئارام دبیت.
**إصطلح:** چێبوو.
**إصطلحا:** پێکهاتن؛ ژێک ئاشبوون.
**الإصطناع:** ١- چێکرن. ٢- ل نک سۆفیا ئەوە کو خودێ حەق سالوخەتێت نەفسا عەبدێ ژناڤببەت کو تنێ پێغەمبەر و وەلیا ڤەدگریت.
**إصطناع:** چێکرن.
**الإصطناعي:** دەستکرد؛ چێکری.
**إصطنع:** چێکر.
**الإصطوانة:** ١- ستوین. ٢- قەوانە.
**الإصطیاد:** نێچیرکرن.
**الإصطیاف:** هاڤینبۆراندن ل هاڤینگەهێ.
**إصعاب:** بزەحمەتئێخستن.
**الإصعاد:** ب سەرئێخستن.
**أصعب:** سەختتر؛ بزەحمەتتر.
**أصعد:** ١- چوو و بەردەوامبوو. ٢- چوو خوارێ ئەگەر ژۆردانی بت.
**الإصغاء:** گوهدان، بهیستن.
**أصغر:** بچوکتر.
**الأصغر:** یێ بچویکتر.

**الأصغران:** دل و ئەزمان.
**أصغى:** گوهێ خۆ دا.
**الأصف:** تراشۆکەکا ب ستری یە، کولیلکێت وێ د جوان سپی نە، کولیلک و بەرێ وێ ترشدکەن و وەک دەرمانکێ زادی ب کار دئینن، ل دۆرێ دەریا سپی شین دبت، دیسا دبێژنێ: (الكبر).
**إصفاء:** ١- ژێکرتن. ٢- خلاسکرن ژ تشتی.
**إصفاد:** بەندکرن.
**أصفح:** لێبۆرکار.
**إصفر:** ١- زەربوو. ٢- ڤالابوو. ٣- فەقیربوو.
**الأصفر:** زەر.
**الإصفرار:** زەربوون.
**الأصفران:** زێر و زەعفەران و دبێژن وەرس و زەعفەران.
**أصفى:** ١- گەهەشتە بەری(ڤەکۆلان). ٢- ژ هێکا وەستیا(مریشک). ٣- هشکبوو ژ ڤەهاندناهەلبەستا(هەلبەستڤان). ٤- دەستڤالا بوو(زەنگین).
**الأصل:** ١- بنیات. ٢- ڕەھ. ٣- ل نک سۆفیا ئەو تشتە یێ زێدەهی بکەڤیتێ.
**الإصلاح:** چاککاری؛ نەهێلانا گەندەلیا.
**أصلب:** ڕقتر.
**الأصلة:** جۆرەکێ مارێت بێ ژەهرە، درێژاهیا وی د ناڤبەرا (٧-١٠) مێترایە، نێچیرا خۆ ب گڤاشتنێ دکوژیت پاشی دادعوبریت.
**أصلح:** باشتکر؛ چێکر.
**الأصلح:** یێ باشتر.
**الأصلخ:** یێ کەڕ.
**الأصلع:** حەوێس.
**أصلم:** ١- کوهبچویک. ٢- گوهبری.
**أصلى:** گرمکر؛ شاراند.
**أصم:** ١- کەڕ. ٢- ڕەقێ مسمت.

**إصمام:** گەربوون.
**أصمت:** هشبه؛ بێ دەنگ ببه.
**الأصمع:** ١- گوهبچویک. ٢- پەری نەرم. ٣- بشکۆژ. ٤- شیرێ برەک. ٥- دلێ ژیر. ٦- یێ گەهەژتی یە بلندترین پلە. ٧- گیایێ بەرێ وی دەرکەڤتی و نەپەقی.
**الأصمعان:** دلێ ژیره و رایا ب دورستی.
**الأصموخ:** ژناڤدایا گوهی.
**أصمی:** هنگاڤت و د جهـ دا گوشت.
**الأصنف:** نەعاما پێت وێ تیڤل ژێ رادبن.
**إصهار:** ١- حەلاندن. ٢- خزمانیکرن.
**الأصهب:** ١- ئەوێ سپیاتیا وی سۆر تێهەلبووی. ٢- سۆر.
**أصوب:** دورستتر.
**أصول الفقه:** ئەو بنگەهێت زانین و زانستی نە بێت کو پێ دگەهنە علمێ فوقهێ.
**أصولي:** ل دویڤ بنیاتێ سنج و عەدەتا.
**أصيد:** ١- ستۆخوار. ٢- مرۆڤێ ژ مەزناهی سەرێ خۆ بلند دکەت. ٣- دفنبلند. ٤- شاهێ ب مەزناهی. ٥- شێر.
**الأصيص:** ١- قافکێ گولا. ٢- ئامانێ شکەستی. ٣- سەرەحیا میزا بژەیکا.
**الأصيصة:** مالێت ژیک نێزیک.
**أصيل:** ١- ئیڤار. ٢- رەسەن؛ خودان ئەصل و بنیات. ٣- ماقویل.
**إض:** بنیات.
**آض:** ١- هاتە گوهۆرین. ٢- بەرێ خۆ دایێ. ٣- زڤری.
**أضاء:** ١- هلکر. ٢- رۆناهی دا.
**أضاء:** رۆهنکر.
**الإضاءة:** رۆهنکرن.
**الأضاة:** گەرا ئاڤێ.
**الإضاض:** جهێ مرۆڤ قەست بکەتێ.
**أضاع:** بەرزەکر.
**الإضاعة:** بەرزەکرن.
**أضاف:** ١- مێهڤانکر. ٢- لێ زێدەکر. ٣- کره سەر تشتەکێ دی. ٤- کەشکر (گەر گوللە بت). ٥- بۆ لایەکی چوو. ٦- ئاڤابوو (گەر رۆژ بت).
**الإضافي:** یێ ل سەر تشتی زێدەکری.
**الإضافة:** ١- زێدەکرن ل سەر تشتی. ٢- د (منطق)ێ دا دبیتە: گۆتنا (ئەرستوی) یا چاری کو دبیتە: ریژەیەکە د ناڤبەر دو تشتا دا کو نەیا بەرئاقل بیت ئێک ژ وان بێی هەبوونا یێ دی هەبیت وەکی کوری و بابێ ئانکو بابینیێ و کورینییێ.
**الإضافية:** یا زەکری ل سەر تشتی.
**أضاق:** بەرتەنگ کر.
**إضاقة:** تەنگکرن.
**إضبارة:** ١- دۆسیێ؛ بادەک. ٢- گورزێ تیرا یان یێ پەر و نڤیسارا.
**الإضجاع:** رازاندن.
**الإضحاك:** کەناندن.
**الأضحوكة:** یێ خەلک پێ دکەنن.
**الأضحى(عيد):** ناڤێ جەژنا قوربانێ یە.
**أضحى:** ١- چوو بەر تاڤێ. ٢- لێ بوو دەمێ رۆژهەلاتێ. ٣- تاڤێ لێدا. ٤- ما ل سەر کارێ خۆ.
**الأضحية(بضم الألف):** سەربڕ؛ قوربان.
**أضخم:** مەزنتر، بکەلەختر.
**الأضداد:** ١- کۆما(ضد)ە کو دبیتە هەڤدەژ. ٢- ئەو پەیڤن بێت کو دو رامانیت هەڤدژ ددەن وەکی پەیڤا(ضد) کو بیتە هەڤکویف و هەڤدژ.
**أضر:** بزیانتر.
**أضر(بتشديد الراء):** ١- هەویەک ب سەر هەوییێ ئینا. ٢- زیانکر؛ زیان گەهاند.

**الإضـراب:** ١- نـەخوارنا زادی یـە ژ لایـێ کەسەکی یان ژمارەیەکا کەسان ڤە دهێتەکرن ژ بـۆ نـەچارکرنا لایـێ دەسـتهەلاتدار دا هنـدەک مـەرجا بجهـ بینـت. ٢- نـەکارکرنا تـەڤایی یـە ژ لایـێ کۆمـەکا کەسـان ڤـە دهێتـەکـرن ژ بـۆ نـەچارکرنا لایـێ دەستهەلاتدار یان خودانێ کاری دا هندەک مەرجێت وان بجهـ بینت.

**إضرار:** زیانکرن؛ زیانگەهاندن.

**الإضرام:** ئاگرهەلکرن.

**الأضراس:** کۆما (ضرس)ە کو دبیتە ددان.

**أضرب:** رویێ خۆ وەرگێرا و پشتا خۆ دا.

**أضرم:** ئاگر بەردایێ.

**الإضریج:** ئارمیشێ سۆر و زەر.

**الإضطباع:** گرێدانا میزەرا ئیحرامێ ل تـەوافا بەرێ رەش کو مێزەری ب سەر ملێ چەپێ دادەن و هـەردو لفکێـت وێ ل سـەر ملـێ راستێ گـرێ بـدەن ئـانکـو ملێ راستی بمینیتە رویس.

**الإضطجاع:** رازان.

**إضطجع:** رازا.

**إضطر:** نەچاربوو.

**الإضطرار:** نەچاربوون.

**الإضطراب:** ١- لڤین. ٢- لێکدان؛ لێککەڤتن. ٣- تێکچوون؛ نەمانا سیستەمی.

**الإضطرار:** نەچارکرن.

**الإضطرام:** هلبونا ئاگری؛ هلبوون.

**إضطرم:** ئاگر بەربوویێ.

**إضطغن:** کین کرە دلێ خۆ.

**الإضطلاع:** بهێزکەڤتن.

**إضطلع:** ب هێز کەڤت.

**أضطن:** قەلسیکر.

**الإضطهاد:** تەپەسەری.

**إضطهد:** شکاند و تەپەسەرکر.

**أضعاف:** کۆما (ضعف)ە کو دبیتە دوجارکی.

**الإضعاف:** لاوازکرن.

**أضعف:** لاوازتر.

**أضغاث أحلام:** خەونێت تێکهەل و ئالۆز یێت نەئێنە شرۆڤەکرن.

**أضغاث:** کۆما (ضغث)ە کـو دبیتـە ئـەو گـورزێ گیای یێ تەڕ و هشک تێدا.

**أضغان:** کۆما (ضغن) ئانکو کین.

**الأضفر:** نەینۆک.

**أضل:** پتـر ژ سـەر رێ دبەت و بەرزەدکەت.

**الإضلال:** دسەردابرن و بەرزەکرن.

**أضلع:** بهێز.

**الإضـمار:** ١- ڤەشـارتن. ٢- داچوونـا تشـتی. ٣- ڕاکرن و نەهێلانا تشتەکێ بێ مفا.

**الإضمامة:** ١- کۆمـەک ژ تشـتی. ٢- کۆمـەکا مرۆڤا. ٣- بادەک؛ دوسێ.

**إضمحل:** چوو و نەما.

**الإضمحلال:** ژناڤچوون؛ نەمان.

**أضمر:** ڤەشارت.

**أضنی:** ١- نەخۆشبوو. ٢- نەخۆشکر.

**الأضیاح:** ب خۆڤەرێتنا ژ ترسادا.

**أضیق:** تەنگتر.

**الأضیق:** یێ تەنگتر.

**أط:** ١- دەنگکر. ٢- نەرمبوو.

**أطـاح بـە:** ١- کوشت و بەرزەکر. ٢- نەهێلا. ٣- ئێخست.

**أطاح:** ١- رۆخاند. ٢- ئێخست.

**الإطار:** چوارچووڤە.

**الإطاعـة:** ١- گوهـداری. ٢- بجهئینانـا فەرمانا. ٣- پەرستن.

**أطاف:** ل دۆر زڤری؛ طەوافکر.

**أطاق:** شیایێ.

**الإطاقة:** شیان و پێچێبوون.

**أطال:** درێژکر.

**الإطالة:** درێژکرن.

**أطالت:** کورەک بوو.

**الأطايب:** کۆما (طيب)ە کو دبيتە خۆش، يان تشتێ خۆش و حەلال.
**الإطباق:** ١- پێکڤەنان. ٢- ب سەرداهاتن.
**الأطباق:** ١- کۆما (طبق)ە کو دبيتە نهومی يان تەخە. ٢- تەخە تەخە.
**أطبق:** ب سەر دادا.
**أطحل:** خوليکی.
**أطر:** ١- رەخەک گرت و خوارکر. ٢- کورتکر.
**الإطراء:** مەدحەکرن؛ پەسنکرن.
**الإطراب:** دلخرابکرن ب ئاوازا.
**الإطراح:** ١- هاڤێتن. ٢- درێژکرن.
**إطراد:** ١- دەرئێخستن. ٢- ئەوە کو تو ناڤێت وی کەسی بينی يێ تو مەدحێت وی دکەی، و ناڤێت باب و باپيرێت وی ل دويڤ ديرۆکا بوونێ بينی.
**الإطراد(بالكسر والتشديد):** ١- بەردەوامی پێدان. ٢- د (علم البديع) دا دبيتە ئينانا ناڤ و ناسناڤێت کەسێ پەسنا وی دهێتە کرن ل دويڤێک و بێی ناڤگين.
**الأطراف:** کۆما (طرف)ە کو دبيتە رەخ، لا، دەست وپێ.
**الإطرافية:** خەوارجێت (العجاردة)نە، دوڤچوويێت (غالب)ی نە، دبێژن: چو ل سەر خەلکێ دەوروبەرێت موسلمانا نينە ئەگەر ئەو چو ژ فوقهێ نەزانن، و دەربارەی ئوصوليێت دينی وەکی سنييانە ل سەر باوەريا وانن.
**إطرد( بتشديد الطاء):** دا دوڤێک.
**الأطرش:** يێ کەڕ.
**الأطرط:** زەلامێ مژويلانک کێم.
**أطرف:** چاڤێت خۆ دانانە سەرێک.
**أطرق:** ١- بێ دەنگ بوو و نەئاخڤت. ٢- سەرێ خۆ و چەماند و هزرا خۆ کر. ٣- ب پيا کەتە رێکێ.

**الأطروحة:** ١- بابەتەکە ژ بۆ ڤەکۆلينێ دهێتە دەستنيشانکرن. ٢- ڤەکۆلينەکا ئەدەبی يە يان يا زانستی يە دهێتە ئامادەکرن ژ بۆ وەرگرتنا باوەرنامەيەکا ئەکاديمی.
**الأطروش:** يێ خۆ ل تشتی گەردگەت و گوهنەدەتێ.
**الإطرية:** شەعری يا دکەنە گرارا يان دکەلينن و دخۆن.
**الإطعام:** ١- خوارندان. ٢- مێهڤانکرن.
**أطعم:** ١- ب تام ئێخست. ٢- پەترۆمەکر.
**الإطغاء:** دەرباسبوون ژ سنووری.
**أطفأ:** ڤەمراند.
**الإطفاء:** ڤەمراندن.
**الإطفائية:** دەستەکەکا سەربازايە کارێ وێ ڤەمراندنا ئاگرايە.
**أطفل:** نێزيکی ئاڤابوونێ بوو.
**أطل:** ناڤتەنگ.
**أطل(بتشديد اللام):** نێزيکبوو. ٢- هاتە هنداڤێ.
**أطل:** ١- هەلات. ٢- هاتە هنداڤ. ٣- دياربوو.
**الإطلاع:** ١- نيشادان. ٢- زانين.
**الإطلال:** راوەستان ل هنداڤی تشتەکێ نزم ژ جهەکێ بلند.
**الإطلاق:** ١- هنارتن. ٢- بەردان. ٣- هاڤێتن.
**أطلال:** کۆما (طلل)ە ئانکو شوينوار.
**أطلس:** ١- نەخشە. ٢- فەلەکا بێ ستێر و ئەختەر. ٣- گورگ. ئەو مرۆڤێ ئەفسانەی يە يێ کو ل دوڤ کەڤنەباوەرێت يۆنانی دنيا ل سەر پشتێ. ٤- جۆرەکێ پەرۆکێ حولی يە. ٥- جلکێ ئارميشی. ٦- فەرهەنگا وێنەدار.
**إطلع:** ١- پێ زانی. ٢- سەحکرێ.
**أطلع:** ١- دەرکەت. ٢- هەلات. ٣- ب سەرهلبوو.
**أطلق:** ١- بەردا. ٢- ژنکا خۆ بەردا. ٣- ئازادکر.
**إطم:** ١- کەلات. ٢- ئاڤاهيێ بلند.

**أطم:** ١- لەقەک لێدا. ٢- هاڤێت. ٣- پەردە بەردان. ٤- دەمێ برینا وی یان قوساندنا وی هات(موی).
**إطماع:** تەماعکرن.
**إطمئنان:** پشتراستی.
**إطمأن:** ١- نزمبوو. ٢- پشتراستبوو و تەنابوو.
**الإطناب:** ١- زێدەکرنا پەیڤا د ئاخڤتنێ دا هەتا کو ژ رامانێ مەزنتر لێ دهێت پێخەمەت بهێزکرنا رامانێ؛ یان ژی کرنا پەیڤێت زێدە دەربارەی رامانەکا کێم. ٢- درێژکرن.
**أطناب:** کۆما(طنب)ە کو دبیتە کنف.
**إطواء:** وەرپێچان.
**أطور:** پێشکەڤتیتر.
**أطول:** درێژتر.
**الأطوم:** گولکێ دەریایێ.
**أطيب:** خۆشتر؛ بتامتر.
**أطيمة:** کوچکێ ئاگری.
**أظأر:** ١- لێ زڤری. ٢- بچویکێ ئێکەدی خۆ ب خودانکر.
**أظفار الذئب:** ناڤێ چەند ستێرێت بچویکن ل عەسمانی.
**أظفر:** نەینووکدرێژ.
**أظل:** ١- سیبەرکر. ٢- سیبەرا خۆ لێکر. ٣- ب سەرداهات.
**الأظل:** بنێ کابی یان سمی.
**الإظلال:** سیبەرکرن.
**إظلام:** تاریکرن.
**أظلم:** ١- تاریبوو. ٢- زۆرداریکر.
**الأظلم:** یێ تاریتر.
**الأظلوفة:** گژەبەر؛ عەردێ بەرێت تیژ لێ.
**أظما:** تێهنیبوو.
**الأظمى:** ئەسمەر.

**أظن(بتشديد النون):** گونەهبارکر.
**الأظن:** یێ ژهەژیتر کۆ گومان بچیتە نک.
**الإظهار:** ١- دیارکرن. ٢- سەرئێخستن.
**أظهر:** ١- دیارکر. ٢- ل نیڤرۆ دا رێ.
**أط:** دەنگ کر یان دەنگ ژێ هات.
**أعاد:** ١- دوبارەکر.٢- زڤراند.
**الإعادة:** ١- دوبارەکرن. ٢- زڤراندن.
**الإعاذة:** پارزتنا ب خودێ ژ تشتەکی.
**أعار:** داڤێ ب ئێمانەت.
**الإعارة:** دانەڤێ ب ئێمانەت.
**الإعاشة:** ١- بخودانکرن. ٢- ڤەژینکرن. ٣- پیشکیشکرنا قویتی بوو مللەتی. ٤- باهرا کەسی یان یا خیزانێ ژ قویتی.
**أعاشه:** ڤەژیاند ئانکو ئەگەرێت ژیانێ بۆ پەیداکرن.
**أعاض:** خەرامەت دا.
**الإعاضة:** شوینزیان؛ خرامەت.
**أعاف:** هێلا.
**أعال:** ١- عەیالێ وی بوونە گەلەک. ٢- فەقیربوو.
**الإعالة:** بخودانکرن.
**أعام:** هێلا بێ شیر.
**أعان:** هاریکر.
**الإعانة:** هاریکرن.
**الأعب:** یێ دفن ستویر.
**إعباد:** بەندەکرن.
**الأعبل:** ١- چیایێ بەرێت وی سپی. ٢- یا بەلگ وەریای(دار).
**إعتاد:** هیبوو؛ فێربوو.
**إعتاص:** ب زەحمەت کەت.
**إعتاض:** داخوازا خەرامەتێ کر.
**إعتاط:** ستەوربوو؛ ئاڤس نەبوو.
**إعتاف:** دلێ خۆ ژێ رەشکر و هێلا.
**الإعتاق:** ئازاکرن.
**أعتب:** گازندا وی نەهێلا و رازیکر.

**الإعتبار:** ١- گرنگی پێ دان. ٢- عبرەت وەرگرتن. ٣- هزرژێکرن. ٤- بها. ٥- گرنگی.

**الإعتباطي:** تشتێ بێ ئەگەر رویدای.

**الإعتجار:** ١- دەرسۆک د سەری ئالاندن. ٢- قەمت گرێدان.

**أعتد(عتد):** بۆ رۆژەکا دی ئامادەکر.

**إعتد:** گەلەک بۆ خۆ دانا.

**الإعتداء:** ١- تەعدائی لێکرن. ٢- قوتان. ٣- زێدەگاڤی لێکرن.

**الإعتداد:** ١- گرنگیپێدان. ٢- چاڤدێرکرن.

**الإعتدال الخريفي:** هندی ئێک لیهاتنا دەمێت شەڤ و رۆژا ل حەولێ پائیزێ.

**الإعتدال الربيعي:** هندی ئێک لێهاتنا دەمێت شەڤ و رۆژا ل حەولێ بهارێ.

**الإعتدال:** ١- ناڤنجیبوون. ٢- وەکئێکلێهاتن. ٣- راستبوون.

**إعتدى:** زۆرداری کر؛ زێدەگاڤی ل حەقی کر.

**الإعتذار:** ١- هێجەتگرتن. ٢- داخوازکرنا لێبۆرینێ.

**إعتذب:** دو سەرێت دەرسۆکێ ژ پشتێ ڤە ژ کولاڤدەرسۆکا بەردان.

**إعتذر:** داخوازا لێبۆرینێ کر.

**إعتذق:** دو لفک ژ پشتێ ڤە ژ کولازدەرسۆکا بەردان.

**إعتذل:** ١- گازندە ژ خۆ کر. ٢- گازندە قەبیل کرن.

**إعتر:** ژ بەر هاریکاری و ڤەنجیێ هات بەلێ داخوازنەکر.

**الإعتراض:** ١- دیارکرنا نەرازیبوونێ. ٢- ئەوە کو تو رستەیەکێ یان پەیڤەکێ بکەیە دناڤ ئاخڤتنا خۆ دا بێی کو گوهۆرینەکێ بێخیتێ.

**الإعتراف:** ١- دانپێدان. ٢- دەرەهیکرنا کریارێ.

**إعتراه:** ب سەری هات.

**إعترض:** ١- خۆ نەرازیکر. ٢- کەتە درێ دا.

**إعترى:** لێهات.

**إعتز:** ١- شانازی بر. ٢- پێ ب هێزکەڤت.

**الإعتزاء:** ١- دوریشمێ ل دەمێ شەرێ. ٢- گۆتنا کەسەک کو بێژن: من ئەڤ کارێ هە کر.

**الإعتزاز:** شانازیپێبرن.

**الإعتزال:** ١- خۆڤەدەرکرن. ٢- هێلانا کار و پیشەیەکی.

**الإعتزام:** ئنیەتکرن ژ بۆ کرنا کارەکی.

**إعتزل:** خۆ ژێ ڤەدەرکر.

**إعتزم:** کرە دلێ خۆ کو بکەت.

**إعتزى:** گەهەشتە بابێ خۆ ژ لایێ دۆلێ ڤە.

**إعتس(بتشديد السين):** ١- گونەهبار دەرەهیکرن ب شەڤ. ٢- ب شەڤێ ل گونەهباری گەریا.

**الإعتساف:** ١- ژ رێدەرئێخستن و زەحمەتلێدان. ٢- بکارئینانا کوتەکیێ.

**إعتشى:** ل عەیشا دا.

**الإعتصاب:** ١- بوونە ئێک هەلویست د کارێ هێلانا کاری یان نەکارکرنێ یان نەخوارنێ. ٢- سەرگرێدان ب پاتەیەکی یان دەرسوکەکێ.

**الإعتصام:** ١- پەنابرن بۆ تشتەکی ژ بۆ مەرەمەکێ. ٢- خۆ پێ پارازتن.

**إعتصر:** ١- ژ دەست دەرکەڤت. ٢- گڤاشت.

**إعتصم به:** ١- دەستێ وی گرت. ٢- پەنا برە بەر دلۆڤانیا وی. ٣- خۆ پێ پارازت.

**إعتصى:** چویڤەک دا بەر خۆ.

**الإعتضاد:** ١- خۆ بهێزکرن. ٢- خۆ ب ئێک بهێزکرن.

**إعتضد:** ١- داخوازا هاریکارێ ژێ کر. ٢- همبێزکر. ٣- بۆ خۆ کرە هێز.

**إعتطب:** مر.

**إعتف(بتشديد الفاء):** هێلا و نێزیک نەبوو.

**إعتفا:** داخوازا قەنجییێ کر.

**إعتفد:** دەرگەهێ خۆ ل خۆ گرت داکو ژ برسا بمرت نەکو خۆ هەوجەی ئێکی بکەت.

**إعتفر:** ١- ئاخ ما پێڤە. ٢- تێڤەدا.

**أعتق:** ئازاکر.

**الإعتقاد:** ١- باوەری. ٢- باوەپێکرن.

**الإعتقال:** گرتن؛ دەستەسەرکرن.

**إعتقب:** ١- ل دویڤ هات. ٢- هێلا ل نک خۆ هەتا حەقێ وی وەربگرت.

**إعتقد:** ١- باوەرکر. ٢- بوو دندک.

**أعتقل(بضم الألف):** ١- هاتە گرتن. ٢- ئەگەر مەبەست ژ گرتنێ ئەزمان بیت دێ بیتە لالی.

**إعتقل:** ١- گرێدا. ٢- زیندانکر. ٣- گرت؛ دەستەسەرکر.

**الإعتكاف:** ١- خۆ ڤەدەرکرن ژ بۆ کارەکی. ٢- مانا د مزگەفتێ ڤە ژ بۆ عبادەتی ل دەمەکێ دەشتنیشانکری.

**إعتكر:** ١- تاریبوو(شەڤ). ٢- دژواربوو (باران). ٣- تۆز دگەل خۆ ئینا(هوری). ٤- هێرشکر.

**إعتكف:** خۆ زیندانکر ژ بۆ عبادەتی.

**إعتكم:** کۆمکر و گرێدا.

**إعتل:** ١- نساخبوو. ٢- یا نەرمبوو. ٣- پیتێت لڤۆک(العلة) تێدابوو.

**الإعتلاء:** ١- بلندبوون. ٢- ب سەرکەڤتن.

**الإعتلاف:** خوارنا ئالیکێ؛ ئالیکخوارن.

**الإعتلال:** نەخۆشبوون.

**الإعتلام:** پێئاگەهبوون.

**إعتلج:** ١- پێکوەرهاتن و دانانە ئێکدو. ٢- شلقین و لێکدان (پێل). ٣- گیایێ وی درێژبوو. ٤- گیایێ وی شینبوو.

**إعتلج القوم:** ١- لێککەڤتن؛ دانانەئێک. ٢- ڤێککەڤتن. ٣- لێکدان.

**إعتلق:** حەژێکر.

**إعتلم:** ل چیای برسقی(برویسی).

**إعتلن:** ئاشکرابوو.

**إعتلى:** ١- خۆ بلندکر. ٢- ب سەرکەڤت.

**إعتم:** کولاڤدەرسۆک کرنە سەرێ خۆ.

**إعتماد:** پشتپێراستکرن.

**إعتمد:** ١- پالڤەدایێ. ٢- پشتا خۆ پێ راستکر.

**إعتمر:** ١- عەمرەیەک کر. ٢- کولاڤدەرسۆک گرێدان.

**إعتن:** کەتە بەرسینگی.

**الإعتناء:** چاڤدێریکرن.

**الإعتناق:** ١- دەستستۆوەراندن. ٢- باوەرپێئینان و پێ کرن.

**إعتنش:** دەستێ خۆ د شەری دا د ستۆیێ وی وەراند.

**إعتنف:** ب توندی بر.

**إعتنك:** ب عەردی کەت و نەشیا رابیت.

**إعتوروا الشئ:** ١- لێ خربوون. ٢- ل دۆر زڤرین. ٣- پێکڤە دەسهاڤێتنێ.

**الإعتياد:** هیبوون.

**إعتيادي:** ئاسایی؛ عەدەدکی.

**إعتياظ:** بەدەلوەرگرتن.

**الأعثى:** ١- رەنگێ ب رەشی ڤە. ٢- یێ گەلەک ب پویت. ٣- یێ کەر.

**أعثر:** دیت؛ ب سەر هلبوو.

**الإعجاب:** ١- حێبەتبوون. ٢- حەژێکرن.

**الإعجاز:** بێچارەکرن؛ بێ شیانکرن.

**الأعجاز:** کۆما (عجز)ە کو دبیتە قورم یان کماخ.

**أعجب:** عەجێبتر.

**الأعجر:** ١- پشتقۆف. ٢- زکمەزن. ٣- دارێ ب گرێ. ٤- فێقییێ نەگەهشتی. ٤- کماخمەزن. ٥- یێ تژی.

**أعجف:** یێ لاواز و لەغەر.

**أعجل:** ب لەزتر.

**أعجل:** د بەری راکر.

**الأعجم:** ١- هەرتشتێ بێ زار و ئەزمان. ٢- یێ کەس د ئاخفتنا وی نەگەهت. ٣- یی نەشێت ب ڕەوانی ب زمانەکی باخڤت. ٤- یێ لال. ٥- یێ نەعەرەب. ٦- یێ نەشێت کەسێ بەرانبەری خۆ تێبگەهینت.
**أعجمي:** کەسی نە ژ عەرەبا.
**أعجن:** مەزنبوو و پیربوو.
**الأعجوبة:** تشتێ مرۆڤ ژێ حێبەتی دبت.
**إعداد:** ئامادەکرن.
**الإعدام:** ١- نەهێلان؛ ژناڤبرن. ٢- سزایێ کوشتنێ.
**أعدم:** ١- نەهێلا، ژناڤبر. ٢- ل دویڤ سزای کوشت.
**أعدى:** ١- بەزەکتر. ٢- ژ سنووری دەرکەڤت.
**أعذب:** شرینتر.
**أعذر:** ١- بوو خودانێ هیجەتێ. ٢- هێجەت نەهێلان.
**إعذوذب:** شرینبوو.
**الإعراب:** دبارکرنا کار و پیت و ناڤ و حال و سالوختێت رستەییێت ئاخڤتنێ.
**الأعراب:** عەرەبێت ل دەرڤەی باژێرا دژین چ خەلکێ گوندا چ کۆچەر.
**الأعراس الإلهية:** ل نک سۆفیا ئەوە کو ڕیڤینگێ دانیتە قووناغەکا مەعلووم، و وەغەر ل نک وان وەڕەیی و هەستداری نە.
**الأعراض:** کۆما (عرض)ە کو دبیتە ناموبس و حورمەت.
**الإعراض:** ڕویوەرگێران.
**الأعراف:** ١- جهەکە د ناڤبەرا بەحەشتێ و جەهنەمێ دا. ٢- نقشەکێ دارقەسپایە ل میرنشینا بەحرین هەیە. ٣- دەسپێکێت هوڕی. ٤- جهێت بلند ژ خیز و ناڤبرا. ٥- ییێت بلند(ژ عەورا). ٦- ل نک سۆفیا دبیتە مەقامێ دیتنا خودێ د هەر تشتەکی دا کو ب هەمی سالوخوتێت خۆ تەجەللا ببیت.
**أعرب:** ١- پەتیکر(زمان). ٢- دیارکر. ٣- ڕۆهن و ئاشکراکر. ٤- گۆت و دیارکر. ٥- کرە عەرەبی. ٦- بۆ خودان هەسپ و حیشترێت خودان عەسل.
**أعرج:** لەنگەر.
**أعرش:** کەپرەک چێکر.
**أعرض:** ١- پەحنتر. ٢- فرەهتر. ٣- خۆ دویرکر.
**أعرف:** زاناتر.
**الأعرف:** پۆرکدرێژ.
**الأعرق:** خودان رەھ و ڕیشال؛ یێ رەسەن.
**الأعرم:** ١- ماریێ پنیپنی. ٢- چنیچنی. ٣- کەرێ پەزی. ٤- یێ گەلەک ڕەنگێ خۆ دگوهۆڕت.
**إعروری:** ب تنێ چوو ڕێکەکێ یان وەغەرەکێ.
**إعرورف:** ١- بوو خودان پۆرک. ٢- مشەو و بۆڕبوون (دارقەسپ). ٣- پێلێت وێ بلندبوون (دەریا). ٤- کەفێ دا.
**أعز:** ١- بهێزتر. ٢- بروومەتتر. ٣- دویردەستتر. ٥- ب شیانتر.
**إعزاز:** ئاسێکرن ل بەر شیانا.
**الإعزام:** ئنیەنکرن ژ بۆ کرنا تشتەکی.
**أعزب:** زگۆرد؛ هێژ ژن نە ئینای.
**الأعزل:** ١- بێ چەک. ٢- عەورێ بێ باران. ٣- بالندێ نەشێت بفرت. ٤- دەوارێ کوری خوار.
**إعزوزف:** خۆ ئامادەکر.
**أعسب:** ڕەڤی.
**الأعسر:** مرۆڤێ چەپ.
**أعسف:** ب شەڤێ ل دویڤ سەرێ خۆ چوو.
**أعسم:** دەست یان پێ حشک.
**أعشى:** ١- ب شەڤێ چەراند. ٢- ب شەڤێ بەرێ خۆ دایێ. ٣- خۆ لێ کۆرەکر. ٤- شیڤ دایێ.

**الأعشى:** شەڤكویر؛ ئەوێ ب شەڤێ نەبینت.
**أعشب:** گیا لێ شینبوو.
**الأعشر:** كەرەمرڤ.
**أعشم:** شەڤكویر.
**إعشوشب:** ١- گیا لێ شینبوو. ٢- ل گیای چەری.
**الإعصار:** ١- ئەو هورە یێ عەجاجێ چێدكەت و دكەتە ستوین و بلند كەتە عەسمانی ئانكو بابەلسكێ چێدكەت. ٢- ئەو هورە یێ عەورێ ب دەنگ و برویسی چێدكەت.
**الأعصل:** ددانخوار.
**الأعصم:** بالندەیێ پەرێت وی سپیاتی لێ هەی.
**أعصم:** حەیوانێ تنێ پێیەكێ وی یان هەردو پێت وی د سپی.
**أعصی:** بوو ترك.
**الأعضب:** ١- گوهشەق. ٢- شاخشكەستی. مرۆڤێ ئێكانە. ٣- بێپشتەڤان.
**الأعضد:** یێ زەندك زراڤ.
**أعضل:** ١- وەستاند، نەچاركر. ٢- تووندبوو. ٣- بوو گرێ.
**أعطا:** دا؛ بەخشی.
**الإعطاء:** دان؛ بەخشین.
**الإعظام:** مەزنكرن، ب مەزن زانین.
**أعظر:** گرانبوو.
**أعظم:** مەزن؛ مەزنتر.
**الأعفر:** ١- خیزێ سپی. ٢- سپی.
**الأعفش:** یێ دیتن لاواز.
**أعفق:** هات و چوو بێ شۆل.
**الأعفک:** مرۆڤێ چەپ.
**أعفی:** هێلا.
**الأعقاب:** كۆما (عقب) كو دبیتە پاشیا پێی یان یا هەر تشتەكی.
**الاعقاق:** كنف.
**أعقر:** حێبەتیكر.
**الأعقص:** ١- یێ تبلێت وی لێكبادایی. ٢- یێ ددانێت وی چووینە د ناف دەڤی دا. ٣- ژ نێری و بەرانا ئەوێ شاخێت وی ل دۆر گوها زڤرین. ٤- یێ قەلس.
**أعقف:** خوار.
**أعقل:** لنگخوار.
**أعقل:** عاقلتر.
**أعكی:** ڕەخستویر.
**أعل(بضم اللام):** نەساخكر.
**أعلی:** بلندتر.
**إعلاء:** بلندكرن.
**أعلاث الزاد:** خوارنا نەژدل دهێتە خوارن.
**أعلاط:** بێ ناڤ.
**الإعلال:** گوهۆڕینا پیتا بزوین.
**الإعلام:** ١- ڕاگەهاندن. ٢- پێحەساندن.
**إعلان:** دیاركرن؛ ئاشكراكرن؛ ركلام.
**الإعلان:** ریكلام؛ دیعایەتا بازرگانی.
**أعلف:** ئالیك دایێ.
**أعلم:** ١- نیشادا. ٢- نیشانا مێرخاسا ب خۆ ڤە كر. ٣- نیشانەک پێڤەكر. ٤- هێلا ببینت.
**الأعلم:** ١- یێ زاناتر. ٢- یێ لێڤا وی یا ژۆری شەق.
**أعلن:** ئاشكراكر، دیاركر.
**إعلولی:** ب سەر كەت.
**أعلی:** بلند؛ بلندتر.
**أعم صباحا:** جۆرەكی سلاڤێ یە كو دبیتە سپێدە باش.
**أعم:** تەڤاییتر؛ ڤەگرتر.
**أعمی:** كۆرە.
**الإعماء:** كۆرەكرن.
**الإعمار:** ئاڤاكرن.
**الأعماق:** كویراتی.
**إعماق:** كویركرن.
**الأعمال اليدوية:** كارسازی.
**الأعمال:** كۆما (عمل)ە كو دبیتە كار.

**أعمد(بالسكون):** ستوین دا بن.
**أعمر:** ١- ئاڤاتر. ٢- ب عەمرتر.
**أعمش:** چاڤلاواز.
**إعمل:** کاری بکە، شۆل بکە.
**الأعمى:** ١- کۆرە؛ حوتم. ٢- نەزان.
**الأعميان:** هلمشت و ئاگرن.
**أعنى:** ئێشاند و بارێ وی ژ هێزا وی پتر لیکر.
**أعناء:** گەلەک جۆر.
**الإعنات:** ١- وەستاندن. ٢- خۆوەستاندن. ٣- کرنا وی تشتێ نەپێدڤی(لزوم ما لا يلزم)، ئانکو تو پیتا سەروا ویا بەری وێ وەکی ئێک بینی وەکی (سلطان) و (شيطان).
**أعنان السماء:** کوما(عنن)ە کو دبیتە رەخ و دۆرێت عەسمانی.
**أعنان:** رەخورۆخ.
**أعنس:** گوهارت.
**الأعنش:** یێ ب شەش تبلا.
**الأعنف:** یێ توندتر.
**الأعنق:** ستۆدرێژ.
**أعنى:** ئێشاند.
**أعهد:** ئێمنکر.
**الإعواز:** خێزانی؛ دەستکورتی.
**الأعوام:** کۆما(عام)ە کو دبیتە سال.
**أعوان:** کۆما(عون)ە کو دبیتە هاریکار.
**إعوج(بتشديد الجيم):** خواربوو.
**أعوج:** خوار.
**الإعوجاج:** خواری؛ خواراتی.
**أعوذ بالله:** ئەز خۆ ب خودێ رادسپێرم ئانکو ئەز پارازتنا وی دخوازم.
**الأعور:** ١- مرۆڤێ ب چاڤەکی. ٢- قەل. ٣- یێ بێ برایێ دەیبابی. ٤- مرۆڤێ بێخێرێ چونە. ٥- دەلیلێ نەزان. ٦- رێکا هاتوبات.
**إعوز:** پێدڤیبوو.

**أعيا:** ١- وەستیا. ٢- سەختبوو.
**الإعياء:** ١- وەستیان. ٢- بێکارییەکە دکەڤیتە گەهێت مرۆڤی و ژ دەست وپێ دکەت.
**أعيان:** ١- رهسپی، ماقویل. ٢- ئەون ئەوێت سەربخۆ و نەدویڤەلانک. ٣- کۆما(عين)ە.
**أعيس:** حێشترا رەنگێ وێ سپیێ ب سۆری ڤە یان ب رەشی ڤە.
**أعين:** چاڤمەزن.
**أغاب:** چوونە رۆژئاڤایێ.
**أغاث:** ١- هاریکاری و پشتەڤانی کر. ٢- هەوار گەهاندێ.
**الإغاثة:** هەوارهاتن، هەوارڤێراگەهاندن.
**أغار:** ١- غەوارەبوو. ٢- د ناڤ دا چوو. ٣- هێرشکر. ٤- بەزا وی زێدەبوو. ٥- لەزکر. ٦- باش بادا. ٧- گەلەک بادا. ٨- غیرەتێ گرت. ٩- غیرەت بۆ چێکر.
**الإغارة:** هێرشکرن.
**إغاض:** کێمکر(بها؛ ئاڤ). ٢- راوەستاند (روندک).
**الإغاظة:** کەربڤەکرن.
**أغاف:** خوارکر.
**الغاق:** بالندەیێ قەل.
**أغال:** ١- چوو نک ژنکێ و ئەوا شیری ددەتە بچویکێ خۆ. ٢- شیر دا بچویکێ خۆ و ئەو ب حال.
**الإغال:** چوونا ب لەز و بمجدی.
**أغام:** عەوری گرت.
**أغان:** ١- عەوری گرت. ٢- داپۆشی. ٣- مۆرکر.
**أغب(بتشديد الباء):** ب شەڤ ل نک ما.
**أغبر:** ١- چوویی؛ دێ چت. ٢- تۆزێ گرت. ٣- تۆز راکر. ٤- بارانا وی دژواربوو (عەسمان). ٥- هات و مجداهیکر.
**إغبر:** ١- تۆزێ گرت. ٢- تۆزا وی دژواربوو.

**الأغبر:** ١- تۆزکەوی. ٢- تۆزێ گرتێ. ٣- یێ چوویی. ٤- برسا دژوار. ٥- مرۆڤێ باش. ٦- سالارێ ماقویل. ٧- سپییێ هەر تشتەکی. ٨- ناڤچاڤ چال. ٩- گەلەک گەرم.

**الإغبرار:** توزەویبوون.

**أغبس:** ١- شەڤا تاری. ٢- تاری.

**أغبش:** تاری؛ بێشەوق.

**إغتاب:** بەحسێ وی ل پشت وی ب خرابی کر.

**إغتاظ:** کەربگرتیبوو.

**إغتال:** ١- ب خاڤلەتی ڤە کوشت. ٢- گر و قەلەو بوو.

**الإغتباط:** کەیفخۆشبوون.

**إغتبط:** کەتە خۆشییێ.

**إغتبق:** ١- مەیا شەڤێ ڤەخوار. ٢- ب شەڤ مەی ڤەخوار.

**إغتبن:** د کۆشا خۆ دا ڤەشارت یان کرە د بنکەفشێ خۆ ڤە.

**الإغتداء:** چوونا ل دەمی سپێدێ بەری دەرکەڤتنا رۆژێ.

**إغتدف:** ١- گەلەک ژێ بر. ٢- بری.

**إغتر بالشئ:** پێ هاتە خاپاندن.

**إغتر:** ڤیا خافل ببت.

**الإغتراب:** ١- چوونا جهێت بیانی؛ هاڤیبوون. ٢- غەریببوون؛ دویرکەڤتن ژ وەلاتی.

**الإغترار:** غورویربوون، ژکەڤلێدەرکەفتن.

**الإغتراف:** لەپتێهلنان.

**إغترب:** ١- چوو جهێت بیانی. ٢- ژنەکا بیانی ئینا.

**إغترق:** ١- دۆمکر. ٢- زکێ وی مەزنبوو هەتا قاویشا وی تەنگبووی. ٣- ب ناڤکەڤت پاشی د بوری وان راکر(هەسپی).

**إغترم:** خرامەت دانا سەر خۆ.

**إغتزی:** قەستکرێ.

**إغتسال:** سەرشویشتن ژ جنابەتی، سەرشویشتن.

**إغتسل:** ١- لەشێ خۆ شویشت. ٢- جنابەتا خۆ راکر. ٣- شلبوو(ژ خوهێ). ٤- دخۆدا (گولاڤ).

**إغتش:** هزرکر زەغەلیا تێدا هەی.

**الإغتشاش:** زەغەلیکرن.

**إغتصب:** ١- ژێستاند. ٢- کارێ سێکسی یێ ب کوتەکی. ٣- ب کوتەکی بر.

**الإغتصاب:** ١- کرێتکرنا ژنکێ یان کچێ ب خورتی. ٢- ژێ ستاندن.

**إغتط:** ١- کەتە بەرمرنێ. ٢- تژی کەرب کر.

**إغتف:** ١- ب لەز چەری. ٢- ئالیک خوار. ٣- پیچا ژیارێ.

**إغتفر:** ستارەکر و لێ بۆری.

**إغتفل:** ١- هزرکر یێ بێ ئاگەهە. ٢- خۆ ل بێئاگەهیا وی گرت.

**إغتل:** ١- د بن جلکا ڤە ل بەرخۆکروو. ٢- کەرەستێ بۆنداری (الغالیة) د خۆ دا. ٣- دەرامەتی وی بر.

**إغتلب:** ١- ب سەرکەڤت. ٢- ب شکاند ستاند.

**إغتلم:** ل دویڤ شەهوەتا خۆ چوو.

**إغتم:** ١- زێدە و مشەبوو. ٢- غەمگینبوو.

**الأغتم:** ئەوێ د ئاخڤتنا وێ نە هێتە گەهەشتن.

**الإغتماس:** بنئاڤکرن، تێهلنان.

**الإغتماض:** ١- چاڤنقاندن. ٢- چاڤنقانکی.

**الإغتمام:** خەمهلگرتن.

**إغتمد:** چۆ د ناڤ دا و بۆ خۆ وەکی کاڤلانی لێکر.

**إغتمس:** ١- نقوبوو؛ دبنڤەبوو. ٢- چوو تێدا.

**إغتمص:** بێ بهاکر.

**إغتمض:** ١- نقیا. ٢- تەیسینا وی چوو و نەما(برویسی). ٣- چاڤێت خۆ نقاندن.

**إغتمط:** دەرکەڤت و بێ سەروشوینبوو.

**إغتنی:** ١- زەنگینبوو. ٢- فایدەکر.

**إغتنم:** ١- پویرە ب دەست ڤە ئینا. ٢- بۆ خۆ ب دەرفەت دیت. ٣- ب دەست خۆ ئێخست. ٤- کرە پویرە. ٥- دەرفەتێ ب دەستئێخستنێ ب مفا دیت.

**إغتهب:** ل تارییێ چوو.

**الإغتياب:** غەیبەتکرن؛ کرنا بەحسێ کەسەکی ل پشت وی.

**الإغتيال:** ١- تیرۆرکرن؛ خۆ ل بەر ڤەنان دگەل کوشتنێ. ٢- کوشتنا ب خافلەتی ڤە.

**الإغتيام:** ١- عەورگرتن. ٢- غەمگینبوون.

**الأغثر:** ١- کەڤز. ٢- بەران. ٣- شێر. ٥- گورگ. ٦- مرۆڤێ بێ عەقل. ٧- ڕەنگێ تیکهەل ژ کەسکی و سۆری و خولکی.

**أغثى:** گەلەک قرش و قال لێ کۆمبوو.

**أغدف:** ١- سستکر(پەردە). ٢- بەردا سەر(پۆشی).

**أغدق:** زێدەکر.

**إغدودف:** مشەبوو.

**إغدودن:** ١- خاڤبوو و کەڤت. ٢- ژ تەڕاتییێ ڕەنگێ وی ب ڕەشی ڤەچوو(گیا). ٣- درێژبوو و لێکهاتەبادان.

**الأغر:** ١- چال؛ یێ پنیەکا سپی ل ناڤچاڤا. ٢- سپی. ٣- کۆلە. ٤- جاری.

**الإغراء:** ١- دسەردابرن. ٢- ڕاکێشانا کەس خۆ ل بەر نەگریت.

**الإغراب:** بیانیکرن.

**الإغراس:** چاندن.

**الإغراق:** خەندقاندن ب ئاڤێ.

**أغرب:** ١- تشتەکێ سەیر کر. ٢- چوو جهەکێ بیانی. ٣- چوو رۆژئاڤاییێ.

**أغرب:** ژ پێش چاڤێت من هەرە.

**أغرز:** کرە تێرا.

**أغرس(غرس):** چاند.

**أغرق:** ١- خەندقاند. ٢- تێدا ئاڤاکر. ٣- بنئاڤکر. ٤- گەلەک ڕاکێشا (ژەها کڤانی). ٥- گەلەک درێژکر یان دۆم داییێ.

**الأغرل:** سونەتنەکری.

**أغرم:** هێلا بدەت.

**الأغرودة:** چیکیا بالندەی.

**إغرورق:** خەندقی؛ بنئاڤبوو.

**أغرى:** هاندایێ.

**أغزل:** بادا؛ زڤراند.

**إعسار:** بزەحمەتئێخستن.

**الأغسان:** ڕەوشتیت خەلکی.

**أغسطس:** مەها خزیرانێ.

**أغسق:** تاریاتیا وێ دژواربوو.

**إغسل:** بشۆ.

**الأغسل:** ١- سالا خێروبێر. ٢- ژیارا بەرفرەه.

**أغشى:** تاریبوو.

**الأغشى:** یێ تنێ سەرێ وی سپی و لەشێ وی ڕەنگەکێ دی.

**أغص:** هێلا د حەفکێ ڕا.

**أغصن:** ١- تاییت وی هاتن. ٢- تلیا وی گربوو(ئویشی).

**الأغصن:** یێ ڕەنگێ سپی د کوریێ دا هەی(جانەوەر).

**أغضى:** ١- تاریبوو. ٢- ژ دەغەلی پاڤژکر (گەنم). ٣- دەغەلێ وی زیدەبوو(گەنم). ٤- بژارت؛ براژت.

**أغضض:** نزم بکە.

**أغضف:** ١- تاریبوو. ٢- دیاربوو ڕەنگێ باراندنا بارانێ لی کفشبوو(عەور).

**الأغضف:** ١- سەیێ گوهشۆر ژ زکماکی. ٢- شەڤا تاری. ٣- گوهشۆر. ٤- تیرا پەڕ پەحن.

**الأغضن:** ١- یێ چاڤێ خۆ ڕاشکاندی. ٢- یێ چاڤ ڕاشکەستی ژ زکماک.

**أغط:** ١- دبنڤەکر. ٢- نقۆکر.

**أغطش:** تاریبوو.

**الأغطف:** ١- مژویلانک درێژ. ٢- ب خێروبیر(ژیار).

**أغطى:** ١- نخاڤت. ٢- ئاڤ تێگەڕیا و تیرکیت وێ درێژبوون (مێوا ترى).
**أغطش:** تاریکر.
**الإغفاء:** خەوا سڤک.
**أغفر:** جەو ژێ هات(دار).
**أغفل:** ١- بێئاگەهکر. ٢- پویتە پێ نەکر و پشتا خۆ دایێ.
**أغفى:** ١- ژ دەغەلی پاقژکر. ٢- نڤست.
**أغل:** ١- گورا بەلی هندەک پرتێت گوشتی و بەزی هێلانە ب پیستی ڤە. ٢- خیانەتکر. ٣- بوو خودان دەرامەت. ٤- دەرامەت ئینا. ٥- ب دژواری سەحکرێ.
**إغلاء:** گرانکرن.
**إغلاق:** گرتن، دائێخستن.
**إغلال:** خیانەت.
**أغلب:** باهراپتر.
**الأغلب:** ١- حەفکستوبر. ٢- یێ سەرکەڤتیتر. ٢- باهرا بتر دەمێ بێژی:(على الأغلب).
**أغلبية:** پتری.
**الأغلط:** یێ بشاشیتر، یێ بخەلەتیتر.
**أغلط:** هێلا خەلەت ببیت.
**الأغلظ:** یێ ستویرتر.
**أغلظ:** گران کرێ.
**أغلف:** کویفەک بۆ چێکر.
**الأغلف:** ١- نەسونەتکری. ٢- هەرتشتێ د کویفی دا. ٣- یێ د چو نەگەهت. ٤- یێ ب شینکاتی و گیا.
**أغلق:** گرت؛ دائێخست.
**أغلق(بالضم والكسر):** ١- هاتە دائێخستن. ٢- هاتە ڕادەستکرن (تەسلیمکرن).
**الأغلوج:** یێ تەڕ و نازک.
**إغلولب:** ١- مشەبوو. ٢- زێدەبوو.

**أغلى:** ١- دیت یێ گانبهایە. ٢- گرانتر. ٣- هێلا بکەلت. ٤- ژ دویرڤە سلاڤ کر. ٥- گرانکر.
**أغلى:** گرانتر، ببهاتر.
**أغم:** ١- هاتە نخاڤتن و بەرزەبوو. ٢- غەمگینکر. ٣- عەوری گرت.
**الأغم:** ١- یێ گەلەک پویت ل سەروچاڤ و پاتکا. ٢- یێ مسمت(عەور).
**الإغماء:** دلگرتن، بێهشبوون.
**إغماز:** ١- لۆمەیا ب ئیشارەتا چاڤی دهێتە کرن. ٢- تێهلنان.
**الإغماض:** نقاندن.
**أغمد:** کرە د کاڤلانی دا.
**الأغمش:** دیتن لاوازێ چاڤێت وی روندکا دکەن.
**أغمض:** چاڤێت خۆ نقاندن.
**أغمط:** بەردەوامێ پێ دا.
**أغمل:** هێلا برزت.
**أغمي (بضم الألف):** ١- دلگرتیبوو. ٢- عەورێت وی مان (ئەسمان).
**أغن (بتشديد النون):** ١- بوڤێنکر. ٢- گەهەشت (فێقی). ٣- داروبار لێ مشەبوون. ٤- دەنگێ خۆ د دفنێ ڕا دەێخست.
**الأغن:** ١- گنگنی؛ یێ ب خمخمکا د ئاخڤیت ئانکو دەنگێ خۆ د دفنێ ڕا دەردئێخت. ٢- ب رەوش. ٣- ب گیا. ٤- ب داروبار. ٥- جوان و ب خەمل.
**إغناء:** ١- دەولمەندکرن، زەنگینکرن. ٢- بێمنەتکرن.
**الأغنام:** کۆما(غنمة)یە کو دبێتە پەز.
**الأغنى:** ١- دەولەمەندتر، زەنگینتر. ٢- بێمنەتتر.
**أغنى:** ١- زەنگینکر. ٢- بێ منەتکر.

**الأغنوجة:** تشتێ نازداری پێ دهێتەکرن.
**الأغنية:** ستران.
**الإغواء:** دسەردابرن.
**أغوى:** دسەردابر.
**أغيا:** ١- ڕاوەستا. ٢- چەنگێت خۆ لێک دان. ٣- گەهشتە ئارمانجێ د بلنديا پلەيان دا.
**إغياء:** چکلاندن.
**أغيار:** کۆما (الغير)يە کو دبيتە خودان غيرەت.
**الأغيد:** ١- گيايێ نەرم و چەمياى. ٢- عەردێ ب گيا. ٣- نڤستيێ ستۆيێ وى خواربووى.
**أغيف:** ڕاست و چەپ خوار کر.
**الأغيف:** ١- گيايێ نەرم و چەمياى. ٢- عەردێ ب گيا. ٣- نڤستيێ ستۆيێ وى خواربووى.
**أغيل:** مەزنبوو و تايێت وێ ليکهاتنەبادان.
**الإغيل:** يژيێ گر و مەزن.
**إغيم:** ١- لێ بوو عەور. ٢- تێهنيبوو.
**الأغين:** يێ کەسک و درێژ.
**أف:** ١- ئۆف. ٢- عەصەبيکرن. ٣- دلهێلان.
**الأفؤود:** نانێ ب خوليکەلکێ چێکری.
**أفات:** هێلا ببۆرت.
**أفاح:** ١- هێلا بکەليت. ٢- ڕژت. ٣- بێهن ژێ چوو.
**أفاخ:** دەنگ کر، ئانکو ژێ هات.
**أفاد:** ١- کرە شاند. ٢- مفا گەهاند. ٣- کوشت. ٤- هلگرت. ٥- ب دەستخۆێخست. ٦- دايێ وەک مەرديني. ٧- گۆت.
**أفار:** هێلا بکەلت.
**أفاص:** ١- ڕۆهنکر. ٢- تبلێت وى ژێ سستبوون و ژ دەستى دەرکەڤت.
**أفاض:** ١- ب مشەيى دا. ٢- ژ جهێ خۆ چوو بۆ جهەکێ دى. ٣- ڕژيا. ٤- ڤالاکر. ٥- دەرکەت. ٦- ب ناف ڤە چوو. ٧- کر. ٨- دا؛ بەخشى. ٩- کرێ هەتا دسەرداچوويى. ١٠- بناڤڤەچوو(ئاخڤتن). ١١- کر(پەيڤ). **الإفاضة:** ١- هێلانا جهەکى. ٢- دسەردابرنا ئامانى.
**إفاضة:** پێلەک؛ بلقەک؛ تاڤيەک.

**أفاظ:** مر.
**أفاظ:** مراند.
**أفاف(بالتشديد):** ئۆفئۆفى.
**أفاق:** ١- ژ خەو ڕابوو. ٢- هشياربوو. ٣- ساخبوو؛ ساخلەميا زڤرى ڤە. ٤- پەز دا هەفشى د ناڤبەرا د دۆتنا دا.
**الأفاق:** شيرێ د ناڤبەرا دو دوهتنا دا د گوهانى دا خڕڤەبووى.
**الآفاق:** کوما(أفق)ە کو دبيتە ئاسۆ.
**الإفاقة:** ژ خەو ڕابوون.
**إفان(أبان):** ل دەمێ.
**الأفانين:** ١- کۆما (أفنان)ە کو دبيتە کۆما (فنن)ە يێ کو دبيتە تايێ دارێ. ٢- ڕێ و ڕێبازێت ئاخڤتنێ.
**الآفة:** ئێش؛ تشتێ تشتى تێ ببەت.
**أفتئت:** کەت و مر.
**الإفتاء:** دانا فەتوايێ؛ حوکمدان.
**إفتات:** ١- بۆرى. ٢- حوکم ل سەر دا.
**إفتاد:** ١- ئاگر بۆ بژارتنا گوشتى هلکر. ٢- بژارت.
**الإفتاق:** شەقکرن.
**إفتاق:** فقيربوو.
**الإفتتاح:** ڤەکرن.
**الإفتتاحية:** سەرگۆتار؛ گوتارا ل دەستپێکا ڕۆژنامەيێ يان کۆڤارێ ئانکو يا پێ دهێتە ڤەکرن.
**إفتتح:** ڤەکر.
**الإفتتان:** ١- سەربۆڕکرن. ٢- د سەردابرن. ٣- ئێخستنا د بەلايێ دا.
**إفتتن:** ١- هاتە سەربۆڕکرن. ٢- ئێخستنە بەلايێ. ٣- هاتە سەربۆڕکرن.
**إفتجل:** ژ بنێ پێ خۆ چێکر؛ چێکر.
**إفتح:** حوکمى بکە.
**إفتخ:** ١- خڕخڕکر (مرۆڤ). ٢- کفکفکر (مار). ٣- بەلاڤبوو.
**أفتخ:** وەستا و داخباربوو.
**الإفتخار:** شانازيبرن.
**إفتخر:** شانازيبر.

**الأفخارستیا:** نهینیا قەربانێ پیرۆزە ل نک فەلان (یۆنانی) یە.
**إفتدی بە:** ١- دا هەمبەر ئازادیا وی. ٢- دا هەمبەر بەردانێ ژ مێری.
**أفتر:** ١- بەر و پشتێت چاڤێت وی لاوازبوون و چاڤێت راشکەشتن. ٢- لاوازبوو. ٣- خاڤ و سستبوو. ٤- کەنیەکێ جوان کر.
**إفتر:** ١- ددانێت خۆ قیچکرن. ٢- برسقی. ٣- بێهنا وی بەردا ئانکو هێلا بیهنا خۆ ڤەدەت.
**الإفتراء:** درەوژکیستیکرن.
**الإفتراس:** خاوارنا ژ لایێ دەهبەی ڤە.
**الإفتراش:** رائێخستن.
**الإفتراص:** ب دەرفەتدیتن.
**الإفتراض:** ریکەکا (منطقی)یە ژ بۆ تەیژاندنا بابەتا.
**الإفتراط:** بەرزەکرن.
**الإفتراع:** درێژبوون.
**إفتراق:** ژێکڤەبوون.
**إفترز:** بریار ب تنێ دا.
**إفترس:** ١- نێچیرکر. ٢- ستوبی وێ شکاند.
**إفترش:** ١- هاتە رائێخستن. ٢- پەحنکر. ٣- بەلاتینک لێ مشە بوون. ٤- پەقاند. ٥- ل عەردی پەحنکر. ٦- ئێخستە عەردی. ٧- پێلێنا. ٨- ب دویڤ کەڤت. ٩- بۆ خۆ حەلالکر نەکامیا وی بکەت. ١٠- تیککر (هەستی). ١١- دایێ؛ چوویێ(رێ).
**إفترص:** بۆ خۆ ب دەرفەت دیت.
**إفترض:** ١- سەپاند؛ ل سەر فەر کر. ٢- ب دەرفەت دیت.
**إفترط:** چوو و نەما.
**إفترع:** ژ کچینی ئێخست.
**إفترق:** بەلاڤبوو.
**إفتری:** چێکر؛ هەکو دبێژن ژ بنێ پێ خۆ چێکر.

**إفتسل:** ژ بنێ دارێ ڤەکر و چاند(شتل).
**إفتص:** ژێ ئینادەر.
**إفتصد:** دەمار بری یان شەقکر.
**إفتصل:** ١- ڤەگوهازت. ٢- شیرڤەکر.
**الإفتضاح:** فهێتبوون، رویرەشبوون، شەرمزاربوون.
**الإفتضاخ:** داقوتان.
**الإفتضاض:** ١- بژکین. ٢- رێهتنا پیچپیچە.
**إفتضح:** فهێتبوو.
**إفتضخ:** داقوتا.
**إفتطر:** ئافراند.
**إفتظ:** ئاڤا عویرکێ حێشترێ ڤەخوار پشی کو دەڤێ وێ گرێدای و نەهێلای بچەریت.
**الإفتعال:** کرن یان گۆتنا چێکری و نەیا دورست.
**إفتق:** ١- دارێهت و لێکر(عەوری). ٢- کفش و دیابوو.
**الإفتقاد:** ١- بەرزەکرن. ٢- سەرەدان.
**الإفتقار:** ١- فەقیربوون. ٢- پێدڤیبوون.
**إفتقد:** ژ دەست دا.
**إفتقر:** ١- پێدڤیبوو. ٢- فەقیربوو.
**أفتسک:** ١- کوشت. ٢- ب خافلەتی ڤە کوشت. ٣- گەلەک پێڤەما.
**الإفتکار:** هزرکرن.
**الإفتکاک:** ژێکڤەبوون.
**الإفتلال:** لێکزڤرین، بادان.
**إفتلت:** ١- ژ نک خۆ چێکر. ٢- ب لەز بر. ٣- ب لەز کر.
**إفتلذ:** پیچەک بر.
**أفتن:** ١- بۆ خۆ راکێشا. ٢- سۆت. ٣- هێلا حەژ وی بکەت. ٤- دسەردابر. ٥- ئێخستە بەلایێ. ٦- سەربۆرکر.
**إفتن:** ١- هونەر تێدا کر. ٢- بەرفرەهکر. ٣- راست و چەپ هاژۆت.
**الإفتنان:** دسەردابرن.

**الإفتيات:** غاردان بۆ کارەکی بەری خەلکی ب هەلویستەکێ ژخۆرایی.
**أفج:** ١- گیرۆبوو. ٢- چوو و بەلاڤبوو.
**أفجى:** ١- مەزاحتنەکا زۆر ل عەیالێ خۆ کر. ٢- زکێ وی مەزنبوو.
**الأفجى:** لنگفرِ.
**الإفجار:** پەقاندن.
**إفجــــر:** ١- پـــەقی. ٢- کـــوفری کـــر. ٣- ژ بنئـەمریا خـودێ دەرکـەڤت. ٤- ژ رێ دەرکـــەڤت. ٥- گونـــەهکرن. ٦- زنـــاکر. ٧- چاڤێت وی وەستیان. ٨- ساخبوو.
**أفجــر:** ١- لـــێ بـــوو ســـپێدە. ٢- گەهشـــتە سپێدێ.
**أفجع:** خولی ب سەری وەربوو؛ مسیبەتەک ب سەری هات.
**الأفجل:** یێ لنگفرِ.
**الأفجم:** یێ هەردو رِەخێت دەڤێ وی د ستویر.
**الإفحاش:** گەلەک کرێتکرن.
**إفحام:** ١- کرنە رەژوی. ٢- متکرن.
**أفحج:** پاشڤەچوو.
**أفحش:** ١- شۆلێ خراب کر. ٢- قەلسیکر. ٣- کریار ژ تخوییی دەرئیخست.
**أفحم:** ١- ب دەلیلا بێ دەنگ کر. ٢- وەلێکر کو ئێدی نەشێت هەلبەستا بێژن. ٣- کرە کری هەنا دەنگێ وی چێک بووی. ٤- لێ بۆ تاری.
**الأفحوص:** ئەو جهە یێ کەدیک ڤەدکۆلت دا هێلا تێدا بکەت.
**الإفخام:** مەزنکرن.
**أفخم:** مەزنتر، پلەبلندتر.
**الأفخم:** یێ مەزنتر.
**أفد(بفتحتين):** لەزکر.
**أفد(بالفتح والكسر):** لەزۆکی.
**أفدح:** دیت یێ مەزنە.
**أفدس:** تەڤنپیرک کەتنە مالا وی.
**أفدع:** تیڤلاند و پیچەک شەق کر.
**إفدغ:** تیڤلی.
**أفـدم:** ١- دەربێنـــک ئێخســـتێ. ٢- ســـەفینک ئێخستێ.
**أفدى:** پارە هەمبەر ئازادکرنا وی قەبیل کر.
**أفذ:** ١- کرە کت. ٢- کتـەک ئینـا. ٣- تێژکـەک ب تنێ ئینا.
**الأفذ:** تیرا بێ پەرِ.
**أفر(بتشـــديد الـــراء):** ١- هـــێلا برِەڤـــت. ٢- شەقکر.
**الأفر:** یێ دەڤ و گرنژین شرین.
**الأفرة(بالضم):** ١- تێکهەلبوون. ٢- دژواری.
**الإفراج:** بەردان؛ ئازادکرن.
**الإفراخ:** چویچەلۆک دەرئێخستن.
**الإفراد:** کتکرن.
**الإفـــراز:** ١- ژێکجـــوداکرن. ٢- تشـــتێ ژ تشـــتەکی دەردکـــەڤیت وەکـــی ئـــەوێت ژ غوددەییێت لـەشـێ مرۆڤی دەردکەڤن.
**الإفراض:** سەپاندن؛ فەرضکرن.
**الإفراط:** زێدەکرنا ژ تخوییی دەرکەڤتی.
**أفرث:** عویرک شەقکر و عویرگویش ڤالاکر.
**أفرح:** ١- کەیفخۆشکر. ٢- بارێ وی گران کر.
**أفـرخ:** ١- ب تێـژک کـەت. ٢- دویماهیـا وی دیاربوو. ٣- نهێنیا خۆ دەرەهی کر.
**أفرد:** ڤەدەرکر.
**أفرز:** ڤەدەرکر.
**الأفرز:** یێ پشت کۆد.
**الأفـــرس:** ١- یـــێ پێشـــبینیا وی ژ هـــەمیا دورستتر. ٢- یێ سوارچاکتر.
**أفرش:** ١- پەحنکر. ٢- رِازاند. ٣- تایێت خۆ رِاهـــێلان. ٤- بلاتینـــک لـــێ زێـــدەبوون. ٥- دانا عەردی.

**أفرط:** ١- لەز تێدا کر. ٢- هنارت. ٣- لێ مر. ٤- بەری هەڤالێ خۆ دەست پێ کر. ٥- ژ بیر کر و هێلا. ٦- ژ تخوبێ دەرکەڤت. ٧- بچویکەکێ وی یێ نەبالق مر. ٨- ژبیرکر و هێلا. ٩- ژبیرکر. ١٠- هێلا. ١١- ژ تخوبێ دەربازبوو.

**أفرع:** ب سەرکەڤت.

**الأفرع:** ١- یێ پرچێ وی دورست؛ نەحەوێس. ٢- بەژن بلند.

**الأفرغ:** یێ ڤالا.

**أفرغ:** ڤالاکر.

**الأفرق:** ١- یێ پرچا سەرێ وی یان رهێت وی بووینە دو فلق. ٢- ددانفر؛ یێ ددانێت وی ژێک فر. ٣- دیکلێ کومرکا وی بوویە دو. ٤- ئاژەلێ شاخێت وی هەر ئێک بۆ قامەکێ چووین. ٥- ترسنۆک.

**أفرق:** بەرزەکر.

**أفرک السنبل:** گەهشتە رادەیێ پەرخاندنێ دا دان ژێ دەرکەڤیت.

**الأفرم:** ١- ددانهەرفتی. ٢- یێ تمبلکێ دفنا وی هاتیە برین.

**الإفرند:** جەوهەرێ شیری یان یێ خەنجەرێ.

**إفرنج:** مللەتێ ئەوروپا.

**أفری:** ١- بری و شەقکر. ٢- چێکر و ب سەرێکڤەئینا. ٣- پەقاند. ٤- شەقاند. ٥- پرتپرتکر. ٦- بری.

**أفز:** ترساند؛ بزداند.

**الإفزاع:** ١- ترساندن. ٢- دهەوارێ هاتن.

**أفزع إلیه:** هەوارا خۆ گەهاندێ.

**أفزع:** ١- ترساند؛ بزداند. ٢- هشیاربوو.

**الإفساد:** خرابکرن.

**أفسد:** ١- خرابکر. ٢- پویچکر. رزاند.

**أفسل:** شتل ژ ماکێ ڤەکر.

**أفشی:** ١- بەلاڤکر. ٢- دەرەهیکر.

**الإفشاء:** ١- بەلاڤکرن. ٢- دەرەهی کرن.

**الإفشال:** ١- ترساندن. ٢- کارتێکرن و شکاندن.

**الأفشغ:** ١- ئاژەلێ شاخێت وی هەر ئێک بۆ لایەکی چووی. ٢- مرۆڤێ ددان فر.

**الأفشین:** جۆرەکێ نڤێژایە ل نک (یۆنانی)یا.

**أفصح:** ١- ب رەهوانی و رۆهن ئاخڤت. ٢- رۆناهیا وی دیار بوو(سپێدە). ٣- زەلالبوو. ٤- کەفا وی چوو و نەما(شیر). ٥- روهن و ئاشکرا بوو. ٦- مەبەستا خۆ دیارکر. ٧- دەربری، رۆهنکر.

**أفصد:** شەقبوو.

**أفصل:** دەمێ شیرڤەکرنا وی هات(بچویک).

**أفصم:** قەتبوو.

**الأفصم:** یێ پچیای.

**الإفضاء:** ١- ڤالاکرن. ٢- دەرەهیکرن.

**الإفضال:** قەنجی لێکرن.

**أفضح:** هەتکا وی بر، شەرمزارکر.

**الأفضح:** سپیێ نەگەلەک سپی.

**أفضخ:** دەمێ پەرچقاندنێ هات.

**الأفضل:** باشتر.

**أفضل:** هندەک ژێ هێلا.

**أفضی:** ١- فرەهبوو. ٢- تێراکر. ٣- نیشادا؛ تێگەهاند. ٤- دەرئێخستە دەرڤە. ٥- گەهشتە نک. ٦- دەرکەڤتە عەردێ چۆل و بەرفرەه. ٧- پەحنکا دەستێ خۆ دانا عەردی.

**أفطأ:** ١- حالێ وی خۆشبوو. ٢- خوارن دایێ. ٣- بێ تۆرەبوو.

**الإفطار:** ١- رۆژی پێدانەخوارن. ٢- فتاەرەکرن.

**الإفطام:** شیرڤەکرن.

**الأفطح:** تشتێ پەحن.

**أفطر:** ١- رۆژیا خۆ خوار یان شکاند. ٢- تیککر.

**الأفطس:** دفنپان.
**أفطـــم:** ١- دەمـــێ شـــیرڤەکرنا وی هـــات (بچویـــک). ٢- گەهەشـــتە دەمـــێ شیرڤەکرنێ.
**الأفطور:** پەقێت ل دفن و سەروچاڤا چیدبن.
**أفطع(مفظع):** یێ ژ توخوییی دەربازبووی.
**أفعى:** مار.
**الأفعاء:** بێهنێت خۆش.
**إفعال:** کولیلکێت وی ڤەبوون.
**إفعام:** تژیکرن.
**إفعل:** بکە.
**أفعل:** کولیلکێت وی ڤەبوون.
**أفعم:** تژیکر.
**أفعوان:** مارێ نێر.
**إفعوعم:** تژیبوو و دسەردا چوو.
**الإفعى:** مار.
**الأفعولة:** کریارا خراب و عنتیکە.
**أفغم:** تژی بێهن کر.
**أفغى:** ١- کەتە کولیلکا ئانکو کولیلک دان. ٢- کولیلکێت وی بشکورین. ٣- فـەقیربوو پشـتی حالخۆشـییێ. ٤- کرێتبـوو پشـتی جـــوانییێ. ٥- نەگوهـــداریکر پشـــتی گوهدارییێ.
**الأفق:** ئاسۆ.
**إفقاء:** پەقاندنا چاڤی.
**إفقار:** فەقیرکرن.
**أفقد:** ژ دەستچوو.
**الأفقد:** یێ خۆ بەردایە ئاخێ.
**أفقر:** فەقیرتر.
**أفقع:** ١- حالێ وی نەخۆشبوو. ٢- فەقیربوو.
**الأفقع:** یێ گەلەک سپی.
**أفقم:** فرەهبوو.
**الأفقـم:** ١- یـێ ددانێـت وی یێـت بـەرێ دەڤـی یێــت ســلال نەکەڤنــە ســەر یێــت خــوارێ. ٢- یـــێ زێـــدە مـــەزنبووی و ژ تخـــوییی دەرکەڤتی.
**أفقه:** زاناتر.
**أفقهه:** نیشادا.
**أفقي:** ئاسۆیی.
**أفک:** ١- لێ گوهارت. ٢- باران لێ نەهات. ٣- قولپی. ٤- درەوکر.
**الإفک:** درەو.
**أفکل:** ڤەلەرزی چ ژ ترسا یان ژ سەرما.
**الأفکل:** کۆما مرۆڤا.
**أفل:** ئاڤابوو.
**أفل(بتشـــدید الـــلام):** ١- چـــوو و زڤـــڕی. ٢- مالێ وی چوو.
**الإفلاس:** بێپارەیی، دەستڤالابوون ژ پارەی.
**الإفلاق:** کەرکرن.
**أفلت:** بەردا.
**أفلج:** ١- ددانێت وی ژێک فرە بوون. ٢- یا ڤیای ب دەستڤەئینا. ٣- ب سەرکەڤت.
**الأفلج:** ددانفرە.
**أفلح:** قورتالبوو.
**الأفلح:** یێ لێڤا وی یا ژێری شەق.
**أفلس:** دەستڤالابوون ژ پارەی.
**أفلک:** گوروڤربوو؛ خربوو.
**الأفلـک:** یـێ ل دۆر گـرێ ڤـەدەر و ب تنـێ دزڤرِت.
**أفلى:** ١- چوو بیابانێ. ٣- شیرڤەکر. ٣- ب خودانکر.
**الإفلیکـان:** ١- هەسـتیکێت چاڤـا کـو دکەڤنـە پەحنکا دەڤی. ٢- دو پرتێت گوشـتی نـە ب پەحنکا دەڤی ڤە.
**إفناء:** ژناڤبرن، نەهێلان.
**أفناء:** نەنیاس.
**أفنخ:** ١- شیاییێ. ٢- هەرشاند. ٣- شکاند.
**أفند:** ١- بێ هش و عاقل بـوو. ٢- خەلـەتبوو. ٣- عـەقلێ وی لاوازکـر. ٤- بـێ هـش و بیـر کر.

**التقليل:** کێمکرن.
**التقليم:** ١- برین. ٢- کەزاختن. ٣- سەرتیژکرن.
**تقمر:** ل بن رۆناهیا هەیڤێ چوو.
**تقمش:** هەر تشتێ دیتی خوار.
**التقمص:** ١- ل بەرکرنا کراسی. ٢- کراس ل بەر خۆ کر. ٣- چوونا رحێ پشتی مرنێ ژ لەشەکی بۆ لەشەکێ دی.
**تقمقم:** بنئاڤبوو هەتا کو خەندقی.
**تقمل:** کێچ کەتنێ.
**التقميص:** ڤەگوهازتنا رحا مرۆڤی ژ لەشەکی بۆ لەشەکێ دی کو دبێژنێ(التناسخ).
**تقن(بتشديد القاف):** ١- کرە تەقن. ٢- تەقناڤ بەردا سەر(کوردی) یە.
**التقن:** ١- تەقن. ٢- ئاڤا شیلی یا دبنێ برکێ. ٣- تویعەت(کوردی) یە.
**التقنيع:** قائلکرن.
**التقنين:** ١- دانانا قانوونێ. ٢- کریارەکە حکومەت دکەتن ژ بۆ کێمکرنا مەزاختنا تشتی ل وەلاتی.
**تقنب:** چوو ژۆر.
**تقنص:** نێچیرکر.
**التقنص:** نێچیرکرن.
**تقنصه:** نیچیرکر.
**تقنع:** کەڤلوژانک ل خۆ کرن.
**التقنية:** تەکنیک؛ ئەو هەمی ئالاڤ و رێکن یێت پەیوەندی ب کارەکی یان هونەرەکی ڤە هەین.
**التقنين:** دانانا یاسایێ.
**تقهقر:** د پاشدا چوو.
**التقهقر:** د پاشداچوون، پاشڤەزڤرین.
**تقهى:** ١- عەقلی دبەت. ٢- حەزا خوارنێ دبەت.
**تقوى:** بهێزکەڤت.
**التقوى:** ١- خۆ پارازتن ژ بێدلیا خودێ. ٢- ئەختوباری د عبادەتی دا. ٣- پارازتنا ئادابێت شەریعەتی. ٤- هیلانا کرنا گونەها و خۆ پارزتن ژ هەر گونەهەکێ. ٥- هێلانا هەر تشتەکی ژ بلی خودێ.
**التقوالة:** مرۆڤێ ب دەڤ و ئەزمان.
**تقور:** بوو پرتێت گوروڤر.
**تقوس:** خواربوو؛ بوو کڤان.
**التقوس:** خواربوون.
**تقوصر:** تێک حەشرین؛ ب ناڤێککەڤتن؛ چوونە تێکرا.
**تقوض(بتشديد الواو):** ١- هلوەشیا و بژالەبوو. ٢- چوو و خۆجهی و ئارامی هێلا. ٣- هەرفی؛ هلگومی.
**التقوض:** هەرفین.
**تقول(بتشديد الواو):** ١- درەوکرن. ٢- ئاخڤتن چێکرن.
**التقوية:** بهێزکرن.
**التقويس:** کڤانکرن.
**التقويض:** ١- هلکێشانا سنگا و ڤەکرنا کنفا. ٢- هەرفاندن.
**تقويم:** ١- هژمارتن و تۆمارکرن. ٢- موکمکرن.
**التقويم:** سالنامە.
**التقى:** خۆ پارازتن ژ بێدلیا خودێ.
**التقي:** تەقودار.
**التقية:** ١- خۆ پارازتن. ٢- کرنا تشتەکی نە ژ باوەری بەلکو خۆ پارازتن ژ زیانەکێ یان گەفەکێ.
**تقيح:** ١- عەداف و خوین ژێ هاتن. ٢- کێمێ گرت.
**تقيد:** ١- پێڤە گرێدا. ٢- پێگیری کر. ٣- هاتە گرێدان.
**التقيد:** خۆ پێڤە گرێدان.
**التقييد:** ١- خۆگرێدان. ٢- پێگیریکرن.

**تقیض:** ١- تیکبوو بێی کو بکەڤت. ٢- بۆ ئینا و دورستکر.
٣- شکەست.
**تقیظ:** هاڤین لێ بۆراند.
**التقیل:** نڤستن ل پشتی نیڤرۆ.
**التقیید:** گرێدان.
**التقییم:** نرخاندن، هلسەنگاندن.
**تکابر:** خۆ مەزنکر.
**التکابر:** خۆمەزنکرن.
**التکاة:** تشتێ مرۆڤ ددتە بەرخۆ یان پالا خۆ ددەتێ وەکی بالیفکێ و گۆپالی.
**التکاتب:** لێکگوهۆرینا نڤیسارا.
**تکاتب:** نامە بۆ ئێک نڤیسین.
**تکاتعا:** ل دویڤێک هاتن.
**تکاتف:** ملێت خۆ دانە ئێک.
**التکاتف:** هاریکاری و پشتەڤانی.
**تکاتکا:** ترسیا و د پاشداچوو.
**تکاثر:** ١- زێدەبوون. ٢- دانە بەرێک د خڕڤەکرنا مالێ دنیایێ دا.
**التکاثر:** زێدەبوون.
**التکاثف:** ١- تیربوون. ٢- پربوون. ٣- خڕڤەبوون.
**تکاد(تکاءد):** ب زەحمەت کەت.
**التکادم:** شەرەلەق.
**تکاذب:** درەو ل ئێکدو کرن.
**التکاذب:** درەو ل ئێککرن.
**تکاذب:** درەو لێک کرن.
**تکاره:** نەڤیانا ئێک کرن.
**تکاری:** ب کرێ دانەڤ ئێک.
**تکاسل:** خۆ تەمبەلکر.
**التکاسل:** تەمبلی؛ گران و سست بۆ د کرنا کاری دا.
**تکاشف:** ١- ئنیەت بۆ ئێک دیارکرن. ٢- کێماسیێت هندەکا بۆ هندەکا دیاربوون. ٣- یا دلێ خۆ هندەکا بۆ هندەکا دیارکر.

**التکاشف:** ١- ئنیەت دیارکرن. ٢- یا د دلێت خۆ دا بۆ ئێک دیارکرن.
**تکاشفوا:** کێماسیێت ئێک و دو دیارکرن.
**تکاظ:** لێک تەنگاڤبوون.
**التکافؤ:** هەڤکویفی؛ وەکهەڤی.
**تکافأ:** وەکی ئێک لێهاتن.
**تکافح:** ١- روی ب روی دانانە ئێک. ٢- ڤێککەڤتن.
**التکافح:** بەرهنگاری ئێک بوون.
**التکافل:** پەیوەندیەیکا بەرژەوەندیکارا هەڤپشکە دناڤبەرا دو تشتا دا وەکی یا دناڤبەرا ماسیا گوشتێ زێدە هەی و ماسیا نشتەرکار دا، ماسیا نشتەرکار گوشتێ زێدە دبڕیت ودخوت دا بذیت و ماسیا دی ژێ خلاس دبیت دا ساخ ببیت.
**تکافل:** هەڤکەفالەتی، بوونە کەفیلیت ئێک.
**التکافؤ:** هەڤکویفی.
**التکالب:** ١- دوژمناتیا ب ئاشکرایی دگەل ئێک. ٢- خۆ تێوەرکرن.
**تکالب:** دوژمیا ئێک ب ئاشکرایی کرن.
**التکالم:** هەڤپەیڤین.
**تکالما:** هەردو دگەل ئێک ئاخڤتن.
**التکالیف:** پێدڤییێت پارەی یێ ل تشتی دچن.
**التکامل:** تکۆزبوون.
**تکامل:** تەکۆزبوو.
**تکاوس:** کەتە سەرێک.
**التکاوس:** کەتنە سەرێک.
**التکاید:** نەخشەبۆئێکدانان.
**تکایلا:** بۆ ئێک پیڤان.
**تکبد:** ١- کەڤتە نیڤێ. ٢- ڤێ کەڤت. ٣- وەکی مێلاکێ لێ هات ئانکو بۆ درگ.
**تکبر:** خۆ مەزن کر.
**التکبر:** خۆمەزنکرن.

**تکبس:** ١- سەرێ خۆ کرە د کراسی دا. ٢- خۆ هاڤێتێ.
**تکبکب:** ١- کراسێ خۆ د خۆ پێچا. ٢- کۆمبوو.
**تکبل:** ١- هاتە گرێدان. ٢- هاتە زیندانکرن. ٣- هاتە گیرۆکرن.
**التکبیر:** ١- مەزنکرن وەک گەود. ٢- گۆتنا (اللـه أکبـر). ٣- مەزنگرن ب ریکا میکروسکۆبا.
**تکبیرة الإحرام:** گۆتنا (الله أکبر) یا ل بەری نڤێژێ دهێتەکرن کو نڤێژ پێ دهێتە دەستپێکرن.
**التکة:** دۆخین.
**تکتل:** بۆ کومتل.
**التکتل:** ١- کۆمبوونکاری. ٢- گومتلبوونا تشتی.
**التکتیک:** ١- ئالاڤێت دهێتە ب کارئینان ژ بۆ سەرکەفتنێ د هەر کارکی دا. ٢- هونەرێ رێکخستنا هاتنوچوونێت لەشکەری(یۆنانی) یە.
**تکثر:** ١- گەلەک برە بەرێ خۆ. ٢- مشە ژێ ئینا و بێ منەت بوو. ٣- زێدەکر.
**التکثر:** زێدەبوون.
**تکثف:** ١- خڕڤەبوو. ٢- ستویربوو. ٣- تیربوو.
**التکثف:** ١- تیربوون. ٢- خڕڤەبوون. ٣- ستویربوون.
**التکثیر:** زێدەکرن.
**التکثیف:** ١- خڕڤەکرن. ٢- ستویرکرن. ٣- تیرکرن.
**تکحل(بتشدید الحاء):** چاڤێن خۆ کلدان.
**التکحل:** چاڤکلکرن.
**التکحیل:** چاڤکلدان.
**تکدی:** ١- خازخازۆکی کر. ٢- خازخازۆکی ژ قەستا کر.
**تکدح:** ١- تیڤلی. ٢- شکەست.
**تکدد:** کەدا زێدەکر هەتا لاوازبووی.
**تکدر:** شێلیبوو.
**التکدر:** شێلیبوون.
**تکدس:** ١- سنگێ خۆ و دەرئێخست و ملێت خۆ هەژاندن ل دەمێ رێڤەچوونی. ٢- ب گرانی ب رێڤەچوو. ٣- کەتنە سەر ئێک.
**تکدی:** ١- بێخێربوو. ٢- هاتە کێمکرن. ٣- قەلسبوو. ٤- بوو باران. ٥- هاتەکورتکرن ژ سەرمایێ. ٦- فەقیربوو. ٧- نەگەهەشتە هویڤیێ.
**التکدیر:** شێلیکرن.
**تکدیس:** ل سەر ئێک کۆمکرن.
**التکذاب:** یێ گەلەک درەوا دکەت.
**تکذب:** درەو چێکر.
**التکذیب:** ب درەودەرئێخستن، درەوینکرن.
**التکرار:** دوبارە و سێبارەکرن.
**تکرب:** قەسپ ژ ناڤ تایێت دارقەسپێ یێت بری ڤێدان.
**تکریش:** تێکچوو.
**تکرثا:** زێدەبوو و کەتە سەرێک.
**تکرج:** رزی.
**تکردس:** تێکچوو و لێکخڕبوو.
**تکرر:** دووبارەبوو.
**التکرر:** دووبارەبوون.
**تکرس:** ١- هاتە ئاڤاکرن. ٢- چڕبوو و مکومبوو. ٣- ڕەقبوو و مکومبوو. ٤- کومکر و هلگرت. ٥- هاتە تەرخانکرن. ٦- بوو کۆمەکا سیستەمکری.
**تکرش:** خڕڤەبوو.
**التکرش:** خڕڤەبوون.
**تکرفس:** تێکچوو و چوو د ناڤ ئێک ڕا.
**تکرکر:** دودلبوو.
**التکرکر:** دودلبوون.
**تکرکس:** ژ سلال داگڕێلبوون خوارێ.
**التکرکس:** داگڕێلبوون.

**تكـــرم:** ١- خـــۆ ب مـــەردینیێ ئینـــا دەر. ٢- مەردینی کر.
**التكرم:** مەردینیکرن.
**التكرمة:** ١- ریزگرتن؛ قەدرگرتـن. ٢- خەلاتکرن.
**التكريـــــر:** ١- ســـــافیکرن، ژێکجوداکرنـــا ناڤـــەرۆکێ. ٢- کـــارێ ژێکڤاڤێرکرنـــا گـــازا رەش. ٣- دوبارەکرن.
**التكريس:** تەرخانکرن.
**التكريشة:** سەرۆپێ؛ پاچە.
**التكريم:** ١- رێزگرتن. ٢- خەلاتکرن.
**تكـــسب(بتشديد الســـين):** ١- قەســـتکرێ و ب دەستڤەئیـــــنا. ٢- پەیــــداکرنا رزقـــــی ب ستۆخۆڤەگرت.
**التكسب:** بدەستڤەئینان ب رێکا کاری.
**تكسر:** شکەست.
**التكسر:** شکەستن.
**تكسع:** چوو.
**تكسف:** غەییری.
**التكسف:** غەییرین.
**التكسل:** تەمبەلی.
**تكسى:** جل ل بەر خۆ کر.
**التكسى:** جل ل بەر کرن.
**التكسير:** شکاندن.
**تكشأ:** خوار هێژ یێ حشک.
**تكشر:** ددانیت خۆ قیچکرن.
**تكشط:** پرتپرتبوو و بژالەبوو.
**تكشـف(بتشديد الشين):**١- دیاربوو؛ دەرەهیبـوو. ٢- تژی عەسمانی بوو.
**التكشف:** ١- دیاربوون.
**التكشير:** قیچکرنا ددانا.
**التكشيف:** ١- ژسەرهاڤێـتن. ٢- دەرەهیکرن.
**التكعيب:** هەشتگۆشەکرن.
**التكعيبيـــة:** ســـەمتەکێ هونـــەری یـــە فۆرمێـــت ئەنـــدازی ب کاردئینـــت ژ بـــۆ دەربرینـــێ، ژ لایێ پابلۆ بیکاسۆی ڤە هاتیە دانان.
**تكفأ:** لڤی و خوار و خویل بوو.
**تكفت:** ١- تێکچوو. ٢- لەزکر.
**تكفـف:** دەســـتێ خـــۆ ل بـــەر ڤـــەکر دا خێرەکـــێ دگەل بکەن.
**تكفكف:** ١- چوو. ٢- باری؛ رست.
**تكفل:** ١- بوو کەفیل. ٢- بۆ دابینکر.
**التكفل:** کەفالـەتکرن.
**تكفن:** خۆ پێ نخاڤت.
**التكفير:** ١- ژێبرنا گونەها. ٢- کافرکرن.
**التكفؤ:** پـەحنکرنا نـانی ب هـەردو دەسـتا یـان یا هەرییێ وتشتێت دی.
**التكفين:** کفنکرن.
**التكلام:** ئاخڤتنخۆش.
**التكلان:** پشتڕاستکرن و کار تەسلیم کرن.
**التكلة:** ١- یێ چو پێ چێنەبت و پشتا خۆ ب ئێکەدی راست کەت. ٢- یێ خۆ ب هویڤیا ئێکی ڤە دهێلت.
**تكلح:** ددان قیچ بوون ژ خەم و پەشێمانییێ دا.
**التكلح:** ددانقیچبوون.
**تكلد:** گوشتێ وی ستویربوو و موکمبوو.
**تكلس:** ١- گیرهێ گرت. ٢- رەقبـوو. ٣- تێـر ئاڤ ڤەخوار.
**التكلس:** گیرهەگرتن.
**تكلع:** خرڤەبوو.
**التكلع:** خرڤەبوون.
**تكلف(بتشديد الـلام):** ١- شـەقیبوو. ٢- خـۆ راسپارد. ٢- پێڤە زەحمەت ل خۆ دا.
**التكلف:** ١- شەقیبوون. ٢- کریارا نـەیا ئاسایی. ٣- ل خۆ دیارکرنا تشتی. ٤- ئینانا تشـتی ب کوتەکی و زەحمەت وەکی هەلبەستێ.

**التكلفــــة:** ١- ســــەختی. ٢- شـــەقیبوون. ٣- بهایێ تشتی.
**تكلل:** ١- تاج ل سەر خۆ كر. ٢- پێ خەملی و جوان بوو.
**تكلم(بتشديد اللام):** ئاخفت.
**التكلم:** ئاخفتن.
**التكليس:** گێجكرن.
**التكنية:** دانان كونییێ كو دیتە ناسناڤ وەكی (أبو طـالب).
**التكلـيس:** ١- كلسـكرن. ٢- كلسـكرنا بـەری ئانكو ژێچێكرنا كلسێ ب ئاگری.
**التكليــف:** ١- زارڤــەكرنا كــارەكێ گرنــگ. ٢- ڕاسپاردن.
**التكليم:** ١- ئـاخفتنكرن. ٢- بریندارکرن.
**تكمش:** ١- تێكچوو. ٢- لەزكر.
**تكمكم:** ١- كــولاڤ كرە سەرێ خۆ. ٢- خۆ نخافت.
**تكمل:** تەكۆزبوو.
**التكمل:** تەكووزبوون.
**التكملة:** تمامەتی.
**تكمم:** ١- كراسێ خۆ د خۆ وەركر. ٢- گـرت و هەرِی لێدا. ٣- كولاڤ ل سەرێ خۆ كر.
**تكمن:** ١- خۆ ڤەشارت. ٢- خۆ ل بەر ڤەنا.
**تكمه:** ل دویڤ سەرێ خۆ چوو بێی كۆ بزانت كا دێ كیڤە چیت.
**تكمهل:** خرڤەبوو.
**تكمي(بضـم التـاء):** ١- جەكدارێ وان هاتـە كوشتن. ٢- دلگرتیبوو.
**التكميد:** گەرمكدان.
**التكميل:** تمامكرن، تەكۆزكرن.
**التكميلي:** یا تمامكرنێ.
**تكنــع:** ١- خــۆ حســاردا. ٢- خــۆ تێكبــر. ٣- پێڤەنویسیا.
**تكنى:** ١- ژ مـال نـەدەركەت. ٢- ناسناڤەك دانـا سـەر خۆ، یـان گۆت ئـەز بـابێ فلانـی مە.
**التكنيك:** ئەو هەمی ئالاڤ و ڕێكن یێت كـو پەیوەنـدی ب كـارەكی یـان هۆنـەرەكی ڤـە هەین(یۆنانی) یە.
**تكهرب:** ١- هێزا كـارەبێ تێرا دەربـاس بـوو. ٢- كارەبێ گرت.
**تكهن:** پێشبینیكر.
**التكهن:** پێشبینیكرن.
**تكوثر:** زێدەبوو و كەتە سەرێك.
**تكور:** ١- بـوو گولۆلـك. ٢- ڕۆناهیا وی چـوو. ٣- تێكهاتــەبادان. ٤- كــەت. ٥- هاتــە ئێخستن.
**تكوز:** خرڤەبوو.
**تكوس:** ١ سەروبن بوو. ٢- ل سەر سێ لنگا ب ڕێڤە چوو.
**تكون:** ١- چێبوو. ٢- هاتە چێكرن.
**التكون:** چێبوون.
**التكــوير:** ١- كــۆمكرن و كرێــدانا جلكــی. ٢- گرێدانا دەرسۆكێ.
**التكويم:** كۆمكرن.
**التكــويــن:** ١- چێكــرن. ٢- دەرئێخســـتنا هەبوونێ ژ نەبوونێ.
**التكية:** تەكیا.
**تكيس:** عاقلداری ل خۆ دیاركر.
**التكيس:** خۆ عاقلكرن.
**تكيف:** خۆ گونجاند.
**التكيف:** خۆ گونجاندن.
**التكييت:** ب ساناهیكرنا كۆزۆتا بویكێ.
**التكييف:** گونجاندن.
**تل(بتشـديد الـلام):** ١- رازانـد. ٢- ئێخستـە عەردی. ٣- دەڤ و دەڤ رازاند.
**التل:** گر.

**تلألأ:** برسقی.
**التلألؤ:** برسقین.
**تلا:** دا دویڤ، ب دویڤ کەڤت.
**تلاءم:** چێبوو.
**التلاؤم:** گونجان.
**تلاحق:** ل دویڤ ئێک هات.
**التلاحق:** ڤێکراگەهەشتن.
**تلاحقت:** ڤێرا گەهەشتن.
**تلاحم:** ١- لێکککەڤتن. ٢- پێکڤە ما.
**التلاحم:** پێکڤەحەلیان.
**تلاحى:** گازندە ژێککرن و قەسە و خەبەر گۆتنە ئێک.
**تلازب:** کەتە سەرێک.
**تلاشى:** بوو عەدەم؛ ژناڤچوو.
**التلاشى:** عەدەمبوون؛ ژناڤچوون.
**تلاطث:** دانانە ئێکدو ب تەپ و مستا.
**تلاطس:** لێکدان.
**تلاطف:** دلۆڤانی پێکبرن.
**تلاطم:** ١- ڤێککەڤتنا پێلا. ٢- لاتۆمە ل ئێکدان.
**التلاطم:** ڤێککەڤتن.
**التلاعب:** یاری پێکرن.
**تلاعب:** یاریکر.
**تلافق:** لێک گونجان.
**تلافى:** ڤێراگەهەشت.
**التلافى:** تۆلڤەکرن.
**التلافي:** ١- ڤێراگەهەشتن. ٢- نەهێلان
**التلافيف:** ١- تشتێ لێکبادایی. ٢- گیایێ لێکبادایی.
**تلاقى:** ڤێککەڤتن.
**التلاقي:** ١- ڤێککەڤتن؛ چاڤپێکەڤتن. ٢- ژ ناڤێت قیامەتێ یە.
**تلاكم:** کولملێکدان، کولمانێ.
**تلاكما:** بوکسانێ کرن.

**التلال(بالفتح):** بەرزەبوون.
**تلأم:** چێبوو.
**التلاوة:** ١- خواندن. ٢- دانەدویڤئێکا تشتی.
**تلاوموا:** لۆمەی ئێک کرن.
**تلاهى:** خۆمژویلکر.
**التلاهي:** ١- خۆمژویلکرن. ٢- ئێکدومژویلکرن.
**التلة:** ١- گر. ٢- ئێخستن؛ ل عەردیدان.
**التلب:** خوسارەتی.
**تلبث:** لێ ما.
**تلبد:** ١- چربوو. ٢- بەرێ خۆ دایێ و هزرا خۆ تێدا کر. ٣- خۆ بەردا عەردی. ٤- کۆمبوو. ٥- پێکڤە نوویسیا.
**التلبد:** ١- چربوون. ٢- لێنێرین و هزرتێکرن. ٣- خۆبەردانا سەر عەردی. ٤- کومبوون. ٥- پێکڤەنوبسان.
**تلبس:** کرە بەر خۆ.
**التلبس:** لبەرخۆکرن.
**التلبك:** تێکشێویان.
**التلبك المعوي:** نەحەلکرنا زادی.
**التلبيب:** ١- ڕاسپاردنا دلی یە بێ سخلەت و غەریزە. ٢- بەرسینگێت مرۆڤی. ٣- کرنا کارێ شەری؛ گرێدانا چەکی.
**التلبية:** ١- ب جهـ ئینانا داخوازێ. ٢- گۆتنا پەیڤا (لبیک اللهم لبیک). ٣- خۆجهبوون.
**التلبيد:** پرچتەڕکرنە ب تشتەکێ روهن دا ل دەمێ ئیحرامێ ڤژاڤژ نەبیت.
**التلبيث:** ١- هێلان. ٢- گیرۆکرن.
**التلبيس:** ١- لبەرکرنا ب کوتەکی. ٢- ڤەشارتنا راستییێ و دیارکرنا باتلی. ٣- ل بەرکرن.
**التلبين(التلبينة):** خوارنەکە ژ سڤیێ و شیری و هنگڤینی دهێتە چێکرن.
**تلثلث:** ١- ئاکنجیبوو. ٢- گیرۆکر.

**التلـشم:** ١- مـاچیکرن. ٢- کـولم لێـدان. ٣- ژێگرتن و بریندارکرن.
**تلشم:** سەروچاڤێت خۆ پێچان.
**تلجأ إليه:** ١- پشتا خۆ پێ ڕاستکر. ٢- خۆ ڤەدەرکر و دا دگەل هندەکێت دی.
**التلجئـة:** ل نـک فـەقیا ئـەوە کـو کەسـەک ب کوتـەکی بـەرێ مرۆڤـەکی ب دەتـە کرنـا کـارەکێ ژسـەرڤە و ژناڤـدایا وی نـە وەک ئێک.
**تلجف:** ١- ژ ڕەخا بەرفرەهـ کر. ٢- ڕەدمی.
**تلجلـــج:** ١- ئاخڤتـــنا خـــۆ ڤـــەجوی. ٢- د ســـەری دا هـــات و چـــوو(هزر). ٣- ئـــەزمانێ وی تێـــک ئـــالزی. ٤- دەستپێکر. ٥- د دلی دا بوو گومان.
**الـتلجلج:** ١- تێکئالزینـا ئـەزمانی ل دەمـێ ئاخڤتنێ. ٢- هاتنوچوونا هزرێ. ٣- ڤەجوینا ئاخڤتنێ. ٤- دەستپێکرن. ٥- ب گومانبوونا دلی.
**تلحظ:** تەنگبوو.
**تلحـف:** لحێـف ب سـەر خـۆ دادا، یـان خـۆ نخاڤت.
**تلحى:** لفکا دەرسۆکێ د بن حەفکا خۆ ڕا بر.
**التلحي:** برنا لفکا دەرسۆکێ د بن حەفکێ ڕا.
**التلحين:** دانانا ئاوازێ.
**التلخيص:** ١- کورتکرن. ٢- ڕۆهنکرن.
**تلد:** ١- ئاکنجیبوو. ٢- کەڤنارەبوو.
**تلدد:** ڕاست و چەپ ل دۆر خۆ زڤری.
**التلدد:** زڤرینا ڕاست و چەپ.
**تلذذ:** خۆشیبر.
**التلذذ:** خۆشیبرن.
**تلزج:** چربوو.
**التلسـكوب:** دویربینـەکا گەلـەک مەزنـە ژ بـۆ دیـتن زێرەڤانیـا سـتێرا دهێتـە بکارئینـان، یەکـەمین تلسـکوب ل سـالا (١٤٠٩) ژ لایێ ستێرناسێ ئیتالی (گالیلۆ) ڤە هاتبوو چێکرن، (یۆنانی) یە.

**تلصص:** دزی کر.
**التلصص:** دزیکرن.
**تلضى:** ئاگر بەربوویێ؛ سۆت.
**تلطخ:** ١- پێڤەما. ٢- لەوتی. ٣- بێ ڕەنـگ بوو، تێ هاتە دان.
**التلطخ:** ١- پێڤەمان. ٢- لەوتین. ٣- بێڕەنگبوون.
**تلطط:** ئینکارکر.
**التلطط:** ئینکارکرن.
**تلطع:** ددانێت وی ژ پیریێ نەمان.
**تلطـــف:** ١- ب نـــەرمی چـــوویێ. ٢- خـــۆ شکاند. ٣- خۆ دلۆڤان کر.
**التلطف:** ١- ڕەحەتی. ٢- خۆ شکاندن.
**تلطى:** خۆ گرت کا دێ کەنگی خافل بن.
**التلطيف:** خۆشکرن و ئارامکرن.
**تلظظ:** سەرێ خۆ لڤاند ژ کەربادا.
**تلظـــى:** ١- هلبـــوو. ٢- ئاریـــا و تنگـــژی. ٣- گەرما دژواربوو. ٤- لڤلڤی.
**تلـع:** ١- هـەلات؛ دەرکـەڤت. ٢- سـەرێ خـۆ دەرئێخست.
**التلعاب:** یاریکرن.
**تلعابة(تلعاب؛ لعيب؛ تلعيبة؛ ألعبان):** یـێ گەلەک یاریا دکەت.
**تلعب:** یاریکر.
**التلعة:** ١- جهێ بلند ژ عەردی. ٢- جهێ نزم ژ عەردی.
**تلعثم:** ١- دەڤێ خـۆ تێکدا. ٢- ئاخڤتنا خۆ ڤـەهێلا. ٣- تێـدا ڕاوەسـتیا و خـۆ گـرت. ٤- ئەزمانێ وی ئالزی.
**التلعـثم:** ١- دەڤتێکـدان. ٢- تێڕاوەسـتان. ٣- ئالزینا ئەزمانی.
**تلعق:** ١- دچەرت. ٢- دخۆت.
**التلعق:** چەرین.

**تلعلــع:** ١- شکەست. ٢- برسقی. ٣- دلـێ وی ئێشــا. ٤- ژ وەســتیانێ یــان ئێشــێ لاوازبوو. ٥- ڤەکیبیانا ژ تێهنا دا.
**التلعي:** خوارنا پویزکا گیای.
**التلعيب:** دانەیاریکرن.
**تلغب(بتشدید الغین):** ١- دیت یێ وەستیایە. ٢- ب ڕێڤـەبرن تــاکو وەســتیان. ٣- گەلــەک وەستاند. ٤- دەمەکێ درێژ کرە دەر.
**التلغـراف:** ١- برویسی. ٢- ئـامویرێ هنارتنا برووسـکا کـو ل سـالا (١٨٣٥)ێ ژ لایـێ زانــایێ ئــەمریکی (مــورس) ڤــە هاتیــە چێکرن.
**التلغرام:** نامەیا تلغرافی یە.
**تلغـم:** ١- د دەڤ و دفنێت خۆ دا. ٢- دەڤ و دفنێت خۆ لڤاندن.
**تلف:** مر.
**التلف:** مرن.
**التلفاز:** تەلەڤزیۆن(عەرەبکری) یە.
**تلفت:** بەرێ خۆ دا.
**تلفــح:** ١- پیریــێ ڤــەگرت. ٢- هلبــوو. ٣- بەربەلاڤبوو. ٤- د خۆ وەرکر.
**التلفزة:** دیتنا ژ دویر.
**التلفزیــون:** تــەلــەفزیۆن، ل سـالا (١٨٨٤)ێ زانــــایێ ئــــەلمانی (نیپکــــو) ئــــامویرێ ڤـەگوهازتنا شـکلا بـۆ چهێـت دویـر چێکر، پاشی ل سالا (١٩٢٤)ی هەر ب ڕیکا وی تەلــــەفزیون هاتــــە چێکــــرن و ژ ســــالا (١٩٣٠)ێ هــــەتا (١٩٤٠) پێشــــکەڤتن کـەڤتێ و ل سـالا (١٩٤٥) ب شـێوەیەکێ نـویتر و تـەکووزتر هاتـە چێکرن، و ل سالا (١٩٥٣) تەلــەفزیۆنا ڕەنگـین ل ئـەمریکا هاتە چێکرن.
**تلفظ:** ئاخڤت؛ ئاخڤتن کر.
**التلفظ:** ئاخڤتن.
**تلفف(بتشدید الفاء):** ١- پێچا. ٢- خۆپێچا. ٣- د خۆوەرکر.
**تلفف به:** ١- ڤێراگەهەشت. ٢- گونجا.
**تلفن:** ب تەلەفۆنێ ئاخفت.

**التلفــون:** تەلــەفۆن، ل ســالا (١٨٧٤) ێ ژ لایــێ زانــایێ ئــەمریکی (گراهـام بـل) ڤـە هاتیە ژێکرن.
**التلفیعة:** لفاحە.
**التلفیق:** ئاخڤتنێت چێکری، درەو.
**التلقــاء:** ١- جهــێ دیــتن و چاڤپێکــەڤتنێ. ٢- هەمبەر؛ بەرانبەر. ٣- ژخۆڕاییی.
**تلقاء:** ١- هەمبەر. ٢- بەر ب ..
**تلقائي:** ب خۆ و بێی هێج کەسەکی.
**تلقاع(تلقاعة):** ١- یێ ناسناڤا ددانیتە سەر خــەلکی. ٢- یــێ پربێــژ. ٣- بێعــەقل. ٤- یــێ ناســناڤا ددانیتــە ســەر خــەلکی. ٥- بێعەقل.
**تلقامة:** پاریمەزن.
**تلقاه:** پێشوازیا وی کر.
**تلقب:** ١- ناسناڤەک بۆ چێبوو. ٢- ناسناڤێ وی بوو...
**تلقح:** هاتە ئاڤسکرن، بەر گرت.
**تلقط:** ژ ڤێرێ و وێراهە خرکر.
**تلقف:** ب لەز گرت؛ دەستێ خۆ ب لەز لێدا.
**تلقلق:** دەنگکر.
**تلقسم:** ١- ب دلــێ خــۆ داعویــرا. ٢- زوی خوار.
**تلقن:** تێ گەهەشت، وەک خواندن وەرگرت.
**تلقی:** ١- دیت؛ چاڤ پێکەڤت. ٢- بۆ گۆت. ٣- وەرگرت.
**التلقي:** ١- دیتن. ٢- وەرگرتن.
**التلقیب:** ناسناڤلێکرن.
**التلقیــح:** ١- پـەڕینا حـەیوانی. ٢- ئاڤسبوونا گیایی. ٣- دەرزیکدانان.
**التلقیح الصناعي:** ئاڤسکرنا ب ئامویرا.
**التلقیم:** پاریدان.
**التلقیــــن:** ١- بــۆ گــۆتن، بــۆ خوانــدن. ٢- دەقەکێ شیراتە ل سەر گۆڕا د خوینن دا یێت ساخ خۆ باش بکەن.
**تلک:** ئەوا هە.

**تلكأ:** گیرۆبوو و راوەستا.
**التلم(بالفتح):** خەتا جۆتی.
**التلم(بالكسر):** ١- خولام. ٢- وراز.
٣- زێرینگر. ٣- کویرها زێرینگری.
**التلماظ:** یێ ب بەردەوامی ئەڤینێ دگەل کەسێ نەکەت.
**تلماظة:** پڕبێژ.
**تلمح:** ب دیتنەکا سڤک بەرێ خۆ داییێ.
**تلمذ:** کرە قوتابی.
**التلمذة:** خواندنا ل بەر دەستێ ئێکی.
**التلمس:** ١- دەستکرنا تشتی ئێک ل دویڤ ئێکێ. ٢- گەڕیانا ل دویڤ پێویستییێ.
**تلمظ:** ١- ب ئەزمانی ل دندکێت زادی گەڕیا.٢- مرچێن ژ دەڤێ خۆ ئینا. ٣- زوی هاڤێتە دەڤێ خۆ. ٤- ئەزمانێ خۆ دەرئێخست و د لێڤێت خۆ دا.
**التلمظ:** گێڕاندنا ئەزمانی د دەڤی دا ژ بۆ نەهێلانا بەرماکێت زادی دگەل ئالیستنا لێڤا.
**تلمع:** ١- تەیسی. ٢- دزی.
**التلمع:** تەیسین.
**تلملم:** ١- هاتە گوڕۆڤرکرن. ٢- هاتە کۆمکرن.
**التلمود:** کتێبا شەریعەت و یاسایێت وان تێدا.
**التلميح:** ١- پەیڤەکە یان ڕستەیەکە یان دەربڕینەکە هزرەکێ ل نک کەسەکی چێدکەت یان ژی ئیشارەتەکە ب وی ڕۆلی ڕادبیت. ٢- ڕێکەکا گەلەک باشە ژ بۆ تێگەهاندنا کەسەکی بێی کو دەربڕینا ئاشکرا ژێ بهێتەکرن کو دبیتە بەروڤاژی گۆتنا ئاشکرا و سۆروسۆر. ٣- د (علم البديع) دا دبیتە: ئیشارەتکرن ب ڕێکا ناڤەرۆکا ئاخڤتنێ بۆ چیرۆکەکێ یان شعرەکێ و گۆتنا هندەکێ ژێ نەهەمییێ، هەروەکی بێژی: وەکی (عاشقێ د زیندانێ دا مری) کو مەبەست مەمۆیە بێی کۆ هەمی چیرۆکا وی بێژی.
**التلميد:** گەرمکدانا جهێ ب ئێش یان وەرمتی ژ لەشی.

**التلميذ:** شاگردە؛ قوتابی.
**التلنة:** پێویست.
**تله:** هاڤێتە عەردی؛ ل عەردی درێژ کر.
**تلهب:** ئاگری گرت؛ سۆت.
**تلهبت:** گوری ژێ چوو.
**تلهف:** ب خەم کەت و ئاخینک راهێلان.
**التلهف:** ب خەمکەتن.
**تلهق:** ١- باش سپی بوو. ٢- گەلەک ئاخڤت.
**تلهى:** ١- خۆ مژویل کر. ٢- دگەل ما و ژێ ڤەنەبوو. ٣- مژویلبوو.
**التلهی:** خۆ مژویلکرن.
**التلو:** ١- یێ ب دویڤ تشتی ڤە. ٢- تێژکێ حیشترێ یێ د دویڤ ماکێ ڤە پشتی شیرڤەکرنێ.
**التلواذ:** یێت پەنا دبنە نک ئێک.
**تلوث:** هەڕمی، پیسبوو.
**التلوث:** هەڕمین.
**تلون(بتشديد الياء):** ١- هاتە ڕەنگکرن.
٢- بوو گەلەنگ ڕەنگ.
٣- ئەخلاقێ وی هاتە گوهۆڕین.
**التلون:** ١- ڕەنگگرتن.
**تلوى(بتشديد الواو):** ١- لێک هاتە بادان.
٢- خواربوو.
**التلويث:** هەڕماندن. پیسکرن.
**التلويح:** ئاماژەدان.
**التلويحات:** پەراوێز؛ زێدەهی و شرۆڤەکرنێت ل بنێ بەرپەڕێت پەرتووک و نڤیسارا.
**التلويم:** گازندکرن.
**التلوين:** ١- دانانا گەلەک ڕەنگێت خوارنێ.
٢- گوهۆڕینا ڕێبازا ئاخڤتنێ.
٣- ڕەنگکرن. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە خۆگونجاندن د گەل کاودانا.
**التلية(بالكسر):** ١- بەراهی. ٢- پاشمایی.
٣- پتری.

**التليد:** کەڤنار.
**التليدة:** ئەو ژنکە یا ل ناڤ عەجەما بوی و ل ناڤ عەرەبا هاتیە پەروەردەکرن.
**التليـــل:** ١- ســـتۆ. ٢- یـــێ ئێخســـتی؛ ل عەردیدایی.
**تلين:** نەرم دبت.
**التلين:** نەرمبوون.
**التليين:** نەرمکرن.
**تم:** تمامبوو.
**التم(بكسر التاء):** بالندەیەکێ وەکی قازێ یە بـەلێ ستویێ وێ درێژتـرە و وەکـی پیتـا (S)ێ یە و لنگێت وی دکورترن وپێت وی دمـەزنترن، ل ئـەوروپا و ئاسـیا نـاڤین و ئمریکا باکۆر و ژێریا دژیت.
**تماثل:** بەر ب باشییێ چوو مینا ساخبوونێ ژ نەساخیەکێ.
**التماثل:** ١- پێڤەچوون. ٢- وەکئێکلێهاتن.
**تماجد:** ل هەمبـەر ئێـک شانازی ب مـەزناهیا خۆ برن.
**التماجد:** شانازیبرن ب مەزناهیا خۆ.
**التمـادح:** مەدحـەکرنا هـەر ئێکـی هەمبـەر یـێ دی.
**التمارض:** خۆنەساخکرن.
**التمازح:** یارێپێککرن.
**تماحل:** دویرکەڤت.
**التماحـــل:** نـــەهاتنا بـــارانێ و هشـــکبوون و نشینبوونا گیای.
**تمـــادى:** ١- درێژکـــر. ٢- بـــوو کەرەســـتە. ١- ل سەر کار و کریاریێت خۆ ما.
**التمـــادى:** ١- درێژکـــرن. ٢- بـــەردەوامیکرن. ٣- کەرەستە بوون.
**تمار:** خورمەفرۆش.
**تمارس:** دانانەئێک.
**تمارض:** خۆ ب درەوڤە نەساخکر.
**التمارض:** خۆنەساخکرنا ب درەوڤە.
**تمارى:** گوفتوگۆکرن.
**التماري:** گۆمانژێبرن.
**تماريا:** کەتنە هەڤرکییێ.
**تمازج:** تێکهلبوو.
**تمازح:** یاری پێککرن.
**التماس(بتشـديد التـاء):** ١- ژ ئێککـرتن. ٢- چوونا نڤینا ئێک؛ کرنا کارێ سەکسی.
**تماسا:** ئێکی دەستێ خۆ کرە یێ دی.
**تماسحا:** بوونە تایەک.
**تماســک:** ١- خـۆ گـرت. ٢- خـۆ پـارازت. ٣- خۆ پێکڤە گرت.
**التماسک:** خۆ پێکڤەگرتن.
**تماشا:** دگەل چوو.
**تماشي:** دگەل ب رێڤە چوو.
**التماشي:** پێکڤەچوون.
**تماض:** لێککەڤتن.
**تماکروا:** حیلە ل ئێک کرن.
**تمالئوا:** کۆمبوون.
**تمالح:** زادێ ئیک خوارن.
**تمالک:** خۆ زەپ کر.
**التمالک:** خۆزەپکرن.
**التمام(بتثليث التاء):** یێ تەکووز.
**التمامـــة:** ١- تمـــامی. ٢- تەکـــووزی. ٣- مایی.
**تماوت:** خۆ مراند.
**التماوت:** خۆمراندن.
**تمأى:** درێژ و فرەهبوو.
**تمايح:** خوار و خویل بوو.
**تمايد:** خواربوو و هەژیا.
**التمايز:** ١- خۆ ژێک ڤەدەرکرن، ٢- خۆ ژێک ڤەدەر دیتن.
**تمايط:** ١- پەیوەندی پویچبوو. ٢- دویرکەڤت. ٣- نێزیکبوو.

**تمایل:** ١- خۆ خوارکر. ٢- خۆ مەزنکر.
**التمایل:** ١- خۆخوارکرن. ٢- خۆمەزنکرن.
**تمیل:** خۆاربوو.
**تمتع:** خۆشی بر.
**التمتع:** خۆشی برن.
**تمتی:** درێژکر.
**التمتام:** پرمپرمی.
**تمتم:** پرمپرم کر.
**التمتمة:** پرمپرم.
**التمتیع:** خۆشپێدان.
**التمتین:** قایمکرن؛ موکمکرن.
**التمثال:** ١- ب جهئینانا فەرمانا. ٢- پەیکەر.
**تمثل:** ١- مەسەلەک ئینا. ٢- نموونەیەک ئینا.
**التمثیل:** ١- زارڤەکرن. ٢- بێ سیهانەتکرنا مری وەکی بێ دفنکرن یا بێ گوهکرنا وی. ٣- نوینەراتی کرن.
**التمثیلیة:** دەقێ دراماییێ کو ب ڕیکا ئەکتەرا دهێتە زارڤەکرن.
**تمجد:** مەزنبوو.
**تمجس:** بوو ئاگرپەرێس.
**تمجع:** ل (إمتجع) بزڤرە.
**تمجمج:** ئاخڤتنا خۆ ڤەجوی.
**التمجمج:** ڤەجوینا ئاخڤتنێ.
**التمجید:** ١- مەزنکرن. ٢- مەدحەکرن.
**تمحص:** رابوو و نەما.
**تمحق:** ١- بەتالبوو و نەما. ٢- ژناڤچوو. ٣- پاکبوو.
**تمحک:** گەلەک قایش کێشا و خۆ چڕ کر.
**تمحل(بتشدید الحاء):** ١- حیلەکر. ٢- ما بێ باران و گیا لێ شین نە بوو و ما هشک.
**تمحی:** ژێ چوو، لێ نەما.
**التمحیص:** تاقیکرن.
**التمحیق:** ١- ژناڤبرن. ٢- بەتالکرن. ٣- پاککرن.
**تمخخ:** مەژی دەرئێخست.
**تمخض:** ١- بوو دەو. ٢- د مەشکێ دا شلقا؛ هاتە کییان. ٣- د زکێ دایێ دا لڤی. ٤- دەو د مەشکێ دا لڤی. ٢- بوو دەو.
**تمخط(بتشدید الخاء):** کفکر.
**التمخیض:** ١- دەوچێکرن. ٢- کیان.
**تمدح(بتشدید الدال):** پەسنێت چێکری بۆ خۆ کرن.
**تمدد:** ١- درێژبوو. ٢- ژێک هاتە دەر.
**التمدد:** درێژبوون.
**تمدر:** هاتە تەقنکرن.
**تمدل:** کەفیک هاڤێتە سەرێ خۆ.
**تمدن:** ١- بوو باژێری. ٢- ڕەقی و توندی هێلا بۆ مرۆڤەکێ نەرم و باش.
**التمدن:** شارستانیەت، ئاڤاکرن.
**التمدیح:** بەسنکرن.
**التمدید:** درێژکرن.
**تمذر:** مەرقی.
**تمذع:** پیچ پیچە ڤەخوار.
**التمر:** خورمە.
**التمر الهندي:** تەمەهندی، بەرهەمێ دارەکا مەزنە ل هندستانێ و باهرا پتر ژ وەلاتێ گەرم شین دبتن فێقیێ وێ ژ بۆ زکچوونێ دهێتە ب کارئینان و قورمێ ژ بۆ زکراوەستاندنێ و کولیلکێت وێ ژ بۆ چارەکرنا ئاریانا میلاکێ و دارێ وێ گەلەک یێ باشە ژ بۆ دارتاشیێ.
**تمرأ:** بۆ خودان وجدان.
**التمراحة:** ١- یێ گەلەک سڤک و چەلەنگ. ٢- یێ گەلەک ب یاری و تورانە و بزاڤ.
**التمراد:** بورجێ کۆترا.

**تمـرد:** ١- دەمـەكی مـا حـەوێس. ٢- خـۆ نەقولـەكر. ٣- پشـتەرێبـوو. ٤- ژ هەڤـالێـت خۆ زیدەكر. ٥- خۆمەزنكر.
**التمـرد:** ١- پشتەرێبـوون. ٢- خۆنـەقولوكرن. ٣- خۆمەزنكرن.
**تمرس:** ١- خۆ تێ هوسی. ٢- خۆ ب سەربۆرا شـارزا كـر. ٣- خـۆ تێڤـەدا. ٤- تێـدا. ٥- بەرهنگاری وی بـوو. ٦- یـاری پێكرن. ٧- ب سەری هات.
**التمرض:** تیمارکاری.
**تمـرض:** ١- د کاروبارێـت خـۆ دا لاوازبـوو. ٢- نەساخبوو.
**تمرط:** وەریا.
**تمرع:** قەستا گیای و شینكاتیێ كر.
**تمـرغ:** ١- تفـا خـۆ ڕەشـاند. ٢- گەڤزانـد. ٣- خـۆ قولپانـد ژ ئێشـا زکـێ خـۆ. ٤- گەلـەک لـێ مـا. ٥- د ئـاخـێ ڤـەدا. ٦- خۆ د ئاخێ گەڤزاند.
**التمرغ:** ١- دئاخێڤەدان. ٢- قەلوپاندن.
**تمرق:** هاتەدەر.
**تمركز:** ل مەلبەندی ڕاوەستا.
**تمرمر:** ١- تێکچـوو و ئاریا. ٢- هلهەژیا.
**التمرمر:** ١- هەژیان؛ لەرزین. ٢- ئاریان.
**تمرن(بتشديدالراء):** ڕاهینان كرن.
**تمرن:** ڕاهینان كرن؛ خۆ مەشق كر.
**التمريد:** حولیكرن.
**التمريش:** بارانا كێم.
**التمريض:** جاركرنا نەساخا ل خەستەخانێ.
**التمرين:** مەشقكرن.
**تمزر(بالتشديد):** پیچ پیچە تامكرێ.
**تمزق:** دڕها.
**التمزق:** دڕیان.
**تمزمز:** لڤی.
**تمزن:** ١- چوو. ٢- باشی ژ خۆ زیدە دیاركر. ٣- ڕاهینان كر.
**التمزيق:** دڕاندن.
**تمس:** حولیبوو.
**التمساح:** تمساح.
**تمسح:** ١- پاڤژكر. ٢- تێـدا. ٣- تەوافكر.
**تمسخ(بتشديد السين):** پچیا.
**تمسخر:** توڕانكرن.
**تمسـک بـه:** ١- خـۆ پـێ پـارازت. ٢- خـۆ پێڤەگرت.
**تمسـک:** ١- خۆ پێڤـەگرت. ٢- بـاش گـرت ل سەر چوو.
**التمسک:** پێڤەگرتن.
**تمسكن:** ئارمبوو.
**التمسكن:** ئارامبوون.
**التمسيح:** دەستێدان.
**التمسيد:** پەرخاندن.
**تمشى:** بریڤەچوو.
**التمشاء:** بریڤەچوون.
**التمشية:** بریڤەچوون.
**تمشر:** ١- زەنگینبوو. ٢- نیشانێت زەنگینیێ لێ دیاربوون. ٣- بۆ شۆلـكر. ٤- جلـک كرنە بەرخۆ. ٥- پویزیک لێ هاتن.
**تمشش:** مێهت و یێ تێدا گێشا.
**تمشق:** ١- تیڤلی ٢- دڕها. ٣- چوو.
**تمشى:** ب ڕێڤەچوو.
**التمشية:** ب ڕێڤەبرن.
**التمشيط:** شەكرن.
**تمصر:** بوو باژێری.
**التمصـمص:** مێهتنـا ب ئـارامی ب ڕەخـێ ئەزمانی.
**تمضى:** بۆری.
**تمضمض:** ئاڤ د دەڤێ خۆ وەردا.
**تمط:** درێژ دبت.

**تمطى:** ١- ژێکهاتەدەری و درێژبوو. ٢- چوونەکا درێژ کر. ٣- دەستێت خۆ ڤەهەژاندن و خۆ مەزنکر. ٤- درێژکر و بەرفرەهکر.

**التمطي:** ١- خۆمەزنکرن و هەژاندنا دەستا ل دەمێ رێڤەچوونێ. ٢- درێژبوون.

**تمطر:** ١- کەتە بەر بارانێ. ٢- داخوازا بارانێ کر. ٣- رژیا خوارێ(بالندە). ٤- لەزکر.

**تمطر:** ١- ب لەز چوو؛ سڤک چوو. ٢- باران باراند؛ باراند.

**تمطط:** ١- ژێک هاتە دەر. ٢- درێژبوو.

**تمطمط:** تیربوو.

**تمعدد:** ١- مەزن بوو و تۆلازی لێ نەما. ٢- ساخبوو. ٣- قەلەوبوو.

**التمعدد:** مەزنبوون و گربوون.

**تمعط(بتشدید العین):** موییێت وی ژ ئێشەکێ کەڤتن.

**تمعن:** ١- باش هزرا خۆ تێدا کر. ٢- رەزیلبوو و کێمبوو. ٣- خۆ کێمکر و بچویک دانا.

**تمغص:** زکئێشییێ گرت.

**تمغنط:** بوو مەغناتیس.

**تمقت:** ل بەر رەشبوو.

**تمكى:** ژ خوهێ تەربوو.

**تمكث:** ١- ما و خۆ ل هیڤییێ گرت. ٢- خۆجهبوو.

**تمكن(بالتشديد):** ١- بوو خودان پلە و دەستهەلاتداری. ٢- پێ وی جهێ خۆ گرت. ٣- شیا؛ پێچێبوو.

**التمكن:** ١- شیان. ٢- جهگرتن. ٣- پێچێبوون. ٤- پلەداربوون.

**التمكين:** ١- شیاندن. ٢- خۆجهکرن. ٣- بلندکرن و پلەدارکرن.

**تملح:** خوێ دگەل خۆ بر.

**تملس(بتشدید اللام):** ١- حولیبوو. ٢- دەرکەت. ٣- هشیاربوو. ٤- ڤەرەست و رزگاربوو.

**تملص(بتشدید اللام):** ١- خۆ ڤەرەستاند ژ تشتی. ٢- ڤەرەست؛ قورتالبوو.

**التملص:** ڤەرستن و رەهابوون.

**تملط:** حولیبوو.

**تملق(بتشدید اللام):** ١- خۆ دەڤخۆشکر. ٢- دەڤخۆشی بۆ کرن، خۆ بۆ حولیسک و بلیسک کر.

**تملك(بتشدید اللام):** ١- ب خورتی کرە ملکێ خۆ. ٢- بوو خودان. ٣- بوو شاه.

**التملك:** ١- خودانبوون. ٢- بوونا شاه.

**تملل:** ١- خۆ ژ خەما دا قولپان. ٢- لڤی.

**الملل:** ١- لڤین. ٢- خۆقولپاندن.

**تململ:** ١- خۆ ل سەر جهێ قولپاند ژ خەمادا یان ژ بەر تشتەکێ دی. ٢- لڤی.

**التململ:**١- لڤین. ٢- خۆ قولپاندن.

**التمليح:** ١- خوویکرن. ٢- شرینکرن.

**التمليد:** نرمکرن.

**التمليط:** ١- کورتانەکرن؛ لەبخکرن. ٢- د عەرووزێ دا ئەوە کو شاعرەک نیڤماکێ بێژیت و شاعرێ دی نیڤمالکا دی ئانکو تمام بکەت.

**التمليك:** کرنە خودان.

**التمليل:** نەرحەتکرن.

**تمم:** تمامکر.

**تمنى:** ١- هیڤی خوازت؛ ڤیا؛ حەزکر. ٢- ژ بنێ پێ خۆ چێکر. ٣- خواند.

**التمن:** برنج.

**تمنطق:** ١- (علم المنطق) خواند. ٢- قاویش ل پشتا خۆ گرێدا.

**تمنع:** ١- ژێ گەریا. ٢- بۆ خۆ کرە پشتەڤان. ٣- خۆ پی ب هێز ئێخست. ٤- خۆ پێ پاراست؛ بۆ خۆ کرە پێژان. ٥- بهێزکەڤت.

**التمنع:** ١- بهێزکەفتن. ٢- ئاسێبوون.

**تمنن:** منەت لێ کر.
**التمني:** هویڤیوخازتن.
**التمنیع:** ١- بهێزئێخستن. ٢- ئاسیکرن.
**تمهد:** ب ساناهیکەت.
**تمهر:** ١- شارەزابوو. ٢- مەلەڤانی کرن.
**تمهل:** بێهنا خۆ فرەهـ کر.
**تمهل:** دەرفەتێ بدە.
**التمهید:** ١- رێخۆشکرن. ٢- چێکرن و دورستکرن. ٣- ب ساناهیکرن.
**التمهیل:** موهلەتپێدان.
**تموج:** کەتە پێلا.
**التموج:** بپێلکەڤتن.
**تمور:** هەر هات و چوو.
**تموز:** مەها تیرمەهێ یە کو دبیتە یا حەفتێ.
**تمول(بتشدید الواو):** ١- بوو خودان مال. ٢- خۆ ب مال ئێخست.
**تمون(بالتشدید):** خۆ ب ئەرزاق ئێخست.
**تموه(بالتشدید):** ١- ئاڤ ڤەخوار. ٢- ئاڤ تێدا خڕبوو. ٣- ئاڤ رژیاییێ. ٤- هاتە تێکهەلکرن. ٥- هاتە سەڤاکرن. ٦- هاتە بارین. ٧- تژی ئاڤبوو و نێزیکبوو ب گەهت.
**التمویل:** ١- ب مال ئێخستن. ٢- ب چەک و جەبلخانە و پێدڤی ئێخستن.
**التموین:** ١- پێشکێشکرنا کەلوپەلێ پێدڤی نەخاسمە.
**التمویه:** ١- تامدانا تشتی ب کانەکی. ٢- کراسکرن. ٣- ڤەشارتنا چەکێ لەشکەری دا دوژمن ڤێ نەکەڤت (کامفولاج). ٤- گوهۆڕینا رەنگێ ئامیریت جەنگی ب شێوەیەکی کو دوژمن نەنیاسیت. ٥- ڤەشارتنا تشتی ب تشتەکێ دی دا نەهێتە نیاسین.
**تمیح:** ١- ب مەزناهی ب رێڤەچوو. ٢- خۆ راست و چەپ خوار و خویلکر.
**تمید:** خواروخویلبوو.
**تمید:** دلەرزیت و دلڤیت.
**التمیز:** جاوازی؛ جوداهی؛ ڤەدەی.
**تمیز:** ڤەدەربوو.
**تمیس:** ١- خواروخویلبوو. ٢- ب مەزناهی ب رێڤەچوو و خۆ خوار و خویلکر.
**تمیع:** حەلیا.
**التمیع:** حەلیان.
**التمیم:** ١- یێ خولقەت تمام. ٢- یێ دژوار.
**التمیمة:** ١- نڤشتی. ٢- بازبەند، ٣- هەر تشتەکێ ب خۆ ڤەدکەن ژ بۆ پارازتنا خۆ.
**التمییز:** ١- ڤەدەرکرن. ٢- هێزەکا دەروونی یە پێ رامان دهێنە پەیداکرن. ٣- ئەو دەمە ژ ژیێ مرۆڤی یێ لێ دشێت باشیێ و خرابیێ ژیک ڤەدەر بکەت.
**تمییز:** ژێک ڤەدەر کرن، ژێک جوداکرن.
**التمییع:** حەلاندن.
**التمییل:** خوارکرن.
**التن:** هەڤکویف.
**التناوش:** خۆ گیروکرن و دویرکرن.
**تناءی:** دویرکەڤت.
**التنائی:** دویرکەڤت.
**تنابث:** لێ ڤەکۆلا و گەریا.
**التنابذ:** دوژمناتی ژێک هلگرتن.
**تنابزوا:** ناسناڤێت کرێت دانانە سەر ئێکودو.
**التناتج:** زێدەبوون ب بوونێ.
**تناتف(تنتف):** هاتە هلکیشان یان ڤەرِوچاندن.
**تناتل:** د بەر ئێک دا بلندبوون.
**تناث:** بەلاڤکر.
**تناثر:** پێوەربوو.
**التناثر:** وەریان.

**تناجي:** ئاخڤت.
**التناجز:** چوونا مەیدانێ و لێکدان.
**التناجش:** ل سەر ئێک زێدەکرنا بهایێ تشتی.
**التنازع:** ب هەڤرکچوون.
**تنازل:** داگێرا.
**التنازل:** داگیران.
**تناجل:** ١- دویندەهـ زێدەکرن. ٢- لێککەڤتن.
**التناجي:** ئاخڤتنا دگەل ئێک ب دزیکی ڤە یان ب دەنگەکێ نزم.
**التناجي:** هەڤپەیڤین.
**التناحب:** بلندکرنا دەنگێ گری.
**تناحب:** ژڤانەکێ دەستنیشانکری بۆ شەڕی دانە ئێک.
**تناحر:** ١- حەفکا ئێک گرتن. ٢- کەتنە دویڤ ئێک.
**تناحر:** ئێکدوکوشتن.
**تنادى:** گازیکرنەئێک.
**التناد:** ڕەڤین و ڕاتەقیان.
**تنادم:** پێکڤە روینشتن.
**التنادي:** ١- بژالبوون و ب چۆلا کەڤتن. ٢- ژ ناڤێت رۆژا قیامەتێ یە. ٣- لێکگازیکرن.
**تناذر:** ئێکدو هۆشدارکرن.
**تنازح:** دویرکەڤت.
**التنازع:** لێککەڤتن.
**تنازع:** لێککەڤتن؛ پێکراچوون.
**تنازل:** ١- چوونە مەیدانێ ژ بۆ شەڕی. ٢- جار ل نک ڤی خوارن جار ل نک وێهە. ٣- داگێران ژ هەلویستێ خۆ کر یان ژ هەر تشتەکێ دی.
**التنازل:** داگێران.
**تناسب:** گونجا.
**التناسب:** ١- گونجان. ٢- خزمانی.

**تناسخ:** ١- کەتنە دویڤ ئێک. ٢- ئێک ل دویڤ ئێکی چوون.
**التناسخ:** ١- جوونا تشتی ژ جهەکی بوو جهەکی. ٢- چوونا ڕحێ پشتی مرنێ ژ لەشەکی بۆ لەشەکێ دی.
**تناسخ الأرواح:** ئەو باوەریا ئایینی یە یاکو هندەکا هەی کۆ پشتی مرنێ ڕحا مرۆڤی دچیتە د لەشەکێ دی دا، ئەڤجا ئەگەر یێ چاک بیت دێ ڕحا وی چیتە د لەشەکێ چاک دا و ئەگەر یێ خراب بیت دێ چیتە د لەشێ حەیوانەکی دا.
**تناسخ الأزمنة والقرون:** ل دویڤ ئێک هاتنا دەمێ و بەتالکرنا حوکمێ ئێک دو ئانکو دەمێ بهێت حوکمێ دەمێ چوویی بەتال دکەت و حوکمێ خۆ دسەپینت.
**التناسخية:** ئەون یێت باوەریێ ب (التناسخ) دئینن.
**تناسق(تنسق؛ إنتسق):** پێکڤە هاتنە ڕیکخستن.
**التناسق:** رێکخستن، سیستەمکرن.
**التناسل:** دویندەهەدان، دویندەهـ ب دویڤ کەفتن.
**تناسلوا:** عەیال بوون و زێدەبوون.
**تناسى:** ژ بیرا خۆ بر.
**التناسي:** ژبیرکرنا ئێکدو.
**تناشب:** تیر تێک وەرکرن.
**التناشد:** هەلبەست بۆ ئێک خواندن.
**تناشدوا:** ئێکدو گرتن و بوونە هەڤکار.
**التناشير:** خەتێت زارۆکێت قوتابخانا؛ سەرمەشقێت نڤیسینێت زارۆکا.
**التناص:** قرژین.
**تناصى:** قرژی.
**التناصب:** دوژمناتی ژێک هلگرتن.
**تناصبوا:** ل خۆ لێکڤەکرن.

**التناصر:** ب سەرئێخستنا ئێکودو.
**تناصر:** پشتەڤانیا ئێک کرن.
**تناصروا:** ١- هاریکاریا ئێک ژ بۆ سەرکەڤتنێ کرن. ٢- پشتەڤانیا ئێک کرن.
**تناصف:** هەر ئێکی حەقێ یێ دی دایێ.
**التناصف:** لێکڤەکرنا ب نیڤی.
**التناصل:** شیر لێک دان.
**التناصي:** ١- د ناڤچاڤکێت ئێکدو ڕا گرتن. ٢- تێک ئالزین و پێکڤەمان.
**التناصیب:** کێلک و نیشانێت رێکێ.
**التناضل:** ١- ئارمانجانێ. ٢- ژ پێش ئێکڤە ئاخڤتن. ٣- شانازی ل هەمبەر ئێک ب خۆ برن.
٤- بەریکانێ د خەباتێ دا کرن.
**التناطح:** قۆچ لێک دان.
**تناطح:** قۆچانێ کرن؛ دانانە ئێکدو ب قۆچا.
**تناطی:** ١- بەریکانێ کرن. ٢- دانوستاندن کرن.
**تناظر:** ١- کەتنە بەرانبەری ئێک. ٢- ئێکی بەرێ خۆ دا یێ دی. ٣- قاویش کێشان.
**التناظر:** ١- قاویشکیشان. ٢- بەرانبەرئێکبوون.
**تناظم:** ب دەرزی ڤە هاتە ڤەکرن.
**تناعس:** ١- خەوا وی هات. ٢- سستبوو.
٣- رەواج تێ نەما.
**التناعي:** ١- گەهاندنا جابێت مرنێ یان کوشتنێ بۆ ئێک دو ژ بۆ تۆلڤەکرنێ. ٢- ژێکڤەبوون و بەلاڤبوون. ٣- کەتنا دویڤێک. ٤- کەتنا پیشییێ. ٥- بەردەوامی پێدان.
**تنافذ:** گەهەشتێ.
**تنافر:** ژێک ڤەرەڤی..
**التنافر:** ژێک ڤەرەڤین.
**التنافس:** ١- ململانێ. ٢- خۆ ب ئەرزاق ئێخست.
**تنافس:** هەڤڕکیا ئێک کرن.
**تنافط:** کەف ژێ دەرکەڤت.
**تنافی:** ١- ئێکدو پالدان و دلێ وان ژێک ما. ٢- دوبەرەکی کەتە ناڤبەینێ و ژێک دویرکەڤتن.
**التنافي:** ١- دەرئێخستن. ٢- هاڤێتن. ٣- رەتکرن.
**تناقد:** یێ زەغەل ژێگرت.
**تناقص:** ١- پیچ پیچە کێمبوو. ٢- ل کێمیێ دا.
**تناقض:** ١- ژرۆڤەبوو. ٢- لێڤەبوو.
**التناقض:** هەڤدژی.
**تناقل:** ژێکڤەگوهازتن.
**التناقل:** ڤەگوهازتن.
**تناکث:** سۆز شکاند؛ ژ سۆزا خۆ لێڤەبوو.
**التناکث:** لێڤەبوون ژ سۆز و پەیمانا.
**تناکح:** ١- شوی ب ئێک کرن. ٢- خۆ دانە دگەل ئێک.
**تناکحا:** ژن دانە ئێک.
**تناکر:** خۆ پێک نەئینانەدەر.
**تناهب:** ١- هەر ئێکی ڤیا د بەری هەڤالێ خۆ ڕاکەت. ٢- گەلەک ئاخ ب لنگێت خۆ ڤە برن.
**تناهد:** ١- هندێ ئێک پارە دەرئێخستن. ٢- د ناڤبەرا خۆ دا خوارن.
**تناهزا:** دەستپێکرن.
**التناهض:** لێکڕابوون.
**تناهض:** ڕابوونەئێک.
**تناهق:** لێک زڕین.
**تناهی:** ١- نەکر. ٢- گەهەشتە دویماهیێ. ٣- راوەستا. ٤- بەسکر. ٥- گەهاند. ٦- شیرەت ل هەڤکرن.
**التناهي:** دانەپاشا ئێک ژ خرابیێ.
**تناوب:** ١- پشک هاڤێتنێ. ٢- کرنە گەهگەهانێ. ٣- ب سەری هاتن.

**التناوب:** دۆردۆرانێکرن.
**التناوح:** ١- ب هێز هات(هور). ٢- کەڤتنە هەمبەری ئێک.
**تناوش:** ١- دەستهاڤێتێ. ٢- دانانەئێک.
**التناوش:** ١- وەرگرتن. ٢- دانەڤێ.
**تناول:** دەست هاڤێتێ.
**التناول:** وەرگرتن.
**تناوم:** خۆ د خەو بر.
**التناوم:** خۆدخەوبرن.
**تنأى:** دویرکەڤت.
**التنبؤ:** پیشبینیکرن.
**تنبأ:** پێشبینی کر.
**تنبت:** دیاربوو.
**تنبط:** ئاڤا وێ دەرئێخست.
**تنبع:** پیچ پیچە هات.
**تنبل:** ١- خۆە وەکی ماقویلا لێکر. ٢- بۆ ماقویل. ٣- مر. ٤- باشێ وی بر.
**التنبل:** کوندلک؛ بژنکورت(ترکی) یە.
**تنبه:** ١- هشیاربوو. ٢- بێ حەسیا.
**التنبه:** هشیاربوون.
**التنبيت:** ١- شینبوون. ٢- کەزاختن.
**التنبيه:** ١- ئاگەهدارکرن. ٢- هشیارکرن.
**تنجج(بتشديد الجيم):** داخوازا ب جهێینانێ ژ وی کر یێ ژڤانێ وێ داییێ.
**تنجد:** بلندبوو.
**التنجد:** بلندبوون.
**تنجز:** ١- داخوازا ب دویماهیئینانێ کر. ٢- بەرەوامی پێدا.
**تنجس:** پیسبوو.
**التنجس:** پیسبوون.
**التنجستن(ولگرام):** کانەکێ رەنک خولی یە، ژ بۆ چیکرنا گولۆپا و هندەک جۆرێت پیلای دهێتە ب کارئینان.
**تنجم:** پێشبینی ب ستێرا کر.

**التنجم:** کارێ پێشبینیا ب ستێرا.
**التنجيز:** ئەداکرن.
**التنجيس:** پیسکرن.
**التنجيم:** خێڤزانکیا ب ستێرا؛ کارێ پێشبینیا ب ستێرا.
**تنحس:** رەشبینیکر.
**التنحنح:** ئحئحکرن.
**تنحنح:** دەنگێ کوخکی ژ خۆ ئینا.
**تنحى:** ١- خۆ داپاش. ٢- ل دویڤ رێزمانێ ئاخڤت.
**التنحية:** ڤەدان؛ دویرکرن.
**التنحيس:** تامدان یان کراسکرن ب سفری.
**تنخع:** کفکر.
**تنخل:** مۆخل و بێژینگ کر ئانکو یێ ژ هەمییێ باشتر ژێ گرت.
**تنخله:** یێ ژ هەمییێ باشتر ژێ گرت.
**تندح:** بەلاڤبوو و بژالەبوو.
**تندل(بتشديد الدال):** ١- دەستمال د خۆ دا. ٢- دەستمال د سەێ خۆ ئالاند.
**تندم:** پەشێمانبوو.
**تندى(بالتشديد):** ١- خۆ مەردکر. ٢- ڤەخوار هەتا تێربووی. ٣- شلبوو.
**تنزح:** ١- ژ جهێ خۆ دویرکەت. ٢- دویرکەت.
**تنزر:** کێمبوو.
**تنزع:** لەزکر.
**تنزق:** دانایێ هەتا خۆ هلاڤێتی.
**تنزل(بتشديد الزاء):** ١- ب دلێ خۆ هاتە خوار. ٢- پیچ پیچە هاتە خوار. ٣- داگێرا.
**التنزل:** هاتنەخوارا پیچپیچە.
**تنزه:** ١- دەرکەتە سەیرانێ. ٢- خۆ ژ ئاڤ و بیستانا دویرکر. ٣- خو ژ کێماسیێ دویرکر. ٤- سەیرانکر. ٥- ژ هەر کێماسیەکێ پێ بەهر بوو.

**تنزى:** لەزكر.
**التنزيــــــل:** ١- ئينـانەخوارا قورئـانێ يـا ل دويڤ پێدڤيبوونێ. ٢- رێكوپێككرن.
**التنزيه:** پاكرنا ژ عەيب و قوسيرى يا.
**التنساس:** هاژۆتنا توند.
**تنسب:** خۆ كرە مرۆڤێ ئێكى.
**تنسـف:** دەسـتێ خـۆ ل هـەڤالێ خـۆ دا و ل عەردى دا.
**تنسق:** ل دوڤ سيستەمەكى ريكوپێك بوو.
**تنســـك:** ١- دنيـــا بـــەردا و عبـــادەتكر؛ ٢- عبادەتكر.
**التنسک:** ١- بەردانا دنيايێ و گرتنا ئاخرەتێ. ٢- عبادەتكرن.
**تنسم:** ١- ئارامبوو. ٢- بێهنا خۆ هەلكێشا. ٣- بێهن كەتێ. ٤- گرت. ٥- ب ئارامى وەرگرت.
**التنســـــيق:** ١- رێكخســـــتن. ٢- ئێـــــك سيسـتەمكرن. ٣- ب دويـڤ ئێكڤـە كـرن. ٤- د (علم البديع) دا دبيتـە: دانـەدويڤێكا سالوخەتا بێى پيتا (و) وەكى بێژى: (الله الملـک القـدوس السـلام الـؤمن المهـيمن العزيز الجبار المتكبر).
**التنـشئة:** ١- پێـگەهاندن. ٢- مـەزنبوون.
**تنشأ:** رابوو و چوو.
**تنشب:** پێڤەما.
**تنشد(بتشديد الشين):** ڤيا خەلک بزانن.
**تنشـط:** ١- بـزاڤ كـەڤتێ و ژ جهـەكى چـوو چهەكى. ٢- بزاڤ كەتێ و خۆ بۆ ئامادەكر.
**تنشـف:** ١- ژ ئـاڤێ يـان خـوهێ هشـكبوو. ٢- مێهت.
**تنــشق:** ١- كـرە دفـنا خـۆ. ٢- بێهنكـرێ. ٣- بێهنا خۆ هلكێشا.
**التنشيط:** چەلەككرن.
**التنشيف:** هشككرن.

**تنصـب:** ١- هاتـە ڤـەنان. ٢- هاتـە راوەسـتاندن. ٣- بـــوو بـــەرپرس. ٤- هاتـــە ديـــاركرن. ٥- دوژمنـاتى هاتـە كـرن. ٦- هاتـە ئێشانـد. ٧- هاتە چاندن. ٨- هاتە دانان. ٩- بلندبوو.
**تنصـت:** خـۆ وەكـى وان لێكـر يـێ گـوهێ خـۆ ددەنە ئاخڤتنا.
**التنصت:** گوهراگرتن؛ گوهدان.
**تنصـح:** ١- خـۆ وەكـى شـيرەتكەرا لێكـر. ٢- شيرەت زێدەكرن.
**تنصر:** بوو فەلە.
**التنصر:** فەلەبوون.
**تنصـف:** ١- نيـڤ بـر. ٢- داخـوازا عەدالـەتێ ژێكر. ٣- تـۆلا خـۆ ژێڤـەكر. ٤- خزمـەتكر. ٥- خـــۆ چەمانـــد. ٦- ب كارئينـــا. ٧- داخوازا قەنجيێ كر.
**تنصل:** ١- ژ كارى يـان گونـەهێ خـۆ بەريكـر. ٢- دەرئێخـست. ٣- هلبـژارت. ٤- هـەمى تشت دگەل خۆ برن. ٥- دەركـەڤت. ٦- خـۆ ژێ بەرى كر.
**تنصى:** ١- ناڤچاڤـكا خۆ بـەردا. ٢- باشـترين ژنک مار كر.
**التنصيب:** دامەزراندن؛ پلەداركرن.
**التنصير:** فەلەكرن.
**التنصيص:** ١- دەقداركرن. ٢- رۆهنكرن.
**التنصيف:** ب نيڤيكرنا تشتى.
**التنضاح:** خوهـ.
**تنضـــح:** ١- رونـــدک ژێ رژيـــان. ٢- ژێ خلاسبوو.
**تنضد:** رێزبوو.
**تنضل:** دەرئێخست.
**تنضـــنض:** ١- پيچپيچـــە ژێ ســـتاند. ٢- قەتاند. ٣- هشاركر.
**التنضيب:** جۆرەكێ دارايە تايێت وێ د مـەزن و سپى نە، يا شكل هشكە، ستريێت پێڤە د قـوتن، جانـەوەرێ حـەرباء ل سـەر دهێتـە ديتن.

**التنضید:** ل سەرئێکدانان.
**التنضیر:** جوان و شرینکرن.
**التـنطس:** شویشـتن و ڤەشویشـتنا زێـدەی پێدڤی.
**تنطع:** ب کویری چوویێ.
**التنطع:** هزرکرنا ب کویری.
**التنطق:** ئاخاڤتن.
**تنظر:** ١- بەرێ خۆ دایێ. ٢- خۆ ل هویڤیێ گرت.
**تنظر:** هزرا خۆ تێدا کر.
**تنظف:** پاقژبوو.
**التنظیر:** بەرئاوردەکرن.
**التنظیف:** پاقژکرن.
**التنظیم:** رێکخستن.
**التنعاب:** قرقرکرن.
**تنعت:** سالوخەت دا.
**تنعل:** شمک ل پێی کر.
**التنعل:** شمکلپێکرن.
**تنعم:** خۆشیبر.
**التنعم:** خۆشیبرن.
**التنعیم:** خۆشیپێدان.
**تنغص:** تەعلبوو، نەخۆشبوو. ٢- د حەفکێ را ما.
**تنغض:** لڤی.
**تنغم:** ئاخڤتنەکا نازک کر.
**التنغـیص:** ١- شـێلیکرن. ٢- تـەعلکرن. ٣- نەخۆشکرن. ٤- د حەفکێراهێلان.
**تنفخ:** پوفبوو.
**التنفخ:** پوفبوون.
**تنفذ:** تێبەهی.
**التنفذ:** تێبەهین.
**تنفر:** ١- رەڤی. ٢- ڤەجنقی.
**تنفـس:** ١- هەناسـەک کێشـا. ٢- کفشـبوو (سپێدە).

**التنفس:** ١- هەناسەکێشان. ٢- کفشبوون.
**تـنفش:** ١- پـەرێت خـۆ ئینانـەدەر (بالـندە). ٢- هریا خۆ ڤەچری. ٣- موییێت خۆ قژکرن.
**تنفض:** داقوتا.
**تنفط:** ١- پەقلک لێهاتـن. ٢- تنگژی.
**تنفـق:** ١- ژ کونـا خـۆ دەرکـەت. ٢- چـوو د کونا خۆ ڤە.
**تنفـل:** ١- نڤێـژا سونەت کـر. ٢- کەلـەپوبرت پتر ژ باهرا خۆ وەرگرت. ٣- داخوازکر.
**التنفل:** کارکرنا ژخۆرایی.
**التنفیذ:** ب جهئینان.
**التنفـیس:** ١- بـا ژێبـەردارن؛ فشـاندن. ٢- سسـتکرنا گرانیـا خـەم و کۆڤانـا ژ سـەر نەفسێ.
**التنفیش:** ڤەچرین.
**التنفیض:** داقوتان.
**تنقی:** ژێگرت.
**تنقاد:** پارەگوهۆریکر.
**تنقـب:** ١- پێچـە بـەردا سـەر دێمـێ خـۆ. ٢- گەلەک لێگەریا.
**تنقح:** کێمبوو.
**تنقص:** کێمکر.
**تنقض:** هلوەشیا.
**تنقط:** خال کەڤتنێ.
**تنقل:** ١- ڤەگوهازتنا خۆ ژ جهـەک بۆ جهـەکی زێدەکر. ٢- مزە خوار.
**التنقل:** ڤەگوهازتن.
**التنقی:** ژێگرتن.
**التنقیب:** ١- کونکرن. ٢- لێگەریان. ٣- گـەریان ژ بـۆ دیتنـا رێکـەکا رەڤینـێ. ٤- لێگەریان د زکێ عـەردی دا ژ بۆ دیتنا کانا یان شوینوارا.
**التنقیة:** ١- پاقژکرن. ٢- زەلالکرن.

**التنقـيح:** ١- پـاقژکرن ژ تشـتێ خـراب. ٢- کورتکرنـا ئـاخڤتنێ دگـەل رۆهنکرنـا رامانێ.

**التنقيد:** ڕەخنەگرتن.

**التنقيص:** کێمکرن.

**التنقيط:** ١- خالبەندی. ٢- خاللێدان.

**التنقيل:** پنیکرن.

**تنكب(بتشديد الكاف):** ١- ژ رێ دەرکەڤت. ٢- خـۆ ڤـەدەرکر. ٣- خـۆ ژێ دا پـاش. ٤- دا سەر ملێ خۆ. ٥- پالڤەداییێ.

**تنكد:** ب زەحمەت کەت، نەخۆش بوو.

**تنكر:** ١- ژ سەروبەرەکێ باش کەتە د ئێکێ خـراب دا. ٢- خـۆ گوهـارت دا نەهێتـە نیاسـین. ٣- ئـەخلاقێ وی خـراب بـوو. ٤- ل بـەر وەکـی بیانیـا لێهـات. ٥- سەروچاڤێت خۆ داپۆشین.

**التنكر:** سەرۆچاڤپۆشین.

**تنكس:** سەروبنبوو.

**التنكير:** ١- سەروچاڤپۆشاندن. ٢- خۆنەئاشکراکرن.

**التنكيس:** سەرنشیڤبوون.

**التنكيـل:** ١- عبـرەت ب سـەری ئینـان. ٢- گرێدان.

**تنمر:** ١- بوو پلنگ. ٢- پنیپنیبوو.

**تنمس:** ١- هاتە بەرزەکرن. ٢- بۆ خۆ چەپەرکێ نیچیرێ چێکر.

**تنمص:** ١- ل گیایێ ژ نوی شینبووی چەری. ٢- بالەی پەرچەما خۆ کر دا ب هلکێشت.

**التنمل(بتشديد الميم):** رێنجیبوون.

**تنمـل:** ١- لڤـێ و شـلق ڤـێ کـەڤت. ٢- رێنجیبوو.

**تنمى:** ژ جهێ خۆ بلند بوو.

**التنمية:** گەشەپێدان؛ وەرارکرن.

**التنميق:** جوانکرن و خەملاندن.

**التنهاة(بـالفتح):** التنهيـة: دویماهیـا ئـاڤ دگەتێ ژ نهالێ.

**التنهاة(بالكسر):** ئەو ئاخە یا دکەنە پێشیا هلمشتێ دا براوەستیت.

**التنهد:** ئاخینکەک ڕاهێلا.

**تنهد:** بێهنا خۆ ژ خەما دا ژ کویراتیا سینگێ خۆ دەرئیخست.

**تنهنه:** ژێ دویرکەڤت و بەسکر.

**تنوء:** هلگرتنا وی ب زەحمەت دکەڤیت.

**التنواط:** ئـەو تشتن یێ ب مەحافێ ڤەدکەن ژ بۆ جانییێ.

**تنوخ:** دمەخەلچوو.

**التنور:** ١- تەنویرا نانی. ٢- روییێ عەردی.

**تنور:** ١- رۆهنبوو. ٢- دیت. ٣- دیت بێی کو ئەو ببینت. ٤- ب کسلێ هاتە مالنجدان. ٥- کولیلک دان. ٦- ژ دویرڤە دیت.

**التنـور:** ١- کولیلکـدان. ٢- ڕەوشـەنبیربوون. ٣- رۆهنبوون.

**التنورة:** تەنوورە؛ کراسێ عەلمۆدە.

**تنوس:** هەژیا.

**تنوع:** ١- هات و چوو. ٢- هەژیا. ٣- بەر ب پێش چوو. ٤- بوو گەلەک رەنگ و جۆر.

**التنوفة:** بیابانا بێ ئاڤ و مرۆڤ.

**تنوق:** د چێکرنا خوارنێ دا هونەر بکارئینا.

**تنول:** وەرگرت؛ بر.

**تنوه:** بلندبوو.

**التنوير:** رۆهنکرن.

**التنويم:** نڤاندن.

**التنـويم المغناطيسـي:** کارتێکرنەکە ل سـەر کەسـەکی دهێتـە کـرن ب ریکـا خوانـدنا هنـدەک پـەیڤان د ئـەنجام دا دکەڤیتـە د کاودانـەکێ وەکـی خـەوێ دا، بـەلی هەسـتی خـۆ ژ دەسـت نـادەت و دمینیتـە ل ژێـر فەرمانێت وی کەسـی یێ ب کـارێ نڤاندنا وی ڕادبیت کو دبێژنێ: (الوسيط).

**التنويه:** ١- نـاڤ بلندکرن. ٢- ئاماژەپێدان.

**التنين:** ١- ماسی. ٢- ئەژدەها. ٣- ماری مەزن.

**تنين الكوماندو:** جۆرەکێ خشوکێت گوشتخۆرە، یێ مەزنە درێژاهیا وی دگەهیتە مێتر و نیڤا.

**التهاتر:** شەهدەیێت ئێک یا دی دکەتە درەو.

**تهاتر:** هەر ئێکی نەوەیی د راستا هەڤالێ خۆ دا گۆتن.

**تهاجر:** ژێک سل بوون.

**التهاجر:** ژێکسلبوون.

**تهاجم:** هێرش کرنە ئێک.

**تهاجى:** ب هەلبەستێ ب خرابی بەحسێ ئێکودو کرن.

**تهادر:** خوینێت ئێکدو حەلال کرن.

**تهادم:** لێکحەیتاندن.

**تهادن:** ١- دورستبوو و چێبوو. ٢- پێکهاتن.

**تهادى:** ١- ب تنێ بڕێڤەچوو ڕێڤەچوونەکا ئێکێ ب هێز. ٢- هات یێ خۆ ب ملێت دویا ڤەگرتی. ٣- هەر ئێکی دیاریەک دا یێ دی. ٤- بەرێ ئێک دانە ڕێکا باش.

**التهادى:** پێکگوهارتنا دیاریا.

**تهاربوا:** هندەک دکەل هندەکا ڕەڤین.

**التهارش:** صە پێکڕابەردان.

**تهارش:** کشکرنە ئێک؛ پێکرا بەردان.

**تهارم:** دیت یێ پیرە.

**تهاطل:** ل دویڤ ئێک هات.

**تهافت:** ١- هاتە خوارێ و دا دویڤ ئێک. ٢- خۆ هاڤێتێ. ٣- لێ خربوو. ٤- کەتن مری. ٥- کەت و کەڤنبوو. ٦- کەڤتنەخوارا دویڤ ئێک.

**تهالک:** ١- خۆ بۆ کوشت. ٢- کار و لەز تێدا کرن. ٣- خۆ دا کوشتن.

**التهامس:** پسپسکرن.

**تهامسا:** ب نەپەنی ڤە بۆ ئێک گۆتن.

**تهامش:** ب ناڤێک کەڤتن و لڤین.

**التهاني:** کۆما (تهنئة)یە کو دبێتە پیرۆزباهی.

**تهاوش:** تێکهەلبوون.

**التهاوش:** مالێ حەرام.

**تهاون به:** بێبهاکر.

**تهاون:** ١- ڕەزیلکر. ٢- یاری پێکرن. ٣- دیت یێ سڤک و چونە. ٤- بێدادی قەبیلکر.

**التهاون:** قەبیلکرنا بێدادیێ.

**تهاوى:** ١- ئێک ل دویڤ ئێکی کەت. ٢- ب لەز چوو.

**التهاويل:** ١- ڕەنگێت گەلەنک جوین. ٢- خەملا وێنە و نەخش و چەکا. ٣- ڕەنگێت گولا یێت ژ هەمی جوینا ل بهارێ.

**تهايأ:** پێکهاتن.

**تهايج:** ڕابوونە ئێک.

**تهبب:** کەڤنبوو.

**تهبش:** ١- شۆلکر. ٢- کۆمکر.

**تهبط:** ١- هاتەخوارێ. ٢- ئامادەبوو.

**تهبهب:** ژجهچوو.

**تهبى:** دەستێت خۆ داقوتان.

**التهتان:** بارینا بارانێ.

**تهتک:** کراسێ شەرمێ لێ هاتە دڕاند، هەتک لێ چوو.

**تهتم:** شکەست.

**تهجأ:** پیت پیت خواند.

**التهجاع:** خەوا سڤک.

**تهجى:** پیت گەتن.

**تهجاه:** عەیبێت وی دیارکرن و قەسە گۆتنێ.

**تهجد:** ١- ب شەڤ نڤست. ٢- ب شەڤ ما هشیار.

**التهجد:** نڤێژا شەڤێ.

**تهجر:** ١- خۆ وەکی مشەختا لێ کر. ٢- ل تەعرێ چوو.

**التهجر:** ڕێڤەچوونا ل دەمێ نیڤرۆ.

**تهجم:** هێرش کره سەر.
**التهجية:** پیتگۆتن.
**التهجيد:** نڤاندن.
**التهجير:** ١- رێڤەچوونا ل دەمێ تەعرێ.
٢- مشەختکرن.
٣- مشەختکرنا ب کوتەکی.
**التهجين:** ١- دوقۆرکرن. ٢- کرێت دیتنا تشی.
**تهدب:** شوربوو.
**تهدج:** ١- ب ڤەهەژیان ڤە هاتە برین.
٢- ل تێژکێ خۆ زڤری. ٣- دلۆڤانیا خۆ دیار کر.
**تهدد:** گەفکرن.
**تهدل(بتشديد الدال):** شۆربوو.
**تهدم(بتشديد الدال):** ١- پیچپیچە کەڤت.
٢- هەرفت؛ هلگومی.
**تهدى:** ١- داخوازا نیشادانا رێکا راست کر.
٢- کەتە سەر رێکا راست.
**التهديد:** ١- گەف. ٢- ترساندن.
**التهديم:** خرابکرن، هەرفاندن.
**تهذب:** ١- ئەخلاقێ خۆ باش کر. ٢- خۆ ب تۆرە ئێخست.
**التهذيب:** ١- پاقژکرن. ٢- پاککرنا ئەخلاقی.
**تهرأ:** ١- ژ سەرما شکەست. ٢- گەلی تاکو هلوەریای و ژ هەستی ڤەبووی.
**التهرب:** رەڤین.
**تهرش:** قەشری و چوو.
**تهرع(بتشديد الراء):** لەزکر.
**تهرق:** خۆ خۆجهکر.
**التهريب:** رەڤاندنا تشتی ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی.
**تهزج:** ١- کەتە دویڤ ئێک. ٢- دەنگکر.
٣- ستران گۆتن.
**تهزز:** هژیا؛ لەرزی.
**التهزز:** هژیان.
**تهزع:** ١- لەزکر. ٢- نەرەحتبوو.
**تهزم:** ١- هشکبوو و شکەست. ٢- هەرفی.
٣- دەنگکر. ٤- پەقی و باری(عەور).
**تهزهز:** ١- هژیا. ٢- بۆ کەیفێ خۆش بوو.
**التهزيل:** لاوازکرن.
**تهسهس:** دەنگکر.
**تهشم:** ١- هاتە هویرکرن. ٢- شکەست ژ هشکییێ. ٣- هشک و بێ گیا ما ژ بێ بارنی و ئاڤێ. ٤- دۆهەت. ٥- ترسیا و لاوازبوو. ٦- قەدرێ وی گرت و مەزنکر.
٧- بۆ لایێ خۆ کێشا و رازیکر. ٨- دلێ وی ما پێڤە.
**تهشم:** شکەست و هویربوو.
**التهشيم:** شکاندن وهویرکرن.
**التهضام:** حەلکرن.
**تهضم:** ١- زۆرداری لێکر. ٢- شەلاند؛ ب خورتی ژێ ستاند. ٣- نەرمکر و شکاند.
**تهطرس:** ل رێڤەچوونێ خۆ ڤەهەژاند و مەزنکر.
**تهطل:** ١- باران باری؛ باری. ٢- مشە و ل دویڤ ئێک هات.
**تهفهف:** ناڤتەنگا زراڤبوو.
**تهقع:** خۆ کەرکر و مەزنکر.
**تهقم:** ١- شکاند و ئێخست. ٢- پارییێت مەزن داعویران.
**تهكم(بتشديد الكاف):** ١- باش تنگژی.
٢- هەرفی. ٣- تورانە پێکرن. ٤- تەحنە لێدان. ٥- خۆ مەزنکر و درەوکرن و زێدەچوویی. ٦- پەشێمانبوو. ٧- بارانەکا چو تشت خۆ ل بەر نەگرن کر. ٨- ستران بۆ گوتن. ٩- گەلەک بەحسی وی کر.
**التهكم:** ١- تنگژین. ٢- خۆمەزنکرن.
**تهلب:** هاتە هلکێشان.

**التهلكة:** ١- هەر تشتێ دویماهیا وی مرن بیت. ٢- پێمرن.
**تهلل:** ١- برسقی. ٢- باری؛ هاتە خوارێ. ٣- گەشبوو ژ کەیفادا.
**التهليل:** ١- گۆتنا پەیڤا (لا إله إلا الله). ٢- ل نک سۆفیا دبیتە ئێکانەکرنا خودێ.
**تهم:** ١- رزی. ٢- کەنیبوو.
**التهمة:** گونەهباری.
**تهمش:** ١- خوار و کەنی. ٢- دلۆپ کرن.
**تهمع:** ١- هاتە خوارێ. ٢- ب درەوڤە گری.
**تهمم:** ١- ل دویڤ گەرها. ٢- ڤەکر و بەردا (پرچ). ٣- رژت. ٤- کەلی. ٥- زراڤ و لەغەربوو. ٦- خەمێ گرت. ٧- پویتە پی کر.
**التهميم:** بارانا لاواز.
**تهنأ به:** پێ خۆشبوو.
**تهنأ:** ١- کەیڤخۆشبوو. ٢- بۆ خۆشبوو و لێهات. ٣- لێ غێفری، عافیەت ژێ دیت.
**تهندم:** جلکێت خۆ رێک و پێک کرن، راپێچانا خۆ دورست کر.
**التهواء:** پیچەک ژ شەڤێ.
**التهواع:** دلڕابوون؛ ڤەرەشیان.
**التهود:** ١- ل خۆ زڤرین و کرنا کارێ باش. ٢- چوونا سەر دینێ جوهیا.
**تهور (بتشديد الواو):** ١- هەرفی. ٢- خۆ هاڤێتە کاری بێی کو هزرا خۆ د دویماهیێ بکەت.
**التهور (بتشديد الواو):** ١- خۆ هاڤێتنا د کاری دا بێی هزرکرنا ئەنجامی. ٢- تێوەراندن،
**تهوس:** ١- ب گرانی ل سەر عەردەکێ نەرم برێڤەچوو. ٢- هەوای سەرێ وی گرت. ٣- خۆ دینکر.
**تهوش:** ١- تێکهەلبوون. ٢- لێ ڤرژین.
**التهوع (بتشديد الواو):** ڤەرەشیان؛ دلڕابوون.
**تهوع:** ١- دلێ خۆ راکر. ٢- دلێ وی رابوو خوین.
**التهوك (بتشديد الواو):** حێبەتگرتن.
**تهول:** ١- ترسیابوو. ٢- ڤیا چاڤەکی لێ بدەت. ٣- خۆ خەملاند.
**التهوية:** باگوهۆرین.
**التهويد:** ١- چوونا گەلەک هێدی. ٢- جوهیکرن.
**التهويل:** ١- بزداندن؛ ترساندن. ٢- یێ مرۆڤی پێ دترسینن.
**التهويم:** خەوا پیچەک.
**التهيؤ:** خۆ ئامادەکرن.
**التهيئة:** ئامادەکرن.
**تهيأ:** ١- ئامادەبوو. ٢- خۆ ئامادەکر.
**تهيب:** ترسیا؛ سەهمێ گرت.
**تهيبه (بتشديد الياء):** ترساند.
**تهيج:** ئاریا؛ ئازریا.
**التهييج:** ئاریان؛ ئازریان.
**تهيض:** شکەست پشتی جەبرینێ.
**تهيع:** ل عەردی پەحنبوو.
**تهيل:** خشیا خوارێ.
**تهيم:** کرە ئەڤیندار.
**التهييج:** ئاراندن.
**التو:** وەریس یان کنفێ ئێک تا.
**توأم:** هەڤالجێنک.
**التوأمين:** دو جێمک؛ کومەکا ستێرایە ژ هەژدە ستێرێت دیار و حەفتێت نەدیار پێک دهێت، وێنەیێ دو مرۆڤان پێک دئینن.
**توا:** ئها نوکە.
**توائم:** دگەل ئێک گونجا.
**التواب:** ١- یێ گەلەک تووبەدکەت. ٢- یێ گەلەک تووبێ قەبیل دکەت و ل تۆبەداری دبۆرت. ٣- ژ ناڤێت پیرۆزێت خودی یە.
**التوابل:** دەرمانکێت زادی.

**التواتر:** ١- کەتنە دویڤ ئێک بەلێ دگەل دەرفەتەکی د ناڤبەرا ئێکێ و ئێکێ دا. ٢- وەرگرتنا خەبەرەکی ژ کۆمەکا ل سەر درەوێ رێکنەکەڤن.

**تواثب:** خۆ هاڤێتنە ئێک.

**تواثق:** سۆز دانە ئێک.

**التواجد:** ١- خۆ دیارکر بێ کەیفخۆشە. ٢- خۆ دیارکر بێ ب ئەڤینە. ٣- خۆ دیارکر بێ غەمگینە. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە خوازتنا خەریبیێ یان خۆ خەریبکرن..

**التواجد:** ١- هەڤدیتن. ٢- خەریبیا بەردەوام.

**التواجه:** رِوی ب رِوی بووییێ.

**التواجه:** رِوبرِوبوون.

**تواحی:** لەز ل ئێک کرن.

**توأد:** خۆگرت.

**التودد:** خوازتنا ئەڤینا کەسەکی ب رێکێت پێدڤی و هاریکار.

**التوادع:** ١- پێکهاتن. ٢- خواتر ژێک خواستن. ٣- ژێکئاشبوون.

**تواری:** ١- نەپەنیبوو. ٢- غەوارەبوو.

**توارث:** ١- هندا میرات بۆ هندا هێلا.

**التوارث:** بۆ ئێک هێلانا میراتی.

**توارد:** ١- ئێک ل دویڤ ئێکێ هات. ٢- چوو سەر ئاڤێ. ٣- ل سەر رامانەکێ پێک هاتن.

**التوارد:** ١- ل دویڤ ئێک هاتن. ٢- گەهەشتنا قووناغێ ل دویڤ ئێک.

**توارد الافکار:** دۆرهێلەکێ دەروونی یە وەسا دگەهینت کو دانەدویڤێکا هزرا و پەیدابوونا وان ب وی رەنگی یە هەروەکی گازی ئێکدو دکەن.

**التواري:** خۆڤەشارتن.

**توازی:** کەتە هەمبەر.

**توازن:** بوونە هەڤسەنگ.

**التوازن:** ١- هەڤکێشی؛ هەڤسەنگی. ٢- د سیاسەتێ دا دبیتە: لێکڤەکرنا دەستهەلاتداریا ب شێوەیەکی کو کەس زێدەگاڤیێ ل کەسێ دی نەکەت. ٣- د ئابۆرێ دا دبیتە: تیۆرەکا نوی یە دبێژیت: دەستنیشانکرن بهایێ تشتی گەلەک ئەگەر کارتێدکەن.

**توازن المیزانیة:** وەکهەڤیا داهاتی و دەرچوویا.

**التوازي:** هەڤبەراتی.

**تواسی:** سەرەخۆشی لێکر.

**تواصی:** ئێکدوشیرەتکرن.

**تواصف:** هەرئێکی یێ دی سالوخەت دا.

**تواصل:** بەردەوامی دا.

**التواصل:** ١- بەردەوامکرنا ڤێککەڤتنێ. ٢- ڤێکرا گەهەشتن.

**تواصم:** شەرما ئێکدو برن.

**التواصي:** شیرەتلێککرن.

**تواضع:** ١- خۆ کێمکر. ٢- نزمبوو. ٣- دویرکەت.

**التواضع:** گرتنا تایێ زراڤ؛ خۆکێمکرن.

**تواطأ:** رێککەڤت.

**التواطؤ:** رێککەڤتن.

**تواطأ:** رێکەڤتن.

**تواطس:** ١- ڤێککەڤتن؛ لێکدان. ٢- قرژین.

**تواعد:** ١- سۆز دانە ئێک. ٢- گەف ل ئێک کرن.

**التواعد:** سۆزپێکدان.

**توافد:** د دویڤ ئێک رِا هاتن.

**توافر:** مشەبوو و بەرفرەهبوو.

**التوافر:** مشەبوون.

**توافق:** ١- پێکهاتن. ٢- نیزیکی ئێکبوون. ٣- هاری ئێک کرن.

**التوافق:** رێککەڤتن.

**توافی:** تمامبوون.

**التوافي:** تمامبوون.

**الجغرافية الرياضية:** زانستێ ل دۆر جهێ ئەردی د ناڤبەرا ستێر و هەسارا دا.
**الجغرافية التاريخية:** زانستێ ل دۆر نقش و زمان و تخوبێت وەلاتا و دەزگاهێت ل دنیایێ.
**الجغرافية البشرية:** زانستێ ل دۆر خەلکێ ئەردی.
**الجغرافي:** زانایێ جوگرافیایێ.
**جف:** هشکبوو.
**جفأ:** ١- قرش و کەف هاڤێتن(رویباری).
**جفي:** ئێخست.
**جفا:** ١- نەما ل جهێ خۆ. ٢- ڕحەت ل سەر نەما(نڤین). ٣- ڕەق و ژڤر بوو. ٤- خۆ دویرکر.
**الجفاء(بالفتح):** ١- دلڕەقی، بێ ڕەحمی. ٢- دویرکەڤتن.
**الجفاء(بالضم):** ١- ئەو تشتە یێ هلمشت ددەتە ڕەخەکی وەکی قرش و کەفا. ٢- تشتێ بێخیر.
**الجفاجف:** سەروبەر و جلک.
**الجفال:** ١- هری. ٢- کەفا شیری. ٣- قرش و قالێ هلمشت د گەل خۆ دئینت.
**الجفالة:** ١- کەفا شیری. ٢- قرش و قالێ هلمشت د گەل خۆ دئینت. ٣- کۆما خەلکی.
**جفة(بتنوين التاء):** هەمی پێکڤە.
**الجفة:** ١- کۆما خەلکی. ٢- ژمارەیا زەحف.
**جفجف:** هاژۆتن هەتا ب سەر ئێک دا قولپاندین.
**الجفجف:** ١- عەردێ بلند. ٢- عەردێ نزم.
**الجفجفة:** ١- خشخشا جلکێ نوی. ٢- زمێنا کۆماهیا مرۆڤێت دچن.
**الجفر:** بیرا بەرفرەه.
**الجفر:** ١- زانستەکە دبێژنێ (علم الحروف) خودانێت وی دبێژن ئەم دشێین ب ڤی زانستی هەمی ڕویدانا بزانین هەتا کو دنیا خراب دبیت. ٢- جهێ فرە.
**الجفرة(بالضم):** ١- نیڤا تشتی. ٢- پەحنیا گڕۆڤر.
**جفس:** حەمەربوو.
**جفظ:** تژیبوو.
**جفف:** هشککر.
**الجفف:** ئەردێ هشک.
**جفل:** ١- جلفی. ٢- ب لەز هات(با). ٣- هاڤێت. ٤- د گەل خۆ بر.
**الجفل:** ١- عەورێ بارانا خۆ ڕیهتی و ب لەز چووی. ٢- ڕیخا فیلی. ٣- کەشتی.
**الجفلى:** داخوازا زادخوارنێ یا ب گشتی.
**الجفلق:** پیرا قەلەو.
**جفن:** ژ خرابیا پاراست.
**الجفن:** ١- کاڤلانێ شیری. ٢- پشتچاڤ؛ چەرمێ ب سەر چاڤی ڤە.
**الجفير:** تیردانکا تنێ ژ داری یان کەڤلی هاتیە چێکرن.
**الجفيظ:** وەرمتی.
**الجفيف:** گیایێ هشک.
**جفنة:** فەرخەسێنیا مەزن.
**الجفول:** کەشتیا چوونسڤک.
**جق:** پیقەک هاڤێت.
**جل(بالتشديد):** مەزنبوو، ب قەدر کەڤت.
**الجل:** پارجا دیوارکری(عەرد).
**جلا:** ١- ڕۆهنبوو، ئاشکرابوو. ٢- سەقاکر.
**الجلاء(بالفتح):** ئاشکرایی.
**الجلاء(بالكسر):** جۆرەکێ کلی یە.
**الجلاب:** ١- گولاڤ. ٢- هنگڤین یان شەکرا گولاڤ تێکری. ٣- بازرگان(فارس)یە.
**الجلاتين:** کەرەستەیەکێ موکمە ژ ئاڤا نەسیجێ لویفی یێ حەیوانا دهێتە چیکرن.
**جلاجل:** زەنگل؛ زەنگ.
**الجلاح(بالضم):** هلمشتا بۆشا هەر تشتەکی دگەل خۆ دبەت.
**الجلاد:** ١- پیستفرۆش؛ کەڤلفرۆش. ٢- ئەوێ سەرا دبڕت یان ب شڤتانا یان قامچیا خەلکی دقوتیت.
**الجلادة:** تەخێت بەفرێ یێت کەتین سەرێک.

**الجلاز:** کەڤلکێ ب دەستکێ قامچیێ ڤە.
**الجلاف(بالضم):** تەقن.
**جلاقة:** ١- لاواز. ٢- پرتا گوشتی.
**جلال:** مەزناهی؛ بلندی.
**جلالة:** ئەو حەیوانە یێ پیساتیێ دخۆت.
**الجلامة:** هری یان مویێ ژ پەزی ڤەکری.
**جلاهق:** گرەپ.
**جلایا القدس:** زاراڤەکێ سۆفیانە دبیتە رۆناهییێت بلند.
**جلب:** ١- ئینا. ٢- پەیداکر. ٣- هاژۆت. ٤- هشکبوو.
**الجلب:** ١- پەرتال؛ متا. ٢- هەر تشتی دچیتە سویکێ بۆ فرۆتنی. ٣- حێشترا کەلوپەلێ خەلکێ لێکری. ٤- دەنگ و پێژن.
**الجلب(بالضم):** ١- هەورێ بێ باران. ٢- عەورێ مەزنێ وەکی چیا.
**جلبب:** کراس ل بەرکر.
**الجلبة(بالضم):** ١- کەڤلکێ ل سەر برینا ساخبووی. ٢- کۆما بەرا یا رێ تێ را نەچیت. ٣- جەروانێ هەر پنیەک ل عەردەکی. ٥- کەرێ پەزێ سپی.
**الجلبة(بالفتح):** کەڤلێ ددانە سەر زینێ دەوارا.
**الجلباب:** جل؛ کراس.
**الجلبان:** کەلیک؛ جۆرەکێ گیایێ چۆلی یە؛ کولیلکێت سپی ددەت، و کەلیک پێڤە دهێن، کەلیکێت وی وەکی ییێت باقلکانە و تینە خوارن، ل کوردستانێ هەتا (٣٠) سەنتیمێترا بلند دبیت، لێ ل هندەک وەلاتا هندەک نفش ژێ هەنە دهێنە چاندن و هەتا (١) مێترێ بلند دبیت و ژ بەر تۆڤک و گیایێ وێ دهێتە چاندن، و هندەک جۆرێت وی ژ بەر کولیلکێت وی ییێت رەنگین دهێنە چاندن.
**الجلبة:** دەنگ و پێژن.

**جلة:** ١- یاسمین. ٢- گول ژ هەمی رەنگا.
**جلت:** قوتا؛ دانایێ.
**جلجل:** باش بادا.
**الجلجل(بالضم):** ١- زەنگلا بچویک. ٢- مرۆڤێ رحسڤک. ٣- مرۆڤێ د کارێ خۆ دا چەلەنگ.
**الجلجلان(بالضم):** کونجی.
**الجلجلة(بالضم):** ١- کولۆخک(عبری) یە. ٢- ناڤێ وی چیایە یێ کو ل دویڤ گۆتنا فەلا عیسا پێغەمبەر سلاڤ لێ بن ل سەر هلاویستی.
**الجلجلان:** ١- دندکێت کونجیا. ٢- بەرێ گژنیژێ. ٣- کاکلک.
**جلح علی الشیئ:** بمجدی چوویێ.
**جلح:** ١- تیڤلاند. ٢- کۆچبوو. ٣- چەروان خوار.
**جلخ:** ئێخست؛ ل عەردی دا.
**جلد:** ١- جەلدەدا. ٢- پێ دانایێ. ٣- ل عەردی دا.
**جلد:** کەڤل.
**جلدة:** ١- شڤتان. ٢- قامچی.
**جلز:** ١- گرێدا. ٢- دا دگەل.
**جلز الشیئ الی الشیئ:** دا دکەل.
**جلز فی الأرض:** ب لەز چوو.
**جلس:** یێ رازایبوو روینشت.
**الجلس(بالفتح):** ١- عەردێ ب کەند و کوور. ٢- هەر جهێ بلند ژ عەردی. ٣- کەڤرێ مەزن.
**جلسة:** روینشتن.
**جلط:** ١- سوندخوار و درەوکر. ٢- رویسکر (شیر).
**الجلطة(بالضم):** پرتا مەیی چ ژ ماستی یان ژ خوینێ.
**جلع:** ١- گرنژی. ٢- ژ بەرخۆکر(کراس). ٣- بێشەرم ئاخڤت.
**الجلعة:** گرنژین.

**جلف:** ١- تیڤلاند. ٢- بڕی. ٣- ژ بنی ئینادەر.
**الجلف(بالكسر):** ١- لەشێ بێ سەر. ٢- کەڤلکری و عەویر و هناڤ ژێ دەرئێخستی (سەربڕ). ٣- دەنێ ڤالا. ٤- ئامان. ٥- مەشکا ئاڤێ.
**الجلفاط:** کەسێ تیکێت کەشتی تژی قیر و پاتە دکەت.
**الجلفة(بالضم):** ١- تیڤلێ ژ تشتی ڤەکری. ٢- جهێ تیژکرنێ ژ قەلەمی.
**الجلفة(بالكسر):** کەرێ نانی.
**جلفط:** قیر و پاتە قوتانە تیکێت کەشتیێ.
**الجلفطة:** زفتکرنا ناڤبەینا دەپێت کەشتیا.
**جلق:** ١- تراشت. ٢- ب مەنجەنیقێ دانایێ.
**جلق(بالكسر و تشديد اللام:** باژێرێ شامێ (دمشق)ێ یە.
**جلل:** ١- مەزن. ٢- چونە؛ بێ بها. ٣- ب ساناهی.
**جلم:** ١- بڕی. ٢- گوشت ژ هەستیا ڤەکر.
**الجلم:** ١- جەوا بڕینا موی و هریێ ژ پەزی. ٢- شاهینێ بچویک. ٣- هەیڤا ئێک شەڤی.
**الجلماق:** تشتێ د دەستکێ کڤانی د ئالینن.
**الجلمة:** هەمی.
**جلمود:** بەر.
**جلنار:** گولهنار(فارسی) یە.
**جلنسرين:** گولشێلان.
**الجلواز:** ١- خزمەتکارێ میری یێ ب لەز فەرمانێت وی ب ڕیڤە دبەت. ٢- پۆلیس.
**الجلوة(بالفتح):** دەرکەڤتن ژ خەلوێ ب سالوخەتێت خودایی ڤە.
**الجلوة(بالكسر):** ئەو تشتە یێ زاڤا ل دەمێ داوەتێ ددەتە بویکێ.
**جلوز:** سڤک خزمەتکر.
**الجلوزة:** پێسڤکیا د هاتن و چوونێ دا.
**جلوس:** ڕوینشتن.
**الجلوط:** بێ شەرم.
**جلي:** ئاشکرا.
**الجليد:** جەمەد؛ بەستی.
**الجليدية:** بەرچاڤک.
**الجليس:** یێ دگەل مرۆڤی دڕوینت.
**الجليف:** ١- دلڕەقێ سەرڕەق. ٢- مرۆڤێ زۆردار.
**الجليل:** ١- مەزن. ٢- ژ ناڤێت خودێ یە.
**جم:** مشەبوو.
**الجم:** گەلەک؛ زەحف.
**الجماء:** ١- هەمی پێکڤە باش و خراب. ٢- یا گۆزەکا وێ د گوشتی دا ئاڤابووی. ٣- ژنکا ب گوشت. ٤- بەرانێ کۆچ. ٥- شەرڤانێ بێ ڕوم. ٦- حولی. ٧- کەلا بێ عۆلی.
**جماح:** شەمبۆزی.
**الجماح(بالضم):** ١- لەشکەرێ ژ شەڕی ڕەڤی و کەس نەشێت ب زڤڕینیتە ڤە. ٢- تیرا بێ سەر.
**جماد:** هشک.
**جمادي:** ناڤێ دو هەیڤا یە ژ هەیڤێت قەمەری؛ (جمادي الأولى) کو دبیتە هەیڤا پێنجێ، دکەڤیتە دناڤبەرا (ربيع الآخر) و(جمادي الآخرة) کو (٣٠) ڕۆژن. و (جمادي الآخرة) کو دبیتە هەیڤا شەشێ، دکەڤیتە دناڤبەرا (جمادي الأولى) و (رجب)ێ کو (٢٩) ڕۆژن.
**جماح:** شەمبۆزی.
**جماد:** تشتێ بێجان.
**جمار:** نێرکا دارقەسپێ.
**الجماع:** ١- تشت هەمی. ٢- گان؛ چوونا نڤینا ژنکێ. ٣- مەی.
**جماعة:** کۆمەک.

**الجماعية:** ڕێبازەکا هزری یە دبینت کو ئاریشەیێت جڤاکی جارە نابن ئەگەر هەمی ئالاڤێت بەرهەمدانێ نە داننە بەر دەستی هەمی جڤاکی و پێکڤە تێدا د پشکدار نەبن.

**الجمال:** جوانی.

**الجمال(بتشديد الميم):** خودانێ حێشترا.

**الجمالية:** زانستێ جوانییێ.

**الجمام:** تشتێ ل سەر هەیێ د کتا ترازیێ دا.

**الجمان:** تژی؛ پڕ.

**جمان:** ١- کۆما(جمانة)یە کو دبیتە ئەو ماتا وەکی لۆلۆیێ یا ژ زیڤی چێکری. ٢- مۆرکا زیڤی. ٣- لۆلۆ.

**الجماني:** یا پرچا وێ کەلەک زۆر.

**الجماهير:** جەماوەر.

**الجمباز:** جومناستیک.

**الجمة(بتشديد الميم):** پرچا ل سەر ملا.

**الجمة(بالضم):** جهێ پویت لێ کۆم دبت ژ سەری.

**الجمة(بالفتح):** ١- بیرا ئاڤ بۆش. ٢- مشە.

**جمح:** ١- شەمبۆزبوو. ٢- زیزبوو.

**الجمجمة:** کولۆخک.

**الجمحور:** ١- خلۆلە. ٢- بێ سەبر و هێز.

**جمد:** ١- قەڕسی. ٢- هشکبوو.

**جمر:** ١- خڕڤەکرن. ٢- دانا سەر پەلا.

**الجمرة:** ١- بەرێ بچویک. ٢- پەل. ٣- ئێلا ئیککگرتی پەیمان د گەل چو ئێلا نەبەستی. ٤- بەرکێ ل حەجێ د شەیتانی وەردکەن.

**جمز:** بەزی و لەزکر.

**الجمزى:** بەزا سڤک.

**جمس:** قەڕسی.

**جمش:** ١- تراشت. ٢- دۆت.

**الجمش:** دەنگێ نزم.

**الجمشت:** ئێکە ژ جۆرێت کوارتزی، رەنگێ وی یێ بنەفشی یە، یۆنانی یا دگۆتنێ: بەرێ مرۆڤی نەئارینت، و دکرنە د ناڤ مەیێ دا دا کو پێ سەرخۆش نەبن، ل (رۆسیا) و (ئۆرگوای) و (مدغشقر) و (سیلان)ێ هەیە.

**جمع:** خڕڤەکر.

**الجمع:** کۆمکرن: ١- درێژمانێ دا گەلەک جۆرن وەکی: أ- جمع المذکر السلم. ب- جمع المؤنث السلم. ج- جمع تکسیر. ح- جمع القلة. خ- جمع الکثرة. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە دیتنا خودێ حەق بێی خەلک.

**الجمعة:** ڕۆژا ئەینی.

**الجميع:** هەمی.

**الجمعية:** ١- کۆمەلە؛ کۆمەکا مرۆڤایە دکەڤنە ژێر سیستەمەکێ تایبەتی ژ پێخەمەت ئارمانجەکا دەستنیشانکری. ٢- کۆمبوونەکا ژمارەیەکا کەسانە ژ بۆ دانوستاندنا ل دۆر بابەتەکی. ٣- ل نک سۆفیا دبیتە کۆمبوونا حەز و شیان ژ پێخەمەت قەستکرنا خودێ حەق.

**الجمل:** ١- حێشتر. ٢- کنفێ ستویرێ کەشتیا. ٣- کنفێ ستویر.

**جمل البحر:** حیشترا دەریایێ؛ جۆرەکێ حویتا یە.

**الجملة(بالضم):** ١- ڕستە. ٢- هەمی.

**جملة معترضة(إعتراضية):** ئەو ڕستە یە یا دناڤ ڕستەیەکێ دا دهێت وەکی (زید — طال عمره - قائم).

**الجمناز:** هۆلا وەرزشی(یۆنانی)یە.

**الجمناستيک:** ١- وەرزشێ پەهلەوانی. ٢- ڕاهینانێت ب هێزکرن لەشی(یۆنانی) یە.

**جمهر عليه الخبر:** هندەک بۆ گۆت و هندەک لێ ڤەشارت.
**جمهر:** کۆمکر؛ خڕڤەکر.
**الجمهور:** ١- خەلک. ٢- حەژێکەر. ٣- لایەنگیر. ٤- خیزێ زەحفێ ل سەرئێک (فارس) یە.
**الجمهورية:** کۆمار(فارسی) یە.
**جمود:** ١- هشکبوون. ٢- بێ لڤین.
**الجموش(الجميش):** دەرمانەک بوو ژ بۆ وەراندنا پویتێ سەری دهاتە ب کارئینان.
**الجميرة:** کەزیا موی.
**الجميز:** جۆرەکێ هژیرایە.
**الجميس:** هشک.
**الجميش:** عەردێ بێ گیا.
**الجميع:** هەمی.
**الجميل:** ١- جوان؛ خشکۆک. ٢- بەزێ حەلاندی.
**جن(بالفتح):** ١- هات. ٢- نخاڤت. ٣- خۆ ڤەشارت.
**جن(بالضم):** دینبوو.
**الجن:** ئەجن؛ ژمەچێتر.
**جنى:** ١- جنی. ٢- گونەهەک کر.
**جنئ:** پشتا وی خوار و قۆف بوو.
**الجنائب:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبێتە ئەو ڕێڤینگێت بەر ب خودێ دچن و (زاد التقوى) د گەل خۆ برین.
**جناح(بالضم):** گونەه.
**جناح(بالفتح):** پەڕ.
**الجناحية:** شیعەنە؛ دویڤچوویێت (عبدالله بن معاوية بن عبدالله بن جعفر بن أبي طالب- ذي الجناحين).
**جنادف:** کوندلک؛ بەژنکورت.
**جنازة:** مریێ ل سەر جهێ خۆ.

**الجناس:** وەکهەڤیا پەیڤێ دکەل ژێک جوداهیا رامانا وەکی (العين) کو چاڤە و کانی ژی کە .
**الجنان:** ١- دل. ٢- شەڤ. ٣- تاریاتیا شەڤێ. ٤- شۆلا نەپەنی.
**الجنانة:** مەتال.
**جناية:** گونەه؛ کریارا قەدەغە چ ژ لایێ شەریعەتی ڤە چ ژ لایێ یاسایێ ڤە.
**الجندب المصلي:** هەسپێ فاتمانەبیا.
**جنب:** پالدا و دویرکر.
**جنب(بتشديد النون):** ژ خۆ دویرکر.
**جنب(جنبة):** ١- تەنشت. ٢- جه.
**الجنب(بالضمتين):** ١- یێ دویر. ٢- یێ بیانی.
**الجنة(بالفتح):** بەحەشت.
**الجنة(بالضم):** پارازتن.
**الجنة(بالكسر):** دیناتی.
**الجنجن:** هەستیێ سینگی.
**جنح:** ١- بۆ لای چوو. ٢- دا ئاخێ.
**الجنح(بالكسر):** ڕەخ؛ لا.
**جند(بالتشديد):** کرە لەشکەر یان سەرباز.
**الجند(بالضم):** ١- سەرباز. ٢- باژێر.
**جندار:** زیرەڤانێت میری(فارس) یە.
**جندب:** جۆرەکێ کولی یە.
**الجندب المصلي:** هەسپێ فاتمانەبیا.
**جندر:** قەلەم ل سەر پیتێت ژێچووی ڕا بر.
**جندل:** ئێخستە عەردی.
**الجندل:** کەڤرێ مەزن.
**جندي:** سەرباز.
**الجندية:** سەربازکاری.
**جنزير:** زنجیر(فارسی) یە.
**جنس:** گەهەشت.
**الجنس:** ١- جۆر؛ ڕەنگ. ٢- نفش؛ توخم. ٣- کارێ سێکسی.

**الجنسية:** نژادنامە.
**جنش:** ١- لۆتدا. ٢- هات. ٣- هشک و بێ گیا بوو.
**جنص:** ١- ژ ترسا دا ڕەڤی. ٢- بەرتەنگکر.
**جنف:** خۆ ژێ دا ڕەخەکی.
**الجنف:** ١- گونەه. ٢- زۆرداری.
**الجنفاص(الجنفيص):** تەڤنەکێ زڤرە ژ کتانی.
**الجنوب:** باشۆر؛ ژێری.
**الجنوسة:** زاراڤەکە بزاڤا ژنان دەرکریە پشتی کو زاراڤێ (الجنس- sex) ڕەتکری یێ کو ل دویڤ دیتنا ژنان بهایێ وان کێمدکەت و دکەتە مرۆڤەکێ ل پلەیا دووێ، ب دورستی ژی پەیڤا (الجنوسة) کەڤنترە ژ پەیڤا (الجنس) ژ بەر کو ژن ل دەستپێکێ ل سەردەمێت کەڤنار ژ لایێ ماف و ئەرکان ڤە یا یەکسان بوو د گەل زەلامی، ئانکو بەری ل سەر وێ زال ببیت و وێ بکەتە لەشەک تنێ بۆ ژێدیتنا خۆشی و تاما.
**الجنون:** دیناتی.
**الجني:** بەرهەم.
**الجنيديون:** زاراڤەکێ سۆفی یە ئانکو دویڤچوویێت (الجنيد البغداردي) یێ کو ل سەردەمێ وی دگۆتنێ: (طاووس العلماء).
**الجنين:** بچویکێ د زکێ دایێ دا.
**الجهاد:** خۆوەستاندن؛ د شەریعەتی دا دبنە دو جۆر: ١- (الجهاد الأكبر) کو جهادا نەفسێ یە مرۆڤ دژی وی خۆ بزاڤێ بکەت خۆ بوەستنت. ٢- (الجهاد الأصغر) کو دبیتە جەنگا درێکا خودێ دا ژ بۆ سەرئێخستنا دینێ.
**جهار:** ئاشکرا؛ دیار.
**جهار:** صەنەمەکێ ئێلا (هوازن) بوو جهێ وی ل (سوق عكاظ) بوو.
**جهاز(بالكسر):** ئامیر؛ دەزگا.
**الجهاز(بالفتح):** کۆزۆتا بویکێ.
**جهاز(بالفتح):** ١- پەرگار؛ ئامویر و ئالاڤێت کرنا کارەکی. ٢- کوزۆت.
**جهاز العروس:** کوزۆتا بویکێ.
**الجهالة:** نەزانین.
**الجهام:** عەورێ بێ باران.
**جهامة:** تێکچوونا سەروچاڤا ژ خەمێ.
**الجهبذ:** ١- ڕەخنەگر. ٢- زانایێ باش و خرابا ژێک جودا دکەت(فارسی) یە.
**الجهبر:** دێهلەشێر.
**جهة:** ١- سەمت. ٢- لا. ٣- جه.
**جهد:** وەستیا.
**الجهد:** ڕەنج؛ وەستیان.
**جهر:** ١- ئاشکرابوو و بەلاڤبوو. ٢- ئاشکراکر. ٣- بلندکر. ٤- بێ پەردە دیت.
**الجهر:** نەپەنی.
**الجهري:** یێ ئاشکرا.
**جهز:** چوویێ و تمام کر(بریندار).
**الجهزاء:** عەردێ بلند.
**جهش من الشئ:** ژێ ترسیا.
**جهش:** ١- قوتا؛ هێرا. ٢- دەستپێکر.
**الجهشة:** ١- ڕۆندک. ٢- کۆما مرۆڤا.
**جهض فلانا عن الأمر:** شیایێ و ژێ دویرکر.
**جهض:** بچویک ژ بەر بر.
**الجهض(بالكسر):** بچویکێ بەرهاڤێتی.
**الجهل:** نەزانین؛ ئەو ژی دو جۆرن: (الجهل البسيط) و (الجهل المركب).
**الجهلول الإعتيادية:** بالندێ چکچکەیێ نکل درێژێ ناڤنجی.
**الجهلول:** بالندێ چکچکەیێ نکل کورتێ ناڤنجی.

**جهم:** رویترشبوو.
**الجهم:** ڕویترش.
**الجهمة:** ١- قازانا مەزن. ٢- دەستپێکا دویماهیییێت شەڤێ.
**الجهمية:** موعتزلەنە؛ دویڤچوویێت (جهم بن صفوان)ن.
**جهن:** نێزیکبوو.
**الجهن:** ڕەقاتیا دێمی.
**جهنم:** دۆژەهـ(عبری) یە.
**الجهور:** ١- دلێرێ مێرخاس. ٢- یێ بلند.
**الجهوري:** یێ بلند و بهێز.
**جهي:** خرابوو؛ وێرانبوو.
**الجهي:** یێ خرابووی؛ یێ ویرانبووی.
**جياش:** لڤۆک.
**الجهيد:** چەروانێ خۆشێ تەرش قەست دکەتێ.
**الجهير:** ١- بلند. ٢- یێ ژ هەژی قەنجیێ.
**جهيز:** سڤک.
**الجهيض:** بجویکێ چوویی؛ یێ بەرهاڤێتی.
**الجو:** ١- عەسمان. ٢- ڤالاتیا د ناڤبەرا دو تشتا دا. ٣- بەستا بەرین.
**الجوى:** ئەڤینا د دل دا یا شیاندارا و خودانی دکوژیت.
**الجواء:** ١- نهالا بەرفرەهـ. ٢- تویرکێ زادی بۆ شڤانی دکەنێ. ٣- جهێ قازانێ ددانێ.
**الجواب:** بەرسڤ.
**الجواثم:** ناڤێ جۆرەکێ چوچکایە دەوبر و خوانانە چار تبلێت ب چەنجار پێڤە هەنە سێ ل پێشن وئێک لپاشە.
**الجواد:** ١- مەرد، دەستڤەکری. ٢- سەخی. ٣- هەسپ.
**الجوار:** جیرانی.
**الجوارح:** بالندێت گوشتخۆرن یێت کو نێچیرێ بۆ خودانی دکەن.
**الجوارس:** دارقەسپ.
**جواز سفر:** پاسپۆرت.
**الجواز:** ١- دەستویری. ٢- ڕێنامە (پاسپورت). ٣- کانیا ڤەخوارنێ و ئاڤدانێ.
**الجوازي:** پەزێت هندی گیاشینکی دخۆن ئاڤی نەڤەخۆن.
**الجواس:** ١- شێر. ٢- یێ دکەڤیتە ناڤ مللەتی و خرابکاریێ د ناڤ دا دکەت.
**جوالق:** جهال (کوردی) یە.
**الجواهر:** ١- کۆما (جوهر)ە. ل نک سۆفیا دبیتە کاودانەکێ (عالم الشهادة) یێ کو دبیتە هەر هەبوویەک ژ بلی خودێ.
**الجوبة:** ١- چال. ٢- جهێ ڤەدەر یێ ل ناڤ خانیا.
**الجوة(بالضم):** ١- پنیا کونکی. ٢- چالا ل چیای. ٣- پاچا عەردی یا ب کەند و کۆر. ٤- ژەنگا ئاسنی. ٥- ڕنگێ ب ڕەشیڤە.
**جوجور:** حێشترا سینگ مەزن.
**الجود:** مەردینی.
**الجودة:** باشیا جۆری.
**جورب:** گۆرە(فارسی) یە.
**الجوخة:** ١- چال. ٢- بیرا بێ بن. ٣- چوخ. ٤- دەستەکا مرۆڤا.(فارسی) یە.
**الجودو:** خۆلێکدانەکا چاپانی یە، ژ ڕاهینانا وەرزشی و هونەرێ بەرەڤانی ژ خۆکرنێ بێ چەک پێک دهێت.
**جوز(بتشديد الواو):** ١- بۆ دورستکر. ٢- دەرباسکر.
**الجوز:** گویز.
**جوز الفوفل:** فێقیێ دارقەسپا هندستانێ یە یا کو ل جهێ سەرجەمی ژ کیشوەرێ ئاسیا شین دبت، د چێکرنا پاریێ ب هێزێ ڕۆژهەتی دا دهێتە ب کارئینان.
**جوز الطيب:** لبەکا وەکی گویزێ یە دهێتە قوتان و ب کارئینان ژ بۆ زێدەکرنا تامێت زادی وەکی ئیبراخا و قەلیێ و کوتلکا ژ بەر کو تیژاتیا وێ گەلەک یا ب تامە.

**جوز القيء:** نفشەکێ دارایە.
**جوز الهند:** گویزا هندستانێ.
**الجوزاء:** ١- کۆمەکا ستێرا یە دبێژن: (برج الجوزاء). ٢- مهـا رەشا پنیەکا سپی ل نیڤەکا وێ.
**جوزة العنق:** گرێکا حەفکێ.
**جوزل:** چویچەلۆک.
**الجوسان:** ١- کوشتن. ٢- قڕکرن.
**الجوسق:** قەسر(فارسی) یە.
**الجوشمة:** بالندێ بنکوریرەش(بالنده).
**الجوش:** سینگ.
**جوشن:** ١- زریپۆش. ٢- سینگ. ٣- نیڤ.
**الجوع:** برس.
**الجوعان:** برسی.
**الجوعية:** کولبەیی، سالۆخەتێ سۆفیانە ژ بەر کو خۆ برسی دکەن و پویتەی نادەنە جلکێت خۆ.
**الجوغن:** جوهنی.
**الجوف:** ١- خلولاهی. ٢- هناڤ. ٣- ژناڤدا.
**الجوفاء:** ١- بێت بەرفرەهـ. ٢- بێت خولۆلە.
**الجوفي:** جۆرەکێ ماسی یە.
**الجوقة:** ١- تیپ. ٢- کۆمەک.
**الجوال:** گەڕۆک.
**الجـول:** ١- ئاخا با دئینت و دبەت. ٢- دیوارێت گۆڕی.
**الجولان:** ١- گەریان. ٢- ئاخا با دئینت و دبەت.
**جولة:** ١- گەریانەک. ٢- نەقلەک.
**الجـون:** ١- سـپی. ٢- رەش. ٣- کەنداڤێ بچویک.
**الجونــة:** ١- رەژوی. ٢- رۆژ ل دەمـێ ئاڤـابوونێ. ٣- جـەرکێ رەنگکـری. ٤- سەلکا کەڤلکری.
**الجوني:** بالندەیێ سەنگ و چەنگ رەش.
**الجوهري:** جەواهرفرۆش.
**جوي:** تووشی سۆتنا عشقێ بوو.
**الجوى:** دژواریا ئەڤینێ.
**الجوي:** ١- عاشق. ٢- دلتەنگ.
**الجيئة:** هاتن.
**جياش:** ب لڤین.
**الجياعيـل:** ١- قوتـک. ٢- جلکێ نـەدوری. ٣- فەرۆ.
**الجيال(الجيالة):** حەفتیار.
**الجيب:** بەرویک.
**الجية:** ١- ئاڤا گەنی. ٢- گۆلا ئاڤێ.
**الجيحل:** ١- چیا. ٢- کەڤرێ مەزن. ٣- هەر تشتێ مەزن.
**الجيد:** یێ باش.
**الجيد:** ستۆ؛ گەردەن.
**جيداء:** ژنکا گەردەن درێژ.
**الجير:** ١- گێچ. ٢- کسل.
**جيران:** جینار؛ هەڤسوی.
**الجيزة:** ١- رەخێ نهالێ. ٢- رەخ؛ لا.
**الجيش:** لەشکەر.
**جيفـة:** ١- پیسـاتی. ٢- تشـتێ حـەفنی. ٣- کەلەخێ حەیوانێ مرار و گەنی.
**الجيل:** دەستە.
**الجيهل(الجيهلـة):** ١- دارێ پـێ ئـاگری تێکڤەددن. ٢- مەزن.
**الجيوديزيـة:** زانسـتێ ل دۆر پیڤانـا پانیـا عـەردیێت بـەرین کـو پـێ تخویبێـت وەلاتـا دهێنە دانان(یۆنانی) یە.
**جيولوجيا:** زانستێ تەبەقێت عەردی.

# پیتا ( ح )

**ح:** پیتا شەشێ یا ژ ئەلفابێیا عەرەبی، هژمارا وێ د حسێبا ئەبجەدی دا دبیتە (٨).

**الحائر:** ١- یێ حێبەتی. ٢- جهێ خرڤەبوونا ئاڤێ. ٣- جهێ ڕەختێت وی د بلند. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە ئەوێ ل دۆر (القطب)ی دزڤڕیت یێ زڤڕینا هەبوونێ ل دۆر وی.

**حائز:** کاریتە.

**حائض:** ژنکا ب ژڤان ئانکو خوینێ دبینت.

**حائط العجوز:** دیوارەک بوو پیرەژنەکێ ل سەر کنارێ رووبارێ نیلێ ئاڤاکری دا دەهبەیێت کورێ وێ خوارێن ژێ نەڤەخۆن(ئەفسانە).

**الحائطیة:** دویڤچوویێت (أحمد بن حائط)ن یێ کو دبیتە ئێک الزهەڤالێت (النظام)، ئەڤ سەرداچوویە دبێژن: دو خودێ یێت هەین، ئێک یێ کەڤنە کو خودێ یە و ئیک یێ نوی یە کو عیسا پێغەمبەرە یێ کو تنێ ئەو ب کارێ لێگرتنێ ل ڕۆژا قیامەتێ ڕادبیت.

**حائط:** ١- دیوار. ٢- بیستان.

**حائف:** زۆردار.

**حائل:** ١- کەتی ناڤبەینێ. ٢- ڕەنگگوهارتی. ٣- ناڤێ باژێرەکێ سعوودیێ یە. ٤- خرش. ٥- یێ سالەک د سەر ڕا بۆری. ٦- بێبار (دەوار). ٧- شەلاندی؛ کورتان ژێکری.

**حائن:** بێعەقل.

**الحائن:** یێ مری.

**الحائنة:** مسیبەت.

**حاب:** گونەهکر.

**الحاب:** گونەه.

**الحابة:** گونەه.

**حابس:** یێ ب زیندانکرنێ ڕابووی.

**الحابسة:** حێشترێت ل مال گرێدایی.

**حاب:** گونەهکار.

**حابل:** ١- ئەوێ هەفسارێ حێشترێ دکێشیت. ٢- ژنکا بحال. ٣- یێ داڤا ددانت ژ بۆ نێچیرێ. ٤- ساحر.

**حابي:** ناڤێ رووبارێ نیلێ بوو وەک خوداوەنک ژ لایێ مسریان ڤە دهاتە پەرستن.

**حات:** ل دۆر زڤڕی.

**حاتم:** ١- قرا ڕەش. ٢- دادوەر. ٣- ڕەش.
**الحتمة:** ڕەشاتی.
**حاج:** پێدڤیبوو.
**حاجب:** ١- برهو. ٢- پەردە. ٣- سکرتێر. ٤- دەرگەهڤان. ٥- د (علم البدیع) دا دبیتە ئەو پەیڤا ل بەری سەروایا شعرێ دوبارە دبیت.
**الحاج:** حەجی.
**الحاجة:** پێدڤی؛ پێویستی.
**الحاجر:** قەدەغەکار.
**الحاجز:** ١- سکر. ٢- ناڤبڕ.
**الحاجم:** یێ خوین ژ پشتا خۆ بەردای.
**حاد:** بەرێ خۆ دا ڕەخەکێ ڕێکی و چوو.
**الحاد:** ١- تیژ؛ خۆش. ٢- ئەوێ خۆ دایە لایەکی.
**حادث:** ١- سەقاکر. ٢- دگەل ئاخڤت.
**الحادث:** ١- ڕویدایی. ٢- نوی پەیدابووی.
**الحادثة:** ڕویدان.
**حادر:** بلند.
**الحادي:** یێ سەرێ حێشترێ دکێشیت و د بەر ڕا سترانا دبێژت.
**الحاذورة:** یێ گەلەک هشیار.
**الحادورة:** بارینا روندکا.
**الحادي:** یێ ئێکێ.
**حاذ:** ١- ب لەز هاژۆت. ٢- ل دۆر زڤڕی. ٣- پارازت.
**الحاذق:** ١- یێ ژیر. ٢- یێ بسپۆر. ٣- یێ زیرەک.
**حار(بتشدید الراء):** ١- گەرم. ٢- تیژ.
**حار:** ١- زڤڕی. ٢- کێمبوو پشتی زێدەبووی. ٣- شویشت. ٤- سپیکر. ٥- ڕێ بەرزەکر و ڤێنەکەڤت. ٦- ل تشتەکی نێڕی و چاڤیت وی تاری بوون. ٧- ب ڕاستیێ نەکەڤت. ٨- هات و چوو و لێک خڕڤەبوو.
**حارب:** شەڕکر.
**الحارة:** ١- مەیدانا گرۆڤر. ٢- تاخ.

**حارث:** ١- شێر. ٢- ئەوێ عەرد کێلای.
**الحارث:** یێ جۆت کری.
**حارس:** زێرەڤان.
**حارس السماء:** ناڤێ ئەختەرەکێ یە.
**حارس السماک:** ناڤێ ئەختەرەکێ یە.
**حارک(کاهل):** مل.
**الحاریة:** مارێ مەزن و کورت.
**حاز:** ١- ب نەرمی ب ڕێڤەچوو. ٢- وەرگرت. ٣- ب دەستڤەئینا.
**الحازب:** بەلا؛ مسیبەت.
**الحازر:** تامترش.
**الحازرة:** حێشتر بهێز و باش.
**حازق:** پێلاڤتەنگ.
**حازم:** عاقلدار؛ ژیر.
**الحازي:** ١- شارەزا. ٢- پێشبینکار.
**حاس:** ١- ب ناڤکەڤت و تەڕابەڕاکرن. ٢- پێلێنا دەمێ دخڕاند. ٣- کەڤلکر.
**حاسب:** لێگرت.
**حاسة:** هەستەوەر؛ پێهەست.
**حاسد:** حەسوید.
**الحاسر:** سەرکۆل.
**حاسم:** کوتاکەر.
**حاسوب:** کومپیوتەر.
**حاش:** ١- خڕڤەکرن و هاژۆتن(پەز). ٢- ل دۆرزڤڕی. ٣- هاریکر.
**حاشا:** ژبلی.
**حاشک:** گەلەک بەرهەم دایی.
**حاشم:** تنگژی؛ کەربڤەبووی.
**حاشی:** نەدا دگەل.
**الحاشد:** ١- یێ خۆ ئامادەکری. ٢- یێ حێشترێ ددۆشت. ٣- بستیکا گەلەک فیقی پێڤە.
**الحاشیة:** ١- پەراوێز. ٢- نێزیکێت میر و شاها. ٣- ڕەخ.
**حاسن:** ١- ژ لایێ جوانیێ ڤە ژ وی زێدەکر. ٢- ب جوانی سەرەدەری دگەل کر. ٣- شانازی پێ بر.

**حاص:** ١- خۆ ژێ ڤەدا. ٢- ل دۆر زڤری.
**حاصب:** ١- بایێ بەرەشیشک دگەل. ٢- کۆما زارۆکا.
**حاصب:** هوریێ بەرەشیشک دگەل.
**الحاصة:** ئێشەکی سەری دوەربنت.
**حاصد:** ئەوێ دورینێ دکەت.
**الحاصدة:** دەراسا دورینێ.
**حاصل:** ١- بەرهەم. ٢- ئەنجام.
**حاضت:** کەتە ژڤانی(خوین دیت).
**حاضر:** ١- ئامادە؛ حازر. ٢- نوکە.
**الحاضرة:** ١- شارگەهـ؛ جهێ باژێر و ئاڤاهیا. ٢- باژێـــرێ مەزن. ٣- گوهێ فیلی.
**الحاضنة:** ١- دایین. ٢- بالندەیێ کورکێ ل سەر هێکا.
**حاط:** پارازت و سەخبێرکر و ب سۆخۆڤەگرت.
**الحاطب:** دارکێش؛ دارڤان.
**حاطب الليل:** دارکیشێ شەڤێ، کنایەتە بۆ وی کەسێ های ژ ئەزمانێ خۆ نە و باشی و خرابیێ و درەوێ و ڕاستیێ تیکهەلدکەت.
**الحاطوم:** ١- سالا سەخت. ٢- ئەو دەرمانە یان خوارنە یێ زادی حەل دکەت.
**حاف:** زۆرداریکر.
**حاف:** پێخاس.
**الحافان:** دو ڕهیت خوینێ یێت شینن ل بن ئەزمانی.
**حافد:** ١- نەڤی. ٢- پشتەڤان.٣- دویڤچوو. ٤- خزمەتکار.
**حافر:** سم؛ کاب.
**الحـــافرة:** ١- چـــال. ٢- خولقـــەتا ئێکـــێ. ٣- گۆڕ. ٤- دەسپیکا تشتی.
**الحافظ:** ١- پارێزکار. ٢- ژ ناڤێت خودێ یە. ٣- ڕێکـا دیـار و چـو جـارا بەرزەنـەبیت. ٤- یـێ قورئـان ژبـەرکری. ٥- یـێ پتـر ژ (١٠٠)هزار فەرمۆدەییێت پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ژبەرکری.
**الحافظة:** بیردانک.
**حافل:** ١- تژی. ٢- گەلەک. ٣- زەحف.
**حافلة:** ١- یا تژی. ٢- پاصا گوزاری.

**حافي:** پێخاس.
**حـاق:** ١- ل دۆر زڤـری. ٢- ل سـەر فـەرکر. ٣- کار تێ کر.
**الحاق:** نیڤەکا تشتی.
**الحاقـة:** ١- یـا حـەقییێ ب جهـ دئینـت. ٢- ژ ناڤێت رۆژا قیامەتێ یە.
**حاقد:** کیندار.
**حاقف:** بادای و درێژ.
**الحاقن:** میزەواقی.
**الحاقنـة:** ١- ژنکـا میزەواقـی. ٢- مەعـدە. ٣- مابـەینا هـەردو هەسـتییێت سـتۆی ژ سینگی ئانکو دبن چالکا ستۆی.
**حاقل:** دەرامەتێ خۆ هێژ سومبل فرۆت.
**حاك:** ١- چوو و مل و قوونێت خۆ هەژانـدن. ٢- تەڤنکر. ٣- ڕیکخست.
**حاكي:** زارڤەکر.
**حاكم:** داخوازکرە نک حاکمی.
**الحاكم:** ١- دادوەر. ٢- سەرۆک.
**الحاكمان:** هەدو حاکم، ل نـک سۆفیا دبیتـە: جیهانــا نەلبــەرچاڤ (عــالم الغيــب) و جیهانا لبەرچاڤ (عالم الشهادة).
**الحاكمية:** سالۆخەتێ حاکمی.
**الحاكي:** یێ زارڤەکرنێ دکەت.
**حــال:** ١- کەتــە ناڤبــەینێ. ٢- ژ کاودانــەکی هاتــە گوهـۆڕین بـۆ ئێکـەدی. ٣- خواربـوو. ٤- هاتــە گوهـۆڕین. ٥- خـۆ ڤـەگوهازت ژ جهەکی بۆ ئێکەدی.
**الحال(حالة):** کاودان، دەستودار، ڕەوش.
**الحال:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبیتـە: ڕامانەکە ژ نـک خـودێ دکەڤیتـە دلـێ مریـدی دەمـێ دهێت نەشێت ب هیچ کارەکی ژ خۆ بەتە پاش و دەمـێ دچیت ب هیچ ڕاسپاردەکێ بگریت و زەبکەت.
**حالب:** دگەل دۆت.
**الحالــب:** ١- میــزی. ٢- ڕهــا شــیری. ٣- یێ ددۆشیت.

**حالبة:** ١- ڕها گوهانی. ٢- یا ددۆشت.
**الحالبي:** جۆرەکێ گیایە، کولیلکێت وی دزرن وەکی ییێت بەیبوینانە، د کەڤن دا ژ بۆ جارەکرنا میزییا دهاتە ب کارئینان.
**حالة:** کاودان.
**حالف:** ١- پەیمان گرێدا. ٢- سۆز دا.
**الحالق:** ١- ئەوی هەمی تشتا دتراشت و ڕویت دکەت وەکو گویزان و سالێت هشک و هنەک جۆرە گونەها. ٢- چیایێ بلند و بێ گیا.
**حالق الشعر:** ١- مویتراش. ٢- جۆرەکێ گیایە، خۆ د دارا دئالینت و ڕهێت وی خۆ بداری ڤە دگریت، فێقیێ وی وەکی وەکی تری یە ژ بۆ گەمارکرنێ دهێتە بکارئینان.
**الحالقة:** ١- هشکەسالا کیا لێ نەمینت. ٢- مرن. ٣- ئاخڤتنا خراب.
**حالوق:** مرن.
**الحالية:** ١- دارا ب خەمل و سیبەر. ٢- ئەوا چەکێت خۆ ئانکو زێریت خۆ ب خۆ ڤە کرین.
**حام:** ١- ل دۆر زڤڕی. ٢- تێهنیبوو.
**حامى:** پارازت.
**حامة:** مرۆڤانیا گەلەک نێزیک یاکو لێزم.
**حامد:** ١- سۆپاسدا. ٢- یێ حەمدا خودێ کری.
**الحامض:** ١- پێکهاتییەکا هێدرۆجینی یە. ٢- ترش.
**حامض الفنیک:** ترشەکێ تافیرکەرە ژ وان زەیتا دهێتەچێکرن ییێت کو ژ سافیکرنا قەترانی پەیدادبن.
**الحامضة:** ترشبوونا تشتی د مەعدێ دا.
**حامق:** هاری بێعەقلیا وی کر.
**الحامل:** ١- بحال؛ بتشت. ٢- زاراڤەکێ مۆزیکێ یە ژ پێنج خیچا پێکدهێت نیشانێت مۆزیکێ ل سەر دهێنە نڤیسین.
**حامل رأس الغول:** ١- هلگرێ سەرێ پیرهەڤیێ. ٢- وێنەیەکێ ستێرایە یێ زەلامەکی یە سەرەکێ د دەستی دا دکەڤیتە لایێ باکۆر ژ عەسمانی.
**الحاملة:** ١- زەمبیل. ٢- دارتەڤن.
**حاملة الطائرات:** کەشتییەکا جەنگی یە فرۆکخانەیەک ل سەرە.
**حامي:** پارێزەر؛ ئەوێ دپارێزت.
**الحامي:** یێ کەل و شاریای.
**حامول:** گەزگەزک؛ جۆرەکێ گیایێ دەشتێ یە یێ ب بەلگە.
**حامي:** ١- پارێزکار. ٢- شێر.
**حامية:** ١- کۆما لەشکەری یا ب کارێ پارێزتنێ ڕادبیت. ٢- شاریای.
**حان:** نێزیکبوو.
**حانط:** ١- زەحف گەنم. ٢- خودانێ گەنمی.
**حانک:** گەلەک تاری.
**حانوت:** دوکان؛ فرۆشگەهـ.
**حانوتي:** دوکاندار.
**حاني:** خوڕست( سالۆخەتێ ڕەنگایە).
**حاور:** دانوستاندن دگەل کرن.
**حاول:** هەولدا، بزاڤکر.
**حب:** ١- ڤیا. ٢- حەژێکر.
**حب الرشاد:** ١- پویز. ٢- تۆڤێ خەندەلکێ.
**حب الغمام:** گژلۆک.
**الحبة الخضراء:** کەزان.
**الحبة السوداء(حبة البركة):** ڕەشرەشک.
**حبة القلب:** کاکلکا دلی.
**الحب(بالضم):** ١- ئەڤین. ٢- دەنێ ئاڤێ.
**الحب(بالفتح):** کۆما (حبة)یە کۆ دبیتە: ١- تۆڤک. ٢- لب، دندک. ٣- کاکلک.
**الحب(بالكسر):** خۆشتڤی.
**حبا:** ١- ل سەر زکی و دەستا چوو. ٢- نێزیکبوو. ٣- ب هەروە دایێ. ٤- کەت و خشیا. ٥- ژێگرت.
**الحبا:** عەورێ گرانێ نێزیکی عەردی دبیت.
**حباء:** ئەو تشتە یێ مرۆڤ پێ خۆ ل بەر هەڤالێ خۆ شرین.
**الحباء(بالكسر):** مەهرا ژنکێ.
**الحباب(بالفتح):** ١- پەقلکێت ئاڤێ. ٢- جۆکێت ئاڤێ.

**الحباب(بالضم):** مار.
**حباب:** فێلباز.
**حباحب:** ستێرستیرۆک.
**حبار:** شوین.
**الحبار:** جۆرەکێ ماسی یە.
**الحباري الكبيرة:** بالندەیێ چرک(بەت).
**الحباري:** بالندەیێ چرک.
**الحباشة:** کۆما مرۆڤا ییت هەر ئیک ژ توخمەکی یان عێلەکی.
**الحباشية:** بالندەیێ ئەلهو.
**الحباط:** زکوەرمین.
**حبالة:** ١- تۆرا نێچیرێ. ٢- خەفک.
**حب إليه:** ل بەر شرین کر.
**حبة:** ١- لبەک؛ کتەک. ٢- حەبکەک (دەرمان).
**الحبة الخضراء:** کەزان.
**الحبة السوداء:** رەشرەشکا نانی.
**حبة القلب:** کاکلکا دلی.
**الحبج:** پشکلێت هێشتا د زکی دا.
**حبحاب:** ١- مرویتۆ. ٢- زەلامێ کورت و کرێت.
**حبذ:** ١- ڤیا. ٢- خوزی راهێلا.
**حبذا:** چخۆشە؛ چباشە.
**حبر:** ١- خەملاند. ٢- جوانکر. ٣- دلخۆشکر.
**الحبر(بالفتح):** خۆشی؛ شادی.
**الحبر(بالضم):** ١- زانایێ چاک. ٢- سەرۆکێ کاهنێت جوهیا. ٣- سەرۆکی دینی. ٤- جوانی. ٥- زەراتیا ددانا.
**الحبر الأعظم:** پاپایێ فەلا.
**الحبرة(بالضم أو الكسر):** ١- جۆرەکێ کورکێت یەمەنی یە. ٢- شەملکەکا رەشە ژ نک ل خۆ دکەن دەمێ ژ مال دەردکەڤن. ٣- خۆشی و شادی.
**الحبرة:** زەراتیا ددانا.
**الحبرج:** بالندەیێ چرک؛ چرکێ نێر.
**الحبرور(الحبرير):** تێژکێ جرکێ.
**الحبرم:** ل (الحبارى الكبيرة)بزڤرە.
**الحبورة:** ئیمامەتی.
**حبس:** ١- گرت. ٢- زیندانکر. ٣- نەهێلا بچیت.
**الحبس:** زیندان؛ گرتیخانە.
**حبس البول:** میزەواقی.
**حبس الطمث:** نەهاتنا خوینا ژڤانی.
**الحبسة(بالضم):** نەدەرکەڤتنا ئاخڤتنێ.
**حبش:** خڕڤەکر.
**الحبشة:** وەلاتێ حەبەشە یێ کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ کیشوەرێ ئەفریقیا هەمبەر یەمەنێ نوکە دبێژنێ: (ئەثیۆبیا).
**الحبشية:** ١- حێشترێت گەلەک د رەش. ٢- مویرێت رەش و مەزن.
**حبض:** ١- ب بەر پیت تیرڤانی کەڤت ئانکو بەر ب ئامانجێ نەچوو(تیر). ١- کێمبوو. ٣- بەتالکر.
**حبط:** ١- پویچبوو. ٢- ب هەروە چوو.
**الحبط:** ١- شونێت شڤک و دارا ل لەشێ مرۆڤی. ٢- وەرەما ژ قوتانێ چێدبت.
**حبق البقرة(إقحوان):** بەیبوین.
**حبق:** ١- خەبەر گوتن. ٢- دانایێ. ٣- ترەککر.
**الحبق:** ریحان.
**حبق البقر:** بەیبوین.
**الحبق البستاني:** گیایەکێ وەکی بەیبوینێ یە یێ بەلک مەزنە.
**حبق ترجاني:** گەزنگ.
**حبق الماء:** گیایێ نەعنا.
**الحبک(بالضم):** چیت؛ تانێ لەڤەنا یان قەرەمی یێ ددەنە دۆرێت خیڤەتا.
**الحبكة:** پشتیتی؛ شوتک.
**حبک:** ١- دانایێ. ٢- ل دۆر خۆ وەراند. ٣- گرێدا. ٤- تەڤنێ وی باش چێکر.
**الحبيكة:** ١- گیخێت ل عەردی چێدبن ژ ئنجامێ هلمشت و با و بارانا. ٢- تایێ پرچێ یێ ددەنە دگەل دو ییت دی و دڤەهوینن. ٣- ریکێت ئەسمانی.

**حبل:** داف ڤەدان.
**الحبل(بـــالفتح والســـكون):** ١- هەفســـار. ٢- وەریس. ٣- گرێ خیزی یێ درێژۆک و ل هنداڤا. ٤- دەمارا خوینێ.
**الحبل(بالكسر):** ١- زانا. ٢- زیرەکێ کەس نەشێتێ.
**الحبل(بفتحتين):** ١- دوگیانبوون. ٢- مێوی.
**حبل الشعر:** وەریس.
**حبل الوريد:** دەمارا ستۆی.
**حبلة:** مێوا تری.
**حبلى:** بحال؛ بتشت.
**حبن:** زکێ وی مەزن بوو و وەرمی.
**الحبن(بالفتح):** کولکا ب عەداف.
**الحبن(بالكسر):** مەیموینک.
**الحبوب:** کۆما (حبة) یە. ١- دان و دکاک. ٢- تۆڤێ گیای. ٣- حەبک (دەرمان).
**الحبوة:** ١- دان؛ بەخین. ٢- پارچەیا پەرۆکی یا پێ ئەندامەکی بپێچن.
**حبور:** جوانی؛ خەمل.
**الحبي:** عەورێ شۆر.
**الحبيـــب:** ١- خۆشـــتڤی. ٢- ل نـــک ســـۆفیا خودێ یە.
**حبيس:** زیندانی.
**حبيكة:** رێ.
**الحبينة:** چەپچەپیسک.
**حت(بالتشـــديد):** ١- پەرخانـــد و ژێڤـــەکر. ٢- وەراند؛ ژ بەلگا داقوتا. ٣- وەریا.
**الحت:** ١- بەزەک. ٢- کولیێ مری.
**حتى:** ١- هەتا. ٢- داکو.
**الحتات(بالضم):** تشتێ بژالەبووی.
**الحتار:** تشـــتێ ل دۆر تشـــی وەکـــی گوشـــتێ ل دۆر نینۆکێ یان کەڤیا مۆخلێ.
**الحتـــت:** ئیشـــەکە دکەڤیتـــە داوبـــاری و بـــەلگا دوەرینت.
**حتحت:** وەریا.
**حتر:** زادێ وی کێمبوو.

**الحترة:** مێژەکا شیری.
**حترش:** کرێنی ژێ ئینا.
**الحترشة:** دەنگێ کولی خوارنا گیای دئینت.
**الحترفة:** ١- سۆراتیا چاڤی. ٢- زڤری.
**الحتروش:** بچویکێ جک و ب بزاڤ.
**الحتف:** مرنا سرۆشتی.
**الحتک:** تێژکا نەعامێ.
**حتم(بالتشديد):** کرە ئەرک، فەرکر.
**حتم(بالتشديد):** ل سەر فەر کر.
**الحتم:** دادگەهکرن.
**حتمي:** ١- پێدڤی. ٢- ڤەبری. ٣- بێـی هیڤـە و ویڤە؛ سەد دەر سەد.
**الحتيرة:** زادێ پالا.
**الحتمية:** رێبازەکا فەلسـەفی یـە دبێـژت: هـەر دیـادەکێ ئەگـەرا خـۆ یـا هـەی و یاسـایێت نەگوهۆر یێت د ناڤبـەرا دیاردا و ئەگـەرا دا هەین.
**حتن:** دژواربوو.
**حتى:** هەتاکو.
**حث(بالتشديد):** هاندا.
**الحث(بالضم):** ١- هوبرکێ کـایێ. ٢- نـان. ٣- خیزێ نازک.
**حثا:** ١- کرە سەر. ٢- کێم دایێ.
**الحثاث:** ١- لەز. ٢- خەوا سڤک.
**حثالة:** سڤیا دانی.
**حثحث:** ١- لڤی. ٢- هات و چوو.
**حثر:** کول و پێت لێ هاتن.
**الحثر:** بێخێر.
**حثرب:** شێلیبوو.
**الحثرب:** ئاڤا شێلی.
**حثل:** زکێ وی مەزنبوو.
**الحثلة:** ئاڤا کێما د برکێ دا.
**حثم:** ١- دایێ. ٢- باش پەرخاند.
**الحثمة:** تمبلکێ دفنێ.
**حثى:** پێوەرکر.
**الحثواء:** عەردێ ب ئاخ.

**حثيث:** ب لەز.
**حج(بالتشديد):** ١- حەجکر. ٢- بەرێ خۆ دا.
**الحج:** یێ ژ هەژی.
**الحج:** ١- قەستکرنا تشتەکێ مەزن و پیرۆز. ٢- قەستکرنا مالا خودێ ژ بۆ کارکێ تایبەت ل دەمەکێ تایبەت ل مەرجەکێ تایبەت.
**حجا:** گومانبر.
**حجا بالأمر:** شک ژێ بر و ل دویڤ وێ شکێ کره ی خۆ.
**حجأ بالأمر:** کەیفا وی پێ هات.
**حجا بالسر:** ڤەشارت.
**حجا:** عەقل.
**الحجى:** عەقل.
**الحجا:** ١- عەردێ بلند. ٢- بنێ نهالێ.
**الحجاب:** ١- نڤشتی. ٢- پەردە. ٣- ناڤبر. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە ئەو تشتێ دبیتە ناڤبر د ناڤبەرا تشتی و ئەوێ قەست دکەتێ.
**الحجاة:** پەقلکا ئاڤا بارانێ یا ل سەر ئاڤێ.
**حجاج:** هەستییێ پشتا چاڤی یێ برهو ل سەر.
**الحجار:** وێنەیەکێ ژ ستێرایە ل عەسمانی.
**الحجاز:** ١- شویتک؛ پشتینی. ٢- ئەو زنجیرا چیایا یە یاکو ل رۆژئاڤایێ گزیرتا عەرەبی و ل درێژاهیا دەشتا (تهامة) یاکو دکەڤیتە سەر کەنارێ دەریایا سۆر و وێ و بانیا (نجد) ژێکجودا دکەت. ٣- ناڤێ مەقامەکێ سترانا یە.
**الحجام:** تشتێ دکەنە د دەڤێ حێشترێ دا دا لەقا نەدانت.
**الحجام:** یێ کارێ خوینبەردانێ ژ پشتا دکەت.
**الحجامة:** خوینژپشتێبەردان.
**الحجب:** ١- بێبەهرکرنا کەسەکی ژ میراتێ وی. ٢- ژ بەرچاڤبرن؛ ژدیتنێکرن.
**الحجة(بالضم):** ١- هێجەت. ٢- دلیل، بەلگە.
**الحجة(بالكسر):** ١- سال. ٢- ئێک حەج.
**حجة الوداع:** حەجا خاترخوازتنێ؛ حەجا دویماهیێ یە یا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن کری کو ل سالا (١٠)ی کۆچیبوو، دیسا دبێژنێ: (حجة التمام) یان (حجة الكمال) یان (حجة البلاغ).
**الحجة(بالفتح):** ١- تشتێ ب گوهی ڤە دکەن. ٢- تمبلکێ گوهی.
**حجر:** بەر.
**الحجران:** قەدەغەکرن.
**الحجر الأسود:** بەرێ رەش.
**حجر البقر:** کولیلگا.
**حجر التيس:** دەرمانەکێ دژی ژەهرێ یە.
**حجر الحديد:** مەغناتیس.
**حجر الطور:** جۆرەکێ بەرێ وەکی نیسکێ یە؛ چەند رەنگ ژێ هەنە وەکی سۆری و شینی و سپی و زەی، ل ئیرانێ هەیە، د کەڤن دا ژ بۆ حەسەدێ دهاتە ب کارئینان.
**حجر الحليب:** مۆرکا شیری.
**حجر السم:** دەرمانەکێ دژی ژەهرێ یە.
**حجر الفلاسفة:** ل (الإكسير) بزڤرە.
**حجر القدح:** بەرێ ستەی لێ ددەن دا کریسک ژێ بچن.
**حجر القمر:** جۆرەکێ بەری یە ژ بۆ چێکرنا جەواهرا دهێتە ب کارئینان، د کەڤن دا وەک دەرمانێ هندەک ئێشا دهاتە ب کارئینان.
**حجر الكحل:** بەرێ کلی، ئەوە یێ دەرمانێ رەشێ کلدانا چاڤا ژێ دهێتە چێکرن.
**حجر المسن:** بەراڤ؛ بەرێ خۆشکرنا کێر و ئامویرا.
**حجر المقس:** مۆرکا شیری.
**حجر النور:** بەرێ رۆناهیێ، د کەڤن دا ژ بۆ حەسەدێ دهاتە ب کارئینان.
**حجر عليه:** قەدەغەکر دەستکاری تێدا بهێتە کرن.

**الحجر(بالفتح والسكون):** قەدەغەكرن.
**حجر:** كونا ماری.
**الحجر الكعبة:** دیوارێ كەعبێ یە لایێ باكۆر كو ژ لایێ ئیبراهیم پێغەمبەری ڤە هاتبوو ئاڤاكرن، دبێژن: گۆڕێ هاجەرا كابانیا وی ل وێ درێ یە، دیسا دبێژنێ: (حجر إسماعیل).
**الحجران:** زێڕ و زیڤ.
**حجرة(بالفتح):** رەخ؛ لا.
**حجرة(بالضم):** ژۆر، ئۆدە.
**حجز:** ١- دەست دانا سەر. ٢- قەدەغەكر.
**الحجز:** ١- دەستلسەردانان. ٢- قەدەغەكرن.
**حجزة:** مالدوخین.
**حجف:** مەتالێ ژ كەڤلی.
**حجفة:** مەتال.
**حجل:** ١- ب ئیشقلكی چوو. ٢- ب لۆتا چوو.
**الحجل(بالكسر):** ١- بەند. ٢- خلخالا لنگا. ٣- بازا ل لنگێ ئاژەلی.
**الحجل الرومي(قبج):** كەو.
**الحجل:** سووسک.
**الحجلة:** ١- پەریا بویک و زاڤا. ٢- عەجەلۆكا بچویكا.
**الحجم:** قەبارە.
**حجم:** ١- قەدەغەكر. ٢- ژێ دویركر.
**حجن:** خواركر.
**حجة(بضم الحاء):** سال.
**حجی به:** لێ عاشق بوو.
**الحجی:** عەقل.
**الحجون:** تەمبەل.
**الحجیر:** یێ ب بەر(عەرد).
**الحجیز:** یێ دەست ل سەر دانایی.
**الحجیم:** یێ مەزن.
**الحجیلاء:** ئاڤا تاڤ لێ نەدەت.
**حد(بالتشدید):** ١- خۆشكر؛ تیژكر. ٢- ڤەدەركر. ٣- سزادا.
**الحد:** ١- تخویب؛ مەرز. ٢- دویماهیا تشتی. ٣- ناڤبڕ.
**حدئ إلیه او علیه:** پشتەڤانیا وی كر و نەهێلا زۆرداری لێ ببت.
**حدأ علیه:** دلێ وی ما پێڤە.
**حدا:** ١- هاژۆت. ٢- ستران بۆ گۆت دا بچت.
**الحداء:** سترانگۆتن ل دەمێ كێشانا هەفساری حیشترێ.
**الحداء:** سویسک.
**الحداة السوداء:** بالندەیێ كۆرارە.
**الحداة:** بالندەیێ كۆرارە.
**الحدأة:** بڤرێ دو سەر.
**حداثة:** ١- نوییاتی. ٢- بچویكاتی.
**الحداجة:** ئەو جهە یێ بۆ ژنكێ ل سەر پشتا دەواری چێدكەن وەكی مەحافێ.
**الحداد(بالفتح):** ١- ئاسنگەر. ٢- دەرگەهڤان.
**الحداد(بالكسر):** ١- تازی. ٢- جلكێ ڕەشێ خەمێ.
**الحداد(بالضم):** ١- ئارمانج؛ مەبەست. ٢- زەحمەت.
**الحدادة(بالكسر):** ئاسنگەری.
**الحدادة(بالفتح):** كابانی.
**الحدام:** تنگژین.
**حدی:** ژ بەرازی كر.
**حدب علیه:** لێ زڤڕی و ژێ ڤەنەبوو.
**حدب عنه:** بەرەڤانی ژێ كر.
**حدب:** پشتخواری؛ پشتقۆزی.
**الحدب:** ١- جهێ بلند ژ عەردی. ٢- شوینا تشتی ل لەشی. ٣- پێل. ٤- لێكسواربوونا ئاڤێ ل دەمێ هەركینێ.
**حدباء:** ١- ژنكا پشتقۆز. ٢- داربەست. ٣- دەوارێ لەغەرێ هەستیێ پشتێ لێ دیاربووی. ٤- سالا خەلا و گرانی.
**حدبة:** ١- ملک؛ گرک. ٢- كۆدێ پشتێ.
**حدث:** ١- رویدا. ٢- پەیدابوو. ٣- ژنوی چێبوو.

**الحدث:** ١- گوی. ٢- کاری ڕویدای. ٣- مسیبەتا زەمانی. ٤- بۆیەر. ٥- گەنج. ٦- ل نک سۆفیا دبیتە ئەو تشتێ نەهەیی و پەیدابووی.

**الحدثان:** چێبوون؛ پەیدابوون.

**حدج:** ١- گرێدا. ٢- نیشان لێکر.

**الحدج:** ١- بار. ٢- کەرکا بترشۆکێ.

**حدجة:** هاڤێتێ.

**حدد(بالتشدید):** ١- دەستنیشانکر. ٢- ڤەبڕی. ٣- تخوبیدا.

**حدر:** ١- لەزکر. ٢- گرێلکر. ٣- ئینا خوار. ٤- هاتەخوار. ٥- باری.

**حدر:** ل بن؛ ل ژێر.

**الحدر:** ١- دۆل؛ عەردێ بەرخوار. ٢- ویروی یا چاڤی.

**حدرة:** بویتکا چاڤی.

**الحدرة:** یێ گر.

**حدره:** ١- ژێ داپاش. ٢- گرێلکر.

**حدس به:** هاڤێت.

**حدس بها الشاة:** رازاند دا سەرژێبکەت.

**حدس لهم:** بۆ وان سەرژێکر.

**حدس:** ١- هزرەکا دروستکر. ٢- لەزکر. ٣- تەخمین تێدا کر.

**الحدس:** لەزا تێگەهشتن و گەهشتنا ئەنجاما.

**الحدسیات:** ١- ئەو تشتن یێت ژ بەر دوبارەبوونا دیتنا وان پێدڤی چو حوکما نەبن وەکی هەکە مرۆڤ بێژیت رۆناهیا هەیڤێ ژ رۆژێ یە. ٢- ئەو بابەتن یێت کو مرۆڤ ب رێکا (الحدس) دگەهیتێ.

**حدق:** چاڤێ خۆ ڤەکر و زلقوتاند.

**حدق( بتشدید الدال):** ١- ل دۆر زڤری. ٢- باش تێفوکری.

**الحدق:** باجانرەشک.

**حدق إلیه:** ب دژواری تێفوکری.

**حدقة:** ڕەشکا چاڤی.

**حدل:** ١- ڕاستکر. ٢- بەرێ خۆ دایێ دا زۆرداریێ لێ بکەت.

**حدم:** شاراند.

**الحدم:** شاریانا ئاگری.

**الحدو:** سترانگۆتن.

**الحدواء:** بایێ باکۆر.

**الحوادي:** پێ.

**الحدوث:** پەیدابوونا پشتی نەبوونێ.

**الحدوثة:** نوبیاتی.

**الحدور:** دۆلبوون؛ گرێلبوون.

**الحدورة:** بارینا رۆندکا.

**الحدیا:** ١- هەڤرک. ٢- قەبخواز.

**حدیث:** ١- ئاخڤتن. ٢- فەرمۆدە.

**الحدیث الحسن:** ئەو فەرمۆدەیە یا ئێکێ ب ناڤودەنگ ب ئێمانەت و دورست ڤەدگوهێزیت، بەلێ ناگەهیتە پلەیا (الحدیث الصحیح).

**الحدیث الصحیح:** ئەو ڤەرمۆدەیە یا کو ژ کیماسیێت زمانی و جوداهیێ دگەل رامانێت قورئانێ پارازتی ب ریکەکا دورست ژ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هاتیە ڤەگوهازتن.

**الحدیث القدسي:** ئەو فەرمۆدەیە یا کو رامانا وێ ژ نک خودێ و پەیڤا وێ ژ نک پێغەمبەری سلاڤ لێ بن.

**حدید:** ١- ئاسن. ٢- تیژ، دویربین.

**حدیدة:** پرتا ئاسنی.

**الحدیس:** یێ ئێخستینە عەردی.

**حدیقة:** باغچێ دیوارکری.

**حذ:** سڤک بڕی.

**حذا:** ١- پێوەرکر. ٢- ل دویڤ چوو. ٣- پێگرت.

**حذاء:** پێلاڤ.

**حذاء(بتشدید الذال):** نالبند.

**حذاء:** بەرانبەر.

**حذافة:** ١- ئەو تشتە یێ تو ژ تشتەکی ڤەدکەی و دهاڤێژی. ٢- یێ ب ساناهی.

**حذافير:** كۆما (حذفار)ە يان (حذفور)ە كو بيته: گشت؛ هەمی.
**الحذاقي:** ١- كێرا خۆش و بڕەک. ٢- كەر (حەيوان).
**حذالة:** لێڤا كراسی.
**الحذام:** گرانەیێ تەمبەل.
**حذام:** ناڤێ ژنكەكا چاڤخۆشبوو دگۆتنێ: (زرقاء اليمامة).
**الحذة:** پرت.
**الحذذ:** ١- سڤكاتيا دەستی. ٢- سڤكاتيا لڤاندنا كوريێ.
**حذر:** خۆ پاراستن.
**حذر(بتشديد الذال):** لێ هشياركر.
**الحذر:** هشياری.
**حذف:** ژێبر.
**الحذف:** ژێبرن.
**الحذف الشتوي:** بالندەیێ جورەک.
**الحذف الصيفي:** بالندەیێ پشتچاڤباز.
**الحذفار(الحذفور):** ١- خۆئامادەكرن. ٢- رەخ؛ لا. ٣- كۆماهيا مەزن. ٤- ئەوێت خۆ ژ بۆ شەڕی ئامادەكرین.
**حذف في مشيه:** خۆ هەژاند.
**الحذف:** تێوەركرنا دارا.
**حذف:** ژێ ڕاكر، ژێ هاڤێت.
**حذفه بالعصا:** ب داری دانایێ.
**حذق:** ١- هەمی زانی. ٢- بڕی. ٣- ترشبوو هەتا ئەزمان ئێشاندی.
**الحذق:** ١- ژیر؛ تێگەهەشتی. ٢- باجانڕشک.
**حذل:** مويێت وی وەريان.
**الحذل(بالفتح):** وەريانا مژويلانكێت چاڤی.
**الحذل:** دۆرماندۆرا ليڤكا دەهمەنا كراسی.
**الحذلاء:** چاڤێ مژويلانک ژێ وەريای.
**حذلق:** خۆ وەسا ديارکر کو يێ ژيرە.
**الخذلق:** پربێژێ نەزان.
**حذلک:** برِبێژێ ئاخڤتن درەو.
**حذلم:** لەزكر.
**الحذلوم:** پێسڤکێ بەزەک.
**حذم:** ١- بڕی. ٢- لەزكر. ٣- ب گرانی کر.
**الحذم:** فڕينا بالندەیێ پەرقوساندی.
**الحذو:** بەرانبەركرنا دو تشتا.
**حذوة:** پرت.
**الحذور:** يێ هشيار.
**حذى:** بڕی.
**الحذر:** يێ هشيار.
**الحذيق:** يێ بڕی.
**حذيا:** ١- دان؛ تشتێ دهێته دان. ٢- مزگينی؛ خەلاتێ مزگينگەهينی.
**حذية:** پرت.
**حر:** هاتە ئازادكرن.
**الحر(الضم):** ١- ئازاد. ٢- بەردايی. ٣- خوڕست. ٣- بالندەیێ بازی. ٤- تێژکێ كۆترێ.
**الحر(بالفتح):** ١- گەرمی. ٢- عەزابا ب ئێش. ٣- تارياتيا زەحف.
**حرا:** ١- گۆرەپان. ٢- ڕەخ. ٣- يێ ژهەژی. ٤- دەنگ.
**الحراب:** شەڕکرن.
**الحراث:** جۆتکەر.
**الحراثة:** ١- كێلان. ٢- جۆتياری.
**الحراج:** فرۆتنا ل سەرئێكزێدەكرنێ.
**الحرار:** ئازادبوون.
**الحرارة:** گەرماتی.
**حراسة:** زێرەڤانی.
**الحراش:** مارێ ڕەش.
**الحراشف:** كۆما(حرشف)ە كو دبيته: پيلەكێت ماسی.
**الحرافة:** تيژاتی(تام).
**الحراق:** ١- ئاڤا گەلەک سوير. ٢- يێ هەرتشتەكی خراب دكەت. ٣- هەسپێ بەزەک.
**الحراقة(الفتح):** كەشتيا ئاگری پێ ب دۆژمنی وەردكەن.

**حراك:** لڤین.
**الحران:** یێ تێهنکاتی یا وی یا دژوار بیت.
**الحرام(بالفتح):** یێ حەرام ئانکو یێ دینی حەرامکری.
**الحرام(بالکسر):** ١- جلکەکی ژ بەر سەرمایێ ل خۆ دکەن. ٢- پارچەیەکا پەڕۆکێ هریێ یە ل دەمێ نڤستنێ د خۆ وەردکەن.
**الحراوة:** تیژاتیا خەندەلکێ.
**حرب:** شەلاند.
**الحرب:** جەنگ؛ شەڕ.
**الحرب الصاعقة(الخاطفة):** ئەو شەڕە یێ ب هێزا تۆپ و مۆشەکا و لڤینا لەشکەری ب لەز دهێتە کرن.
**الحرباء(بالفتح):** خۆربان؛ جۆرەکێ خشوکایە ڕەنگێ خۆ ل دویڤ ڕەنگێ جهێ لێ دگوهۆریت.
**الحرباء(بالکسر):** ١- بسمارا زریپۆشی. ٢- گوشتێ پشتێ.
**الحربة:** ١- سنگۆ. ٢- کورتەرِوم. ٣- ڕۆژا ئەینی. ٤- فەسادا دینی.
**الحربي:** جەنگی.
**الحربش:** مارێ مەزن.
**حرة(بالضم):** ژنا ئازاد.
**حرة(بالفتح):** عەردێ بەرێت وی ڕەش.
**الحرة(بالکسر):** تێهناتی.
**حرت:** باش پەرخاند.
**الحرت:** کرێنا دەواری دەمێ تشتەکی دخۆت.
**الحرث:** ١- زەڤی. ٢- کێلان. ٣- ملک.
**الحرثیة:** قەدەری نە، دویڤچوونێت (أبی الحرث)ن، دبێژن: کریارێت مرۆڤان ژ بۆ خودێ یێت دهاتینە چێکرن.
**الحرج(بالفتح):** ١- تەنگاڤی. ٢- گونەه. ٣- جهێ ب داروبار و بەرتەنگ. ٤- داربەست.
**الحرج(بالکسر):** ١- کۆما پەزی. ٢- باهرا سەی ژ نێچیرێ.
**حرج:** ١- قەدەغەکر. ٢- تەنگاڤکر.
**الحرجة:** ١- بیش. ٢- کۆما پەزی.
**حرجل:** ڕاست و چەپ بازدا.
**الحرجل:** سەلەفەکا سیارا.
**الحرجلة:** ١- سەلەفەکا سیارا. ٢- لەنگەری.
**حرجم:** لێکزڤڕاندن و کۆمکرن(پەز).
**حرد:** ١- تزگژی. ٢- بڕی.
**الحرد:** ١- قەدەغەکرن. ٢- ڕێنەدان. ٣- صەبر ل سەر ئامانجێ کێشا.
**الحردیة(بضم الحاء):** حێسیلا دیوارێ کۆلکی.
**الحرذون:** جۆرەکێ بالندەیێ چەپچەپیسکایە، خەت و خالێت ڕەنگین لێ هەنە و دەڤێ وی یێ درێژە.
**حرر:** ١- ئازادکر. ٢- نڤیسی.
**حرز:** پارازتن.
**الحرز(بالفتح):** تشتێ پارازتی.
**الحرز(بالکسر):** ١- تشتێ تشتی دپارێزت. ٢- پارێزی. ٣- جهێ ئاسێ و پارازتی.
**الحرس(بسکون الراء):** دەم؛ زەمان.
**حرس:** ١- نۆبە لێ گرت، زێرەڤانی لێ کر. ٢- پارازت.
**الحرس:** ١- زێرەڤانی. ٢- پارازتن.
**الحرس:** زێرەڤان.
**الحرسان:** شەڤ و ڕۆژ.
**حرش:** ١- پێنجەگەهاندن. ٢- نیچیرکر. ٣-خوراند. ٤- زڤربوو. ٥- خاپاند. ٦- پێکرابەردان.
**الحرش(بفتحتین):** یێ زڤر.
**الحرش(بالفتح والسکون):** ١- کۆم. ٢- خاپاندن. ٣- شوین.
**الحرشف(بالضم):** عەردێ ب کەند و کۆر.
**الحرشف البري:** قیڤار.
**الحرشف:** ١- پیلەکێت ماسی. ٢- کولیێ هێژ پەڕ لێ نەهاتین. ٣- تیژکێت بالندەی. ٤- تەڤنێ زریپۆشی. ٥- مرۆڤێت لاواز وپیر. ٦- قیڤار. ٧- بەرێت ل بەر لێڤا دەریایێ.

**حرشـفيات الأجنحـة:** نـاڤێ وی جـۆرێ میشەمۆرایە یێت کو دو جۆتێت پەڕان هەین وپـەڕێت وان ب پـەرکێت هـویر و ڕەنگـین داپۆشکری وەکی گشت جۆرێت بەلاتینکا.
**حرص:** ١- تیڤلاند. ٢- پەرتاند ب شویشتن و شوینکا(جلک). ٣- گەلەک لێ هشیاربوو.
**الحرص:** پویتەدانا گەلەک.
**الحرص:** تێژکێ ژویژی.
**حرض:** هاندا.
**الحـرض(بفتحتين):** ١- هلوەریانـا لەشـی ژ دەردا. ٢- نـەمانا عـەقلی. ٣- خرابوونـا هزروبیرا. ٤- بێشیانبوون.
**حرض:** ١- لەغەر و لاواز. ٢- بێ شیان.
**الحرض(بالضم):** دەستشۆ(ئامان).
**الحرضة:** مرۆڤێ خرابکارێ رەزیلێ هەیکری.
**حرف:** بەرێ وی وەرگێرا.
**الحـرف:** ١- پیـت. ٢- حێشـترا لاواز. ٣- گوهـۆرین. ٤- لێڤا تشـتی. ٥- ڕەخـێ تشتی. ٦- دەڤێ تشتی.
**حرف الجبل:** سەرێ جیای یێ تیژ.
**حرف الوصل:** د عرووزێ دا ئەو پیتە یا پشتی پیتا سەروایێ یا (متحرک) دهێت چ (أ) بیت یان (و) بیت یـان (ي) بیت یـان ژی (ه).
**حرف الماء(الحلف):** پویز.
**حرف النهر:** کنارێ ڕوویباری.
**الحرف:** پویز.
**حرف الماء:** پویر.
**حرفا التفسير:** پیتـا (أ) و پیتـا (ي)ە کـو پێکڤە دبنە (أي) کو دبیتە (ئانکو) و پێ ڕامانێت مژدار دهێنە دیارکرن.
**الحرفان اللهويان:** پیتێت پـەحنکا دەڤی کـو دبنە (ق) و (ک).
**حرفة(بالكسر):** کار؛ پیشە.
**الحرفة(بالضـم):** ١- تـوۆڤێ ڕەشـادێ. ٢- خەندەلک. ٣- بێبەهری.

**حرق:** ١- سۆت. ٢- مڤرەدکر. ٣- ڕها پێ وی قەتیا. ٤- خوراند.
**الحرق:** ١- سۆتن. ٢- ل نـک سۆفیا دبیتـە: نیڤێـت تەجـەللاییێت مریـدی دکێشـنە (الفنـاء) کـو دەسـتپێکا وێ (بـرق)ە و (الطـمس)ە کـو دبیتـە ئاڤابوونـا د (ذاتـي) دا.
**الحرقة:** ١- سۆتن. ٢- گەرمی.
**الحرقة(الحاوقة؛ الحراقة):** یێ گەلەک برەک.
**الحرقد:** بنێ ئەزمانی.
**الحرقدة:** پشتیک؛ جهێ ڕیڤ لێ شین دبن.
**حرقص:** ١- پێهنگاڤێت خۆ ژێک نێزیککرن. ٢- نیزیکبوو.
**الحرقفة:** ١- سەرێ نهکا مرۆڤی. ٢- هستیێ نهکێ.
**الحرقوص:** ڕەخێ شڤکێ.
**الحرقوف:** دەوارێ لاواز.
**حرک:** لڤاند.
**حركة:** ١- لڤین. ٢- بزاڤا سیاسی. ٣- ڤەگوهازتنا هێزێ بۆ لڤینێ.
**الحركة الإنتقالية:** ئەو لڤینە یا گۆیا زەمینـی ل دەمـێ (٣٦٥) ڕۆژ و (٥) دەمژمێـر و (٤٨) چرکـەیا ئـەنجام ددەت کـو دبیتـە سالەک.
**الحركة الوضعية:** ئەو لڤینە یا گۆیا زەمینی ل دەمـێ (٢٤) دەمژمێـرا ئـەنجام ددەت کـو دبیتە ڕۆژەک.
**حرم:** ١- حەرامکر. ٢- قەدەغەکر. ٣- نەهێلا.
**الحرم(بضـمتين):** ١- ژنکێـت ئێـک زەلام. ٢- هـەرچار مـەهێت شـەڕ تێـدا هاتیـە حەرامکرن(ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب).
**الحرم(بفتحتين):** ١- تشتێ مرۆڤ دپارێزت و بـەرەڤانیێ ژێ دکـەت. ٢- تشـتێ حـەلال نەبت مرۆڤ ب کاربینت.
**الحرم الأقصى:** مزگەفتا قودسێ.

**الحرمان(بالكسر):** بێ بەهری.
**الحرمان:** هەردو باژێرێ (المكة) و باژێرێ (المدينة).
**حرمة:** پیرۆزی.
**الحرمد:** ١- تشتێ رەنگ و بێهنێت وی هاتینە گوهۆرین. ٢- تەقنا گەلەک رەش.
**حرمل:** گیایێ حەرمەل؛ گیایەکە بەلگیت وی ب تای ڤە درێزن و کولیلکێت بێکڤە دکۆمن، تۆڤێ وی وەکی کونجیایە، ئەڤ گیایە ژ بۆ زکچوونێ و زەلالکرنا خوینێ و ئێشا گەها دهێتە ب کارئینان.
**حرملة:** ئێک بنێ گیایێ (حرمل).
**الحروب الصليبية:** جەنگێت خاچپەرێسان، ئەڤ جەنگە ئەو بوون یێت ل سەدسالیا (١١) ێ هەتا (١٣)ێ زایینی خاچپەرێسێت ئۆرپایێ ب سەرکردایە (شارلەمان)ێ شاهێ فرەنسا دژی موسلمانان کرین ژ بۆ داگیرکرنا قودسێ، خاچ ل سەر ئالا و جلکێت وان بوون و شیان دەستێ خۆ داننە سەر باهرا پتر ژ عەردێ شامێ، پاشی ل سەر دەستێ (صلاح الدين الأيوبي) یێ کورد د جەنگا (حطين) هاتنە شکەستن و دەرئێخستن.
**الحرور:** بایێ گەرمێ ب شەڤێ.
**الحرورية:** جوینەکا خەوارجا یە (الخوارج).
**الحروف:** ١- کۆما (حرف)ە ئانکو پیت. ٢- راستیێت سادەنە ژ هەبوویێت دبنە پەردە بۆ مریدی وەکی عەقلی و نەفسێ.
**الحروف الشجرية:** دبێژن: (ش، ض، ج)ن، ژ بەرکو ژ بەرێ دەڤی دەردکەڤن، ودبێژن: (ش، ج، ق، ک)ن.
**الحروف الرخوة:** سێزدەهـ پیتن: (ث، ح، خ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ظ، غ، ف، هـ).
**الحروف العاليات:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبێتە ئەو کاروبارێت خۆیی یێت کو د (غيب الغيوب) دا وەکی دارێ د تۆڤێ وێ دا.

**حروف العلة:** پیتیت لڤۆک کو دبنە: (أ، و، ي).
**الحروف الشفهية:** ئەو پیتن یێت کو ب لێڤا دهێنە گۆتن؛ دبنە: (ب) و (ف) و (م).
**حروف الصفير:** سێ پیتن: (زاي) و (سين) و (شين).
**حروف القلقلة:** پێنج پیتن(ب، ج، د ط، ق) د تەجویدا قورئانێ دا دەنگێت وان بلند دکەن.
**الحروف اللثوية:** ئەو پیتن یێت ژ ناڤ پرتیا دەردکەڤن کو دبنە: (ث، ذ، ظ).
**حروف اللقلقة:** ل (حروف القلقلة) بزڤرە.
**الحروف اللسانية:** پیتێت ئەزمانی کو (٦)ن و دبنە: (١) و(ز) و(س) و(ش) و(ص) و(ض).
**حروف المعجم:** ئەلفابێ یە، ژ (أ) هەتا (ي)ێ.
**حروف النسق:** پیتێت لڤۆک کو دبنە: (أ، و، ي).
**حروف النطعية:** پیتێت ژ گەوریێ دەردکەڤن کو دبنە: (ت، د، ط).
**الحروق(بالفتح):** سۆتەمەنی.
**الحروق:** جهێت هاتینە سۆتن ژ لەشی.
**الحروقة:** ئاڤە پیچەکێ دکەلیت پاشی ئاری پێ وەردکەن.
**حرن:** ١- شەمبۆزبوو. ٢- لێ ما و نەهێلا. ٣- پێڤەنویسیا و نەدەکەڤت. ٤- نەهاتە بازاری.
**الحرون:** دەواری شەمبۆز.
**حري:** ١- ژ هەژی. ٢- گونجای.
**الحرية:** ئازادی.
**الحريد:** ١- زەلامێ ژ ئێلا خۆ خۆ ڤەدەر کری. ٢- ڤەدەر. ٣- تشتێ کێمێ ل ناڤ گەلەکێ. ٤- یێ دویر. ٥- ماسیێ پرتپرت.
**الحرير:** ئارمیش.

**الحريرة(بالفتح):** ١- پارچەیا پەرۆکێ ئامویشی. ٢- ئارخاڤک.
**الحريرة(بالضم):** ئەو چەندا گەرمێ یە یا بشێت ئێک گرامێ ئاڤێ ئێک پلەیا گەرماتییێ بلند بکەت.
**الحريري:** ١- ئامویشفرۆش. ٢- یێ وەکی ئارمویشی.
**حريز:** ١- عەردێ گەلەک بەرەشیشک لێ. ٢- تشتێ پارازتی.
**الحريزة:** تشتێ نەهێتە فرۆتن ژ بهایێ وی.
**الحريسة:** دیوارەکە بۆ پەزی دهێتە چێکرن دا زیرەڤانییێ ل پشت بکەن.
**الحريش:** ١- زیڤزیڤە. ٢- کەرکەدەن.
**الحريشة:** مال و ملک هەمی.
**الحريص:** ١- یێ گەلەک هشیار. ٢- ل نک سوفیا فەقیرە و هەر تشتەک ژ بلی خودێ فەقیرە ژ بەر کو یێ پێدڤی بەردەوامیا هەبوونێ.
**الحريصة:** ١- تیڤلڕابوونا دبیتە کون. ٢- عەورێ بارانا وی عەردی ڕادکەت.
**حريف:** تیژ(تام).
**الحريق:** ١- ئاگر. ٢- جهێ ئاگر لێ هەلبووی. ٣- یێ گیای دسۆژیت وەکی سەرمایێ و گەرمێ. ٤- یێ سۆژەک.
**الحريق(بالضم والتشديد):** گیایێ گەزنگ.
**الحريم:** ١- ژن. ٢- تشتێ حەرامێ کەس نیزیک نەبت. ٣- دۆرێت قەسرا شاهی. ٤- تشتێ مرۆڤ دپارێزت و بەرەڤانییێ ژێ دکەت.
**حز:** ١- بری. ٢- خوراند.
**الحز:** بڕین، قەتکرن.
**حزاء:** عەردێ ئاسێ و سەخت.
**حزاءة:** گێژنیک.
**الحزاز:** ١- خەناتیفک؛ تشتەکێ خولیکی یان زەر یان کەسکە ب بەر و قورمێت داراڤە دهێت. ٢- کەڤشک. ٣- ئیشەکە پیستی دگریت و دهێلیت هشک ببیت و بوەربیت.
**الحزازة:** ژانا دلی.
**حزام:** قایشا پشتێ.
**الحزانة:** عەیالێ مرۆڤی یێ مرۆڤ خەمێ ژێ دخۆت.
**حزب:** ١- هنگاڤت و لێ دژواربوو. ٢- کرە پارت.
**الحزب:** ١- پارت. ٢- هەر کۆمەکا مرۆڤا یا دل و کریارێت وان ئێکبن. ٣- سەرباز و کەسێت ل دویڤ بیر و ڕایێت مرۆڤی. ٤- پشکەک ژ قورئانێ. ٥- باهر و پشک.
**الحزة(بتشديد الزاء):** ١- کویزی. ٢- ژانا دلی. ٣- کاودانێ نەخۆش. ٤- دەم؛ گاڤ.
**حزر:** ١- ب هزر و تەخمینا زانی. ٢- ترشبوو.
**حزف:** ١- تژیکر. ٢- ئامادەکر. ٣- گرێدان.
**حزق:** ١- گرێدا. ٢- گڤاشت.
**الحزق:** ١- کۆم. ٢- رەف.
**حزقة:** زەلامێ هوبر.
**حزك:** گرێدا.
**حزل:** ١- خرڤەبوو. ٢- ژ ترسا دا تێکچوو. ٣- ب سەر سەرابێ کەڤت.
**حزم:** ب عەقلی کارکر.
**الحزم:** ١- عاقلداری. ٢- گرێدان، کرنە بەندەک.
**الحزمة:** گورز.
**حزن(بفتحتين):** خەمگینبوو.
**حزن(بالفتح و الضم):** ب کەند و کۆر کەڤت.
**الحزن(بالضم):** خەم.
**الحزن(بالفتح):** ١- زڤری. ٢- ب کەند و چال. ٣- خەم و کۆڤان.
**الحزونة:** ١- زڤری. ٢- کەند و کۆری یا د عەردی دا.
**حزيران:** مەها خزیرانێ.
**الحزيقة:** کۆما مرۆڤا.
**الحزيم:** ١- ناڤتەنگ؛ جهێ شویتکێ. ٢- نیڤا سینگی.
**حزين:** غەمگین.
**حس:** ١- کوشت و بێ بنیاتکر. ٢- پەل ل بن خرکرن دا ببژرت یان بکەلت. ٣- دلێ وی بۆ سۆت. ٤- سۆت.

**الحس:** هەست.
**حسا:** ١- ڤەخوار. ٢- فرکر.
**الحساء:** ئاڤک؛ مەدفینی؛ قورتک.
**الحساب:** ١- هژمار. ٢- لێگرتن. ٣- دادگەهکرن. ٤- تێرا مرۆڤی هەی وەکی (عطاءا حسابا).
**الحسابي:** زانایێ هژمارێ.
**حسابات:** هژمارکاری؛ ژمێریاری.
**الحساس:** ماسییێ هویر.
**حساس:** هەستدار.
**الحساسية:** رەنگڤەدانا لەشی یە ژ جۆرەکێ دەرمانا یان کەرەستا.
**الحساف:** بەرمایکێ تشتی.
**الحسافة(بالضم):** ١- سیلماتێ قەسپا. ٢- ئاڤا کێم. ٣- بێخێر. ٤- دوژمنکاری.
**الحسالة:** هویرکێ سڤیا جەهی.
**الحسام:** شیرێ برەک.
**حسب(بفتحتين):** هژمارت.
**حسب(بالفتح والكسر):** هزرکر.
**الحسب:** رەهـ و ئووجاخ.
**الحسب(بسكون الشين):** ١بەساتی. ٢- یێ تیرا مرۆڤی هەی کو تشتەکی بۆ مرۆڤی بکەت.
**الحسبان:** ١- هزر، بیر. ٢- تیرێت بچویک.
**الحسبانة:** ١- بالیفکا بچویک. ٢- برویسی. ٣- عەور. ٤- کتا گژلۆکێ.
**الحسبانية:** دویڤچوونێت رێبازا (السفسطائية) نە ئەو رێبازا (الإستدلال)ێ و (القياس الباطل) ب کاردئینن ژ بۆ ڤەشارتنا راستیا.
**الحسبة(بالكسر):** ١- خەلات. ٢- کرێ. ٣- بنبەرکرن. ٤- کفنکرن.
**الحسة:** رەوش؛ کاودان.
**حسحس:** قولپاند و ئینا وبر.
**حسد:** حەسەیدی پێ بر.
**الحسد:** ١- حەزکرنا نەمانا وێ خێرا کەسەک گەهەشتییێ. ٢- هنگاڤتنا چاڤی.
**حسر:** ١- لاوازبوو و وەستیا. ٢- وەستاند. ٣- دیارکر.
**حسرة:** هزرەت.
**حسرة الملك:** قەلیا گوشتی.
**حسف:** ١- هەرکی. ٢- دوری.
**الحسفة:** عەورێ تەنک.
**حسک:** تنگژی.
**الحسک:** ستری.
**الحسل:** تێژکێ چەپچەپیسکێ.
**حسم:** ١- بری و ب دویماهی ئینان. ٢- بری و کەواند دا خوینا وی براوەستیت.
**الحسم:** ١- برین و ژناڤبرن. ٢- برین کەواندن. ٣- برینا چەندەکێ ژ بهایێ تشتەکی. ٤- برینا هندەکێ ژ مۆچەی وەک سزا.
**الحسوم:** ١- کورِ. ٢- خێرکوژ.
**حسن:** جوانبوو.
**الحسن:** یێ باش.
**حسن(بتشديد السين):** باشکر.
**الحسن(بالضم):** جوانی؛ شرینی.
**الحسن(بالفتح):** ١- هەستییێ زەندکێ. ٢- گرێ خیزی یێ بلند. ٣- یێ جوان.
**الحسناء:** مێیا (الحسن)ە ئانکو ژنکا جوان.
**حسن التخلص:** زاراڤەکێ رەهوانبێژی یە، د (علم البديع) دا ئەوە کو شاعر شعرا غەزەلی ب مەدحێت کەسەکی دەستپێبکەت و ب شێوەیێ جوان و ریکوپێک.
**حسن التخلص:** زاراڤەکێ رەهوانبێژی یە، د (علم البديع) دا دبیتە کو شاعر ژ بابەتەکی ب شێوەیەکێ باش خۆ بەردەتە بابەتەکێ دی.
**حسن الطلب:** زاراڤەکێ رەهوانبێژی یە، د (علم البديع) دا دبیتە خوازتنا تشتەکی ژ کەسەکی ب شێوەیەکێ ب تۆرە و جوان و پەیڤێت شرین و کارتێکەر.

**الفهم:** تیگەهەشتن.
**الفهم(بالفتح والكسر):** یێ زوی تێدگەهت.
**فهه:** وەستا و لاوازبوو.
**فهه(بتشديد الهاء):** وەستاند و لاوازکر.
**الفهوائية:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبیتە ئاخڤتنا د گەل خودێ حەق ل (عالم الكثال) ب ریکا خەباتێ.
**الفهيم:** یێ تێگەهەشتی.
**الفو:** جۆرە گیایەکە وەک دەرمان دهێتە ب کارئینان ژ بۆ چارەکرنا بیرۆڤێ و ئێشا تەنشتێ.
**الفوات:** بۆرین.
**الفوار:** یێ گەلەک دفیرهت.
**الفوارة:** یێ ژ قازانێ دفیرهت.
**الفوارة(بتشديد الواو):** ١- مێیا (الفوار)ە. ٢- قولقولک؛ جهێ ئاڤ ژێ دزێت ژ کانیێ.
**فواشي:** پەزێت بەلاڤە.
**فـواق:** ١- خرینا سینگی ل دەمێ رح ژێ چوونێ. ٢- دەمێ د ناڤبەرا دو دوهتنێت حێشترێ دا. ٣- دیتنەک و بێهنڤەدانەک و هشیاربوونەک. ٤- ئیسکا مرنێ.
**الفوال:** ١- باقلکفرۆش. ٢- یێ باقلکا دکەلینت.
**فوت:** بۆراند؛ دەربازکر.
**الفوت:** ١- دویریا د ناڤبەرا دو تبلا دا. ٢- بۆرین. ٣- قورتالبوون.
**فوة الصباغين:** ل (الفوه) بنێرە.
**الفوج:** ١- کۆما مرۆڤا. ٢- کۆمەکا لەشکری یە دبینە پێنج سری.
**الفوح:** ١- بەلاڤبوون. ٢- دژواری.
**الفود:** ١- جهنیک. ٢- جهال. ٣- رەخ وەک جه.
**الفودكا:** مەیەکا رۆسی یە ژ ماشا یان گەنمی دهێتەچێکرن.
**الفودج:** ١- مەحاف. ٢- دەوارێ بویکێ.

**الفور(بالفتح):** ١- دەرحالیا تشتی. ٢- دەستپێک.
**الفور(بالضم):** مامز.
**فورا:** د گاڤێ دا؛ بێ راوەستان؛ ئێکسەر.
**الفوران:** ١- فیرهان. ٢- فیرهانا ژ کەلینێ.
**الفورة:** ١- ئێک کەل. ٢- دژواری. ٣- فیرهان. ٤- دەستپێک. ٥- تاریا پشتی عەیشا. ٦- کۆمبوون.
**فورة الكبد:** ئێشەکە مێلاکێ دگریت ژ ئەگەرێ خوینچوونا زێدە و گەلەک.
**فوز(بتشديد الواو):** ١- ژ عەردەکی(وار) دەرکەڤتە عەردەکێ دی. ٢- چوو. ٣- مر. ٤- برە بیابانا بێ ئاڤ(پەز).
**الفوز:** ١- قورتالبوون. ٢- سەرکەڤتن. ٣- مرن.
**الفوشيا:** جۆرە تراشەکە کولیلکێت جوان و رەنگین پێڤە دهێن، ژ بۆ جوانی ل باغچەیا دهێتە چاندن، د بنیات دا ژ وەلاتێ مەکسیکێ و زیلەندا نوی هاتیە.
**الفوضى:** ١- ئەو کاودانە یێ هەمی تێدا وەکی ئێک لی دهێن ئانکو بێ حوکمەت و دەستهەلاتداری. ٢- بەرەلایی. ٣- شێلوییلی.
**فوض إليه الأمر:** پێ راسپارد؛ بەرپرسایەتی دایێ.
**الفوضوية:** ١- سیستەمەکێ سیاسی جڤاکی یە، مرۆڤ ل دویڤ وی سیستەمی ناکەڤیتە ژێر هیچ دەستهەلاتداریەکا حوکمەتێ. ٢- کاودانێ وی مللەتێ یە یێ بێ سەرۆک و حکومەت.
**فوضوضي(فوضوضاء):** ١- شێلوییلی. ٢- هەمی د هندی ئێک ژ لایێ ژ لایێ بەهرێ د تشتی دا و کەس ژ کەیێ زێدەتر نە.
**الفوضوي:** بەرەلاییخواز.
**الفوضوية:** ١- سیستەمەکێ سیاسی جڤاکی ل دویڤ وی سیستەمی وەلاتی یێ ئازادە ژ دەستەلاتداریا حکومەتێ. ٢- ئەو کاودانە یێ مللەت بێی حکومەت تێدا دژیت.

**فوط(بتشديد الواو):** فوتە ل دۆر خۆ ئالاند.
**الفوط:** مللەتەکێ جەرمانییێ بنیات ئسکاندینافی نە، بەردەوام د شەرێ رۆمێ دا بوو، پاشی بوونە دو پشک؛ رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی، پێت رۆژئاڤا ل سالا (٤١٠ز)ێ شیان (رۆما) داگیربکەن پاشی هێلان و ول باشۆرێ غەرەنسا ئاکنجیبوون، و ل سالا(٤٧٦ز) ئەسپانیا ستاندن و دەولەتەکا شاهانی تێدا دامەزراندن هەتا کو ل سالا (٧١١ز) موسلمانا ژێ ستاندین.
**الفوطة:** پارچەیەکا پەرۆکی یە خزمەتکار ل دۆر خۆ دئالینن.
**الفوظ:** مرن.
**الفوعة:** ١- بیهن. ٢- گەرمی(کار). ٣- دەستپێک.
**الفوغ:** مەزنیا دەڤی.
**الفوغة:** بیهنهلبوون.
**الفوف(بالفتح):** ١- سپیاتیا ل نەینۆکێت زارۆکی. ٢- پرتێت پەمبوی. ٣- تشت. ٤- میزمیزکا چێلێ. ٥- کورکەکێ یەمەنی یە.
**الفوفة(بالضم):** ١- تێڤلکێ ل سەر دندگا دانی. ٢- میزمیزکا چێلێ. ٣- کورکەکێ یەمەنی یە.
**الفوفل:** بەرهەمێ دارەکێ ل وەلاتێ هندستانێ شین دبت وەکی کویزێ یە خەلکێ وی ژ بۆ تامێ دکەنە ناڤ زادی.
**فوق:** ١- ل سەر. ٢- د سەر دا.
**فوق(بکسر الواو):** یاشیا وێ شکەست یان تیکبوو(تیر).
**الفوق(بالضم):** ١- تێکا ل پاشیا تیرێ یا دکەڤیتە ژەها کڤانی. ٢- بەخت؛ ئیقبال.
**الفوق(بفتحتين):** تیکبوون یان شکەستنا پاشیا تیرێ جهێ ژەهێ.
**الفوقة:** جهێ ژەهێ ژ تیری.
**الفوقاني:** یێ د سەر را.
**الفول:** باقلک (فارسی) یە.
**الفول السوداني:** فستەق عەبید.
**فول الصويا:** کەلیکەکە وەکی کەلیکا باقلکێ یە ل چولی شین دبت، دیسان ل هندەک جها دهێتە چاندن.
**الفولاذ:** پیلا.
**فوم(بتشديد الواو):** هەڤیرکر.
**فوم:** ١- سیر. ٢- گەنم. ٣- نۆک. ٤- هەر دانێ ببیتە نان.
**الفومة:** ١- دندکەک. ٢- گولیا گیای. ٣- پلەک؛ هندی ب سەرێ دو تبلا بهێتە هلگرتن.
**الفومي الأسود:** جۆرەکێ بەقلی یە کولیلکێت وێ دزرن، ژ بەر تۆڤێ وی دهێتە چاندن یێ کو وەک دەرمان دهێتە ب کارئینان.
**فوه(بالتشديد):** گۆت.
**الفوه:** ١- بهارات. ٢- بێهنا کەرەستەیێت بێهندار. ٣- جۆر و رەنگێت تشتی.
**الفوه:** دەڤ.
**الفوه(الفوة):** روونـاس؛ جۆرە گیایەکە گەلەک قورم ژێ بلند دبن و دستویرن، رهێت وی دهویر و سۆرن پشتی هشک دبن زەردبن دبێژنێ: رها زەر ئانکو(عروق الصباغين)، ل رۆژهەلاتی شین دبت کو جهێ وی یە.
**الفوهة(بالضم):** ١- لۆمەیا خەلکی. ٢- رویبار. ٣- دەڤێ رێکێ. ٤- کۆلان. ٥- ب دەڤئەزمان. ٦- دەستپێکا تشتی. ٧- کونیشکێت هەناسێ ل نک میشەمۆرا.
**الفوهة(بالفتح):** ١- ئێک ئاخڤتن. ٢- دەڤ.
**الفويت:** ئەوێ تنێ ب خۆ دکەت و پرسارێ ژ کەسەکێ دی نەکەت.
**الفويسقة:** مشک.

**في:** پیتەکا لڤۆکە ژ بۆ دەم و جها ب رامانا (تێدا و ل) ب کار دهێن.
**فیأ:** ١- سیبەرکر. ٢- لڤاند.
**الفيء:** ١- سیبەر. ٢- ئەو مالە یێ ژ کافرا دگەهیتە موسلمانان بێی شەڕ. ٣- ئەو سیبەرە یا ل دەمێ پشتی نیڤرۆ هەتا ئاڤابوونا رۆژێ پەیدا دبیت.
**الفيئة:** ١- زڤڕین. ٢- ئیک جار.
**الفیاح:** یێ گەلەک بەرفرەه.
**الفیاد:** کوندێ نێر.
**الفیاد(الفیادة):** یێ خۆمەزندکەت.
**الفیاران:** دو ئاسنکن دکەڤنە ئەزمانکێ ترازیێ.
**الفیاش:** ١- مەزنێ خودان قەنجی. ٢- یێ شانازیێ ب خۆ دبەت. ٣- یێ گەلەک سۆزا ددەت و چویا ب جه نەئینت.
**الفیاض:** ١- یێ ب زێدەهی. ٢- مەرد. ٣- یێ گەلەک ب ئاڤ.
**الفیالة(بتشدید الیاء):** یێ فیلی دهاژۆت.
**الفیالة:** لاوازیا ڕای و بۆچوونا.
**الفیالج:** کۆما (فیلج)ە کو دبیتە گولۆکا درزیێ ئارمویشی یێ قەز چێدکەت.
**الفیتامین:** کەرەستەکێ (عضوي) یە گیا چێدکەت نە حەیوان، بۆ لەشی یێ فەرە زادێ وی تمام دکەت و بزاڤ و چلاکیا دئێخیتێ.
**الفیتق:** ١- دەرگەهڤان. ٢- ئاسنگەر. ٣- دارتاش.
**الفیتن:** دارتاش؛ نەجار.
**الفیتو(حق النقض):** مافەکە بۆ هەر پێنج دەولەتێت ئەندامەتیا وان بەردەوام د جڤاتا تەناهیا دەولەتی دا کو دبنە: (ئەمریکا و رۆسیا و ئەلمانیا و فرەنسا و ژین)، ب ڤی مافی هەر دەولوتەک ژ وان دشێت هەر بڕیارەکا جڤاتا ژێگۆتی براوەستینت.

**الفیج:** ١- عەردێ نزم. ٢- پەییکێ سولتانی؛ قاسدێ پەیادە. ٣- کۆما مرۆڤا.
**الفیجتالین:** ڕوینێ گیانە شوینا روینێ خومال و زەیتا زەیتوینا دهێتە ب کارئینان(لاتینی) یە.
**فیجن:** ل (سذاب) بزڤرە.
**فیح:** ب بەرفرەهی و زێدەیی بەلاڤەکر.
**الفیح:** بەرفرەهی.
**الفیحاء:** ١- جهێ بەرفرەه ژ خانیا. ٢- ناسناڤێ باژێرێ (البصرة) و (دمشق) و (طرابلس)ێ یە.
**فید (بتشدید الیاء):** ١- خۆمەزنکر. ٢- رەشبینبوو ژ گولێبوونا دەنگێ کوندی.
**الفید:** بەلگێت زەعفەرانێ.
**الفیدس:** جەرێ مەزن.
**الفیروز(الفیروزج):** جۆرەکێ بەرێت گرانبهایە رەنگێ وی یێ شینە.
**الفیسحی:** یێ پێهنگاڤ ژێکدویر.
**الفیصل:** ١- شیر. ٢- ژێک جوداکرنا حەقیێ و نەحەقیێ. ٣- حاکم. ٤- قازی. ٥- شیرێ برەک. ٦- دانا حوکمی د ناڤبەرا حەقیێ و نەحەقیێ دا. ٧- یێ تشتا ژێکجودا دکەت. ٨- یێ ب جههاتی.
**الفیض:** ١- گەلەک؛ مشە. ٢- گەلەک بەخشین. ٣- مرن. ٤- گەلەکێ بەزەک. ٥- گەلەک ب ئاڤ(عەرد). ٦- دسەرداچوونا ئامانی.
**الفیضان:** ئاڤرابوون؛ زێدەبوونا ئاڤا رویباری و د سەرلێڤاداچوونا وێ.
**الفیظ:** مرن.
**الفیف(الفیوف؛ الفیفی):** ١- بیابانا بێ ئاڤ. ٢- دەشت؛ عەردێ راست.
**الفیفاء:** ١- کەڤرێ حولی. ٢- بیابانا بێ ئاڤ. ٣- بیابان. ٤- عەردێ بەرین.
**الفیفاة:** ١- بیابانا بێ ئاڤ. ٢- بیابان. ٣- عەردێ بەرین.
**الفیق:** قدێنا مریشکێ.

**الفیقـة:** ١- دەمـێ د ناڤبـەرا دو دۆتنـا دا. ٢- دەسـتپێک و بلنـد بوون(سـپێدە). ٣- شیرێ د گوهانی دا خڕڤەبووی ل دەمێ د ناڤبـەرا دو دۆهتنـا دا. ٤- بارانـا د عـەوری دا خڕڤـەبووی و گـاڤ بـۆ گـاڤێ دبارت.

**فیل(بتشدید الیاء):** ١- لاوازکر. ٢- درەوینکر و کرێتکر (گۆتن). ٣-ڕاستنەئینا (بۆچوون).

**الفیل:** فیل.

**الفیلجة:** ڕاپێچکا قەزێ یا دهێتە هلکـرن کـو داڤـا ئامویشـی یـە. ٢- تیڤلـێ مـاری یـێ ڕاهێلایی.

**الفیلخ:** ١- دستار. ٢- دەستکێ جوهنی.

**الفیلسوف:** زانیێ فەلسەفێ.

**الفیلق:** ١- کۆمەکا لـەشکەری یـە ژ چار پیتا پێـک دهێـت. ٢- لـەشکەرێ گران و مـەزن کو دبیتە چوار تیپێت. ٣- یێ بێ پویت. ٤- یـێ پچیـایی ژ ترسـا دا. ٥- یـێ ب چاڤەکی.

**الفیلم(بسکون الیاء):** ١- زەلامێ گەلەکێ ب کەلـەخ. ٢- زەلامـێ ترسـتۆک. ٣- شـە. ٤- کەڤل.

**الفیلماني:** زەلامێ زۆرێ ب کەلەخ.

**الفیلیریة:** دارەکا وەکی زەیتوینا دێمە بەلگێت وێ پیچەکی د گرۆڤـرن هنـدەک ئویشـیکێت هویر ددەت، ژ بۆ جوانیێ دهێتە چاندن.

**الفینان:** یێ پرچ جوان و درێژ.

**الفینة بعد الفینة:** دەم ل دویڤ دەمی.

**الفینة:** دەم.

**الفیه:** ١- یێ ب دەڤوئەزمان. ٢- یێ ب خوەرە.

**الفیهق:** خۆمەزنکەر، یێ هەمی تشتا بەرفرەهـ دکەت.

**الفیهقة:** خۆمەزنکرن.

**الفیهن:** هەر تشتێ فرەهـ.

**الفیور:** یێ گەلەک دفیرهت.

**الفیـوش:** ١- یـێ شـانازیێ ب خـۆ دبـەت. ٢- ترسنۆکێ لاواز.

# پیتا ( ق )

**ق:** پیتا بیست و ئێکێ یە ژ ئەلفابێیا عەرەبی، هژمارا وێ د حسێبا ئەبجەدی دا دبیتە (١٠٠).

**قأی:** خۆ بۆ هەڤرکێ خۆ چەماند و خۆ ل بەر رەزیلکر.

**قأب:** ١- خوار. ٢- ڤەخوار.

**قئب:** زێدەکر.

**القأقاء:** دەنگێت قەلا.

**القئقیء:** سپیلکا هێکێ.

**القائمقام:** پلەیەکا گارگێری یە دبیتە رێڤەبەرێ قەزایێ.

**قؤوب:** یێ گەلەک ڤەدخۆت.

**قاء:** ڤەرەشیا؛ دلێ وی رابوو.

**القائت:** ١- قویت. ٢- تێرا مرۆڤی ژ ژیارێ.

**القائد:** ١- سەرکێش. ٢- هەر تشتێ درێژ ژ عەرد و چیا. ٣- تشتێ ژ چیای دەرکەڤتی و وەکی دفێ لێهاتی.

**القائدة:** ١- مێیا (القائد)ە. ٢- گرێ ل سەر عەردی درێژ.

**القائظ:** یێ گەرمدژوار.

**القائف:** ١- یێ دەوسا رادکەت. ٢- یێ ل دویڤ رها مرۆڤی دچت ب رێکا ئەندام و سەر و شکلا.

**قائف:** ١- دەوسراکەر. ٢- شوینوارناس. ٣- رڤشتناس؛ یێ کو ب رێکا ئەندامێ دزانیت کا عەیالێ کێ یە.

**القائل:** یێ گۆتی.

**القائلة:** دەمێ دکڤیتە پشتی فراڤینێ هەتا بەری نڤێژا ئێڤاری.

**القائم:** ١- یێ راوەستیای. ٢- دەستکێ چەکی. ٣- ئاڤاهیێ ستاندەر.

**القائمة:** ١- لیستە. ٢- لنگێ دەواری.

**قائمة السیف:** دەستکێ شیری.

**القائمقام:** قایمقام.

**القائمقامیة:** ١- دەستهەلاتا قایمەقامی. ٢- جهێ قایمەقامی.

**قاب قوسین:** ١- ژێکنێزیکیا دو کڤانێت برهویا. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە مەقامێ نێزیکیێ(مقام القرب) یێ ناڤێت خودێ حەق ب رێکا بەرچاڤگرتنا فەرمانا خودایی یاکو دبێژنێ: (دائرة الوجود).

**القاب الكهربائي:** مزرەف.
**قأب:** ١- خوار. ٢- ڤەخوار.
**قـاب:** ١- كـوّلا و كـره كـوّرک. ٢- هنـدی؛ قەدەری؛ تەمەت تشـتی کر. ٣- نێزیکبوو. ٤- هێکا خوّ شکاند. ٤- رەڤی.
**القـاب:** ١- دویریـا د ناڤبـەرا نیڤـا کڤـانی و رەخێ وی دا. ٢- هندی؛ تەمەت.
**القاب:** ١- سالا سیێ یا بهێتن. ٢- نێزیکی. ٣- یێ هشک.
**القاب:** ١- برویسی. ٢- چیکا بارانێ.
**القابة(القائبة):** ١- چوبچەلوّک. ٢- هێک.
**قابح:** جڤین دانە ئێکدو.
**القـابس:** یـێ هنـدەکێ ژ ئـاگری دبـەت یـان دخوازیت.
**قابض:** دەستێ خوّ کرە ددەستێ وی دا.
**القابض:** ١- یێ ب لەز تەرشێ خوّ دهاژوت. ٢- یـێ زکـی دراوەسـتینت (دەرمـان). ٣- یێ ئەزمان ژ بەر تێک دچت(زاد).
**قـابض الأرواح:** رحکـێش کـو دبیتـە عزرائیـل سلاڤ لێ بن.
**القابع:** ١- یێ سەرێ خوّ کریە د ناڤ ستوّیێ خـوّ را. ٢- یـێ سـەرێ خـوّ کریـە د نـاڤ قەرقوّدەیێ خوّ دا. ٣- یێ سەرێ خوّ کریە د نـاڤ کراسـێ خـوّ دا یـان کراسـێ خـوّ ب سـەرڤەئینای. ٤- یـێ ب نـاڤ ڤـە چووی(عـەرد). ٥- یـێ لێڤێـت تشـتی وەرپێچـاین. ٦- یـێ دیـاربووی پاشـی بەرزەبووی. ٧- یێ چوویە د جهەکی ڤە و خوّ ڤەشارتی.
**قابل:** چاڤپێکەڤتن دگەل کر.
**القابـل:** ١- سـالا داهـاتی. ٢- یـێ بهێـت. ٣- یێ قەبیل دکەت. ٤- یێ ئامـادە ژ بـوّ پەسندکرنێ و گوهوّرینێ.

**قابلـة:** ١- شـەڤا بهێـت. ٢- داپیـرک؛ ژنکـا پێشەازیا بچویکی دکەت ل دەمێ بوونێ.
**القابوس:** زەلامێ دیمێ وی جوان و خوشکوّک.
**القابلية:** شیانێت کرنا تشتی و خوّگوهوّرینێ.
**قابليـة الظهـور:** زاراڤـەکێ سـوّفی یـە دبیتـە ئەڤینا ئێکێ یا خودێ هەبوون پـێ ئافرانـدی یا د پەیڤا (أحببت أن أعرف) دا.
**قات:** ١- قویت بوو ئامادەکر. ٢- قویتێ وی داینێ.
**القات:** ١- خزمەتباش. ٢- کاتا جوّرەکێ دارێ یـە ل وەلاتـێ یەمـەنێ شـین دبـت ژ کەرەسـتێت هوّشبر دهێتـە هژمـارتن، بجـوینێ دهێتە ب کارئینان.
**قاتر:** قەلس.
**قاتع:** شەرکر.
**قاتـل:** ١- شـەرکر. ٢- کوشـتنکر. ٣- نـەفرەتکر؛ لەعنەتکر.
**القـاتم:** ١- یـێ ب تاریڤـە(رەنگ). ٢- یـێ گەلەک رەش.
**القاتن:** یێ گەلەک رەش.
**القائم:** یێ دایی؛ بەخشیندەر.
**قاح:** ١- وەرمی. ٢- مالی. ٣- عەداڤێ گرت.
**القاح:** عەداڤ و خوین کەتنێ.
**القاحة:** حەوش.
**القاحزات:** کاودانێت دژوار.
**قاحط:** ١- یێ باران ژێ هاتینە برین. ٢- یێ باران لێ نەهاتی(سال).
**قاحل:** ما د گەل و نەهێلا.
**القاحل:** هشک و رەق.
**قاخ:** خرابوو ژ ئێشەکێ.
**القاخ:** رەش و تاری.
**قاد:** ١- هاژوّت. ٢- سەرکێشی کر.
**القاد:** چەنداتی.
**قادح:** پێنجەک لێدا.

**القادح:** ١- كرمێ ددانا. ٢- كرمێ داری. ٣- تیكا داری.
**القادحة:** ١- كرمێ داری. ٢- كرمێ ددانا. ٣- مێیا (القادح). ٤- ڕەشاتیا ددانا. ٥- یا ئاگر خۆش بەردبیتێ.
**قادر:** ١- قەدارەكر. ٢- وەكی وی كر. ٣- بەرئاوردەكر.
**القادر:** ١- شیاندار؛ خودان شیان. ٢- ژ ناڤێت خودێ یە. ٣- ب ساناهی. ٤- یێ ب قازانێ زادی دلێنت. ٥- یێ داقازانێ دا دهێتە لێنان.
**القادس:** ١- مالا خودێ یا كەعبە لێ. ٢- كەشتیا بچویك. ٣- بەرەكە دكەنە د ئاڤێ ژ بۆ ئاڤدانا حێشترا.
**قادع:** هەفسارێ وی گرت.
**قادم الإنسان:** سەرێ مرۆڤی.
**قادم الرحل:** سینگێ مەحافا بێ بان.
**القادم:** یێ دهێت.
**القادمة:** ١- پەڕێ سەرێ چەنگی. ٢- لەشكەر.
**قادوس:** ١- كۆتەلا ئاشی. ٢- دەلوا ناعورێ. ٣- ئامانەكە پێ ئاڤێ ژ جۆیا دئیننەدەر.
**القادیة:** خەلكێ ژ گوندا هاتین.
**قاذی:** خەلاتكر.
**قاذح:** جڤین گۆتنە ئێك.
**قاذف:** خەبەر و قەسە لێك ڤەگێران.
**القاذف:** بەرهاڤێژ.
**قاذفة:** ١- جۆرەكێ فرۆكا یە ژ بۆ ئاگربارانكرنا دوژمنی دهێتە ب كارئینان. ٢- چەكێ (آر بی جی ٧).
**القاذور:** ١- یێ ژ بێتۆرەیا خۆ تێكهەلیا خەلكی نەكەت. ٢- یێ دلێ خۆ ژ تشتی ڕەش دكەت و نەخۆت. ٣- ژنكا خۆ ژ دەهمەنپیسیێ دویركری.
**القاذورة:** تشتێ پیس و هەڕمی وەكی زنایێ.
**القاذوف:** تۆپا بچویك.
**القاذیة:** یەكەمین كەسێ دهێتە نك تە ژ خەلكی.
**قار:** ١- ل سەر سەرێت تلا ب ریڤەچوو دا كەسێ گول پێژنا وی نەبت. ٢- چاڤێ وی پەڤاند.
**القار:** ١- سار. ٢- كەرێ حێشترا. ٣- قیر. ٤- یێ نەلڤ؛ خۆجه.
**القاریٔ:** خویندنكار؛ یێ دخوینت.
**قارأ:** د گەل خواند.
**قارب:** نێزیكبوو.
**القارب:** ١- گەمی. ٢- كاڤلان. ٣- یێ ب شەڤێ ل ئاڤێ دگەڕهت.
**القارة:** ١- چیایێ ژ چیا ڤەدەر. ٢- دەوار. ٣- كیشوەر. ٤- چیایێ بچویك. ٥- خۆجهبوون. ٦- یا شاد.
**قارت:** ١- خوینا ل بن پیستی هشكبووی. ٢- جانەوەرێ گوشتی و گیای دخۆت وەكی هرچێ.
**القارة:** ١- چیایێ بچویكێ ژ چیا ڤەدەر. ٢- كیشوەر. ٣- جۆرە دارەكە یا تەعلە. ٤- دەوار.
**القارح:** ١- هەسپێ ژیێ وی بوویە پێنج سال. ٢- حێشترا ئاڤسی لێ دیاربووی. ٣- كڤانێ ژەها وی ژێ دویر. ٤- حیشترا ددانێ وێ ب سەركەڤتی. ٥- شێر.
**القارس:** سەرما دژوار.
**قارش:** تێكهلیا وی كر.
**قارص:** قونجریك ل ئێك دان.
**القارص:** پێشكەكا وەكی پویشیێ یە.
**القارصة:** ١- مێیا (القارص)ە. ٢- یا ب ئێش و نەخۆش.
**قارض:** هەمبەری خرابیا وی خرابی دكەل كر.

**قارع(تقارع):** ١- دانانــە ئێـک. ٢- پشـک کێشان.
**قــارع:** ١- پشــک د گــەل وان کێشــا. ٢- ب پشککێشانێ شیایێ.
**القارعة:** ١- مێیا (القارع)ە. ٢- مسیبەتەک ژ مسیبەتێت زەمانی. ٣- بەلا؛ مقەدەر. ٤- حەوشا خانی. ٥- نیڤا ڕیکێ جهێ ڕێڤەچوونێ. ٥- ژ ناڤێت قیامەتێ یە.
**قـارف:** ١- تیکهەلیکر. ٢- نێزکی خۆ کر. ٣- خۆ ژێ نێزیککر.
**قارن:** ١- پێکڤە گرێدان. ٢- بەرئاوردەکرن.
**القاره:** هشک.
**قـارورة:** ١- ئامـانێ ژ شیشـەی. ٢- ڕەشـکا چاڤی.
**قارون:** شاه (کریزوس)ە شاهێ دوماهیێ یێ (لیدیا).
**القاري:** گوندی.
**القاري(بتشديد الراء):** یێ کیشوەری.
**القارية:** ١- مێیا (القاري)ە. ٢- جهێ مرۆڤ مشـە لـێ خڕڤـەدبن. ٣- دەڤـێ شـیری. ٤- سەر یان بنێ ڕومێ.
**القارية(بتشديد الياء):** جۆرە بالندەیـەکێ پێ کورت و نکل درێژە و پشتا وی یا کەسکە.
**القاز:** شەیتان.
**القازب:** جانەوەێ د ئاڤێ و بەستێ دا دژیت.
**القازوزة:** ١- شیشێ بچویک. ٢- ترار.
**قـاس:** ١- پیڤـا. ٢- پێگـرت. ٣- تـاریبوو. ٤- خۆمەزنکر و توندبوو. ٥- برسیبوو.
**القاس:** ١- ڕەق. ٢- دلڕەق. ٣- هندی.
**قاسى:** ١- کێشا(وەک دەرد). ٢- بۆراند(وەک ئێش).
**قاسح:** ب هشکی و ڕەقی سەرەدەریکر.
**القاسح:** یێ ڕەق و ستوبر.
**القاسط:** زۆردار؛ ژ تخویبـی دەرباس بووی.
**قاسم:** ١- سویندخوار. ٢- لیکڤەکر.
**القاسم:** لێکڤەکەر.

**قاسمه:** ١- بۆ سویندخوار. ٢- مـال ل خۆ وی لێکڤەکر.
**قاسى:** دیت؛ تێدا ژیا.
**القاشب:** ١- بێهنا پیس. ٢- یێ نەفس لاواز.
**القاشر:** ١- یێ تشتی دتیڤلینت. ٢- هەسپێ ل دویماهیا مەیدانێ دبەزیت.
**القاشرة:** مێیا (القاشر)ە. ١- دربێ پیستـی دتیڤلینـت. ٢- ژنکـا سـەروچاڤێت خـۆ دقەشرینت دا دێمێ وێ زەلال ببیت.
**قاشور(القاشورة):** هشکاتیا تشتی دتیڤلینت (سال).
**القاشـور:** ١- مرۆڤـێ کـور. ٢- هەسـپێ ل دویماهیا مەیدانێت دبەزیت.
**القاشي:** فلسێ بێخێر.
**قاص:** ١- سزا ل سەر ب جهئینا. ٢- وەکی وی د گـەل کـر. ٣- لڤـی. ٤- ژ بنـی هتەدەر.
**القـاص:** ١- یـێ کـارێ برینـێ دکـەت. ٢- چیـــــرۆکنڤیس. ٣- گۆتــــــاربێژ. ٤- چیرۆکبێژ.
**القاصـب:** ١- قەسـاب. ٢- یـێ پـف دکەتـە لەڤەنێ. ٣- عەورێ گرگری.
**القاصـد:** ١- یـێ نیزیـک. ٢- یـێ قەسـتا تشتەکی کری. ٣- یێ ب ساناهی و خۆش. ٤- ڕاست.
**القاصد الرسولي:** ل نک دویڤچوویێت کەنیسا ڕۆمـانی ئـەو ئوسـقوفە یـێ کـو پاپـا وەک نوینەرێ خۆ بۆ وان دهنیریت.
**القاصـدة:** ١- یـا چـوون ب سـاناهی و بـێ وەستیان. ٢- مێیا (القاصد)ە.
**قاصر:** ب کێماسی.
**القاصر:** یێ کیماسی کری.
**قاصرات الطـرف:** ئـەو ژنکن یێت کـۆ ژ بلی ماخوییێت خۆ ل کەسێ دی نەنێڕن.

**القاصرة:** ١- یا ژ بلی مێری خۆ بەری خۆ نەدەتە چو زەلامێت دی. ٢- مێیا (القاصر)ە.
**القاصف:** ١- ئەوێ بومبەبارانکرێ دکەت. ٢- ئەوێ دەنگی دژوار لێ. ٣- هورێ دژوارێ هەر تشتەکی دشکێنت.
**قاصف:** دەنگ دژوار.
**القاصفة:** فرۆکا بەمبەوەشین.
**قاصل:** برەک.
**القاصي:** یێ دویر.
**القاصية:** ١- یا دویر. ٢- یا پیر. ٣- جهـ؛ لا. ٤- یا پیر. ٥- یا ژ کەری ڤەدەر(کەوال).
**قاض:** ١- شەقکر. ٢- شەقبوو. ٣- لڤی. ٤- تێگەریا. ٥- کره میناک.
**قاض:** کوژەک.
**قاضی:** کره سکالا و ل بەر حاکمی دانا.
**القاضب:** ١- یێ زۆر برەک. ٢- شمشیرێ برەک.
**القاضبة:** ١- مێیا (القاضب)ە. ٢- ددان.
**قاضم:** پیچپیچە کری.
**القاضي:** حاکمێ شەرعی.
**قاضي الحاجات:** ئوجقەتین.
**قاضي القضاة:** سەرۆکێ حاکمێت شەرعی.
**القاضية:** ١- مێیا (القاضي)ە. ٢- مرن.
**القاطب:** ١- یێ ناڤچاڤگرێ. ٢- شێر.
**قاطبة:** گشت؛ هەمی پێکڤە.
**القاطر:** ١- خوینا دو برا. ٢- هەر سترکەکا دلۆپ دلۆپ دڕژیێت.
**القاطرة:** ١- شەمەندەفر. ٢- مێیا (القاطر)ە.
**قاطط(قاط؛ قط):** گرانبها.
**القاطع:** ١- برەک؛ ئامیرێ برینێ. ٢- نموونەیێ جلکێ ل بەر کەر دکەن. ٣- ناڤبر. ٤- یێ گوشتی و بەرهەمێ حەیوانی نەخۆت ژ فەلا. ٥- تشتێ ترشبووی. ٦- ڕێگر. ٧- ددانێ بەرێ دەڤی.
**القاطع الکهربائي:** سێرکتێ کارەبێ.
**قاطع:** ١- تێکەلی هێلا. ٢- سەرەدەری هێلا. ٣- پەیوەندی هێلا. ٤- بری.
**القاطعة:** ١- مێیا (القاطع). ٢- یا ل جهەکی ناڤەحەویت.
**القاطعية:** ئەو پیچا تشتی یە یا کو ژ ئەگەرێ ب کارئینانێ پویچ دبت و نەمینت.
**القاطن:** یێ خۆجهـ.
**قاطنات مکة:** کوترکێت مەککەهێ.
**القاطور:** جۆرەکێ تمساحایە، دەڤێ وی یێ پەحنتر و کورتترە ژ یێ تمساحا، ل ئەمریکا باکۆر و ئەمریکا ناڤین ول چینێ دژیت.
**قاظ:** گەرمبوو.
**قاع:** ١- لڤێڤەبوو. ٢- د پاشداچوو. ٣- دەنگکر.
**القاع:** ١- عەردێ ڕاست. ٢- عەردێ نزمێ چیا و گر ژێ د دویر.
**القاعب:** گورگێ گەلەک دلویرت.
**القاعة:** ١- حەوش. ٢- هۆل.
**القاعد:** ١- یێ ڕوینشتی. ٢- ژنکا ژ عەیالی وەستیای. ٣- یا ل سەر عەیالەکی ڕوینشتی و شوینەکری یان ژڤانێ وێ خلاس نەبووی. ٤- جهالێ تژی دان.
**القاعدة:** ١- بنیات. ٢- یاسا. ٣- دستوور. ٤- مێیا (القاعد). ٥- باژێرا ل وەلاتەکی ژ هەمیا مەزنتر. ٦- جهێ تشتێ قەستدکنێ و ژێ دەردکەڤن وەکی فرۆکخانەیێ. ٧- بنگەهـ.
**القاعط:** یێ بێهنێ ل دەینداری خۆ تەنگ دکەت.
**القاعف:** بارانا دژوار.
**قاف:** ل دویڤ چوو.
**القاف:** تویتێ دچێتە ژ چالکا پاتکێ دا.
**القافزة:** ١- هەسپێ بەزەک. ٢- بەق. ٣- مێیا (القافز)ە.

**القافسة:** پێت دومۆر.
**القافصة:** پێت دومۆر.
**القافل:** ١- یێ زڤری. ٢- یێ دەست حشک. ٣- یێ پیست حشک.
**القافلة:** ١- کاروان. ٢- کۆما مرۆڤا یا ژ وەغەرێ دزڤریت.
**القافور(القفور؛ القفورة):** ١- کوفکا قەسپ ژێ دەردکەڤت. ٢- ئامانێ گەرکێت قەسپا.
**القافیة:** ١- سەروایا شعرێ. ٢- پاتک. ٣- دویماهیا هەر تشتەکی. ٤- دەوس؛ شوینپێ.
**قاق:** ١- قدقدکر(مریشکێ). ٢- دەنگکر.
**القاق:** کەرەمرۆڤێ سەربەردای.
**القاق:** بالندەیێ قشقل.
**قاقاء:** دەنگێ قەلا.
**القاقلی:** جۆرە گیایەکە یێ سویرە.
**القاقلة:** گیایەکە ل هندستانێ شین دبت، یێ تیژ وبێهنخۆشە، ل هندستانێ وەک دەرماک دکەنە زادی و ل وەلاتێت ڕۆژهەلاتا ناڤین دکەنە ناڤ قەهوێ.
**القاقم(القاقوم):** جانەوەرەکێ گۆشتخۆرە وەکی کویژکی یەن بێهنەکا پیس ژێ دهێت، کەڤلێ وی ژ بۆ چێکرنا جلکا دهێتە ب کارئینان.
**قال:** ١- گۆت. ٢- حوکم دا. ٣- ب سەرکەڤت. ٤- دگەل ئاخڤت. ٥- چەماند و بر. ٦- ل نیڤرۆ نڤست. ٧- بێبەختیکر. ٨- ئاماژەدا. ٩- ئاخڤت. ١٠- چوو. ١١- بلندکر. ١٢- هزرکر. ١٣- ل دەمێ نیڤرۆ شیر دوهت و ڤەخوار. ١٤- ل دەمێ نیڤرۆ بۆ تێکر(شیر).
**القال:** ١- دەستپێک. ٢- پرسیار. ٣- یێ ئاخڤتی. ٤- یێ مری. ٥- یێ بێهنڤەدای. ٦- یێ ل دەمێ پشتی نیڤرۆ نڤستی.
**القالب:** ١- قالب. ٢- قەسپا سۆر.
**القالة:** ١- گۆتگۆتک. ٢- ئاخڤتن.

**القالس:** یێ ئاڤ یان زاد ژ سەر دلی هاتی یە دەڤی.
**قالص:** تێکچووی.
**القالم:** زگۆرد؛ بێژن.
**القالی:** کیندار.
**قام:** ١- ڕابوو. ٢- بلندبوو. ٣- ڕاوەستا. ٤- پێ ڕابوو. ٥- ب سەرکەڤت و خۆجهبوو. ٦- دەستپێکر(نڤێژ).
**قامی:** د گەل گونجا.
**قاما:** لێهات.
**القامة:** ١- بژن و بالا. ٢- بەژن وەک پیڤان. ٣- کۆما مرۆڤا.
**القامح:** یێ ژ ئاڤێ تێربووی و سەرێ خۆ بلندکری.
**قامر:** قومار د گەل کر.
**قامس:** ١- یاریا بنئاڤکانێ کر. ٢- هەڤڕیکی کر دا بزانت کا کی زاناترە.
**القامع:** تەپەسەرکری.
**القاموس:** ١- فەرهەنگ. ٢- نیڤا تشتی. ٣- تشت هەمی. ٤- دەریا. ٥- جهێ ژ هەمییێ کویرتر ژ دەریایێ. ٦- کتێبا فەیرۆزئابادی یە ل سەر زمانی چێکری.
**قان:** ١- چێکر و ڕاستکر. ٢- تەیساند. ٣- خەملاند. ٤- ئافراند. ٥- بۆ کۆلە. ٦- بخودانکر.
**القان:** دارەکە کڤانا ژێ چێدکەن.
**قانئ:** گەلەک(وەکی: أحمر قانئ: گەلەک سۆر).
**قانی:** ١- بەردەوامبوو. ٢- تیکهەلکر.
**القانب:** ١- گورگێ دلویرت. ٢- پۆستەچی.
**القانت:** ١- یێ بەردەوام تاعەتی دکەت. ٢- یێ نڤێژێ دکەت.
**قانص:** نێچیرڤان.
**القانصة:** ١- بەرچێلکا بالندەی. ٢- کۆما نێچیرڤانا.

**القانط:** یێ بێ هویڤی بووی؛ دلشکەستی.
**القانع:** ١- یێ ب قسمەتا خۆ رازی. ٢- خازخازۆکێ رەزیل. ٣- خولام. ٤- کرێگرتی. ٥- قائیلبووی.
**القانم:** یێ خرابووی.
**القانون:** ١- یاسا. ٢- بنیات. ٣- ئامیرەکێ مۆزیکێ یێ تیلدارە. ٤- بنگەهەکێ جەبرێ یە دبێژنێ(دستور). ٥- پیڤەرێ هەر تشتەکی یە.
**القاني:** یێ گەلەک سۆر.
**القاه:** ١- گوهداری. ٢- دەستهەلات. ٣- مەزناهی. ٤- ژیارا خۆش.
**قاهر:** شکاندنانێ د گەل کر.
**القاهر:** ١- یێ بلند. ٢- یێ کەسێ هەمبەر دشکێنت. ٣- ژ ناڤێت خودێ یە.
**القاهرة:** ١- پەروەردە. ٢- پێشخەری ژ هەر تشتەکی. ٣- بەدکار و بێ دەلنگ(ژ ژتکا). ٤- سینگ. ٥- هەستیێ سینگی. ٦- پێشخەریا هەر تشتەکی.
**القاهي:** ١- یێ دلچوونێ دبەت. ٢- یێ سەرخۆش دکەت. ٣- یێ ب گیا و تێر چەروان.
**قاو:** کەس لێ نینە.
**قاوي:** دایێ.
**القاوي:** یێ دبەت.
**القاووق:** کومەکێ درێژە(فارسی) یە.
**القاوون:** جۆرەکێ خیارا یە.
**قاوم:** ١- خۆ ل بەر راگرت. ٢- بەرگیری کر. ٣- دگەل رابوو.
**القاوند:** جۆرەکی بالندایە وەکی داکوکەیە لێ ماسیگرە ل کنارێت گەرا دژیت ل ئەوروپا وئاسیا و ئەمریکا و ئەفریقیا دژیت.
**القاوية:** ١- هێک. ٢- سالا کێم باران. ٣- یا برسی.
**قايس:** ١- پێک پیڤان. ٢- دبەری راکر.
**قايضه:** پەرتالەک دگەل گوهۆری.
**قايل:** قەرەبۆکر و دگەل گوهۆری.
**قب(بالتشديد):** ١- هشکبوو. ٢- زراڤبوو. ٣- رەخێت وی لێکدان. ٤- بڕی. ٥- دەنگێت خۆ لێک بلندکرن. ٦- ئاڤاکر.
**القب(بالفتح):** ١- پیستێ هشک. ٢- خورما هشک. ٣- یێ نێر. ٤- سەرۆک. ٥- پاتێ دکەنە د بەریکا کراسی دا. ٦- کونا بەکەرێ.
**القب(بالكسر):** ١- هەستیێ پشتا کەلێژیێ ئەوێ وەکی گوبزێ. ٢- سەرۆک.
**قبا:** ١- بلندکر. ٢- کرە گومبەد. ٣- چنی و کۆمکر. ٤- کرە کڤان. ٥- ب سەرێت تبلا گومکر.
**قبى:** ١- کرە کورتەک. ٢- بلندکر.
**قباء:** تەمەت؛ هندی.
**القباء:** ١- جوبە. ٢- کورتەک (فیستان).
**القبائل:** ١- کۆما (قبیلة)ە ئانکو ئێل یان کوریت ئێک باب. ٢- پرتا کەڤلی. ٣- کەڤرێ ل سەر دەرێ بیرێ.
**قبائل الثوب:** پارچەیێت جلکی.
**قبائل الرأس:** پرتێت کولۆخکێ سەری.
**قبائل الشجر:** تاییێت دارێ.
**قبائل الطير:** نڤشێت بالندا.
**قباب:** ١- برەک. ٢- مەزن.
**القباب(بتشديد الباء):** شێر.
**القباية:** بیابان.
**القباجور(الأباجور):** ئەو جۆرێ پەردێت پەنجەرا یە یێ کۆ ژ دەپێت داری یان کانی پێکهاتی، هەردو رەخێت دەپا و نیڤا وان ب هندەک بەنکا ڤە دگرێداینە دەمێ بۆ لایەکی دهێنە کێشان ئەو دەپ دهێنە بادان و دزڤرن و پێکڤەدمینن و ئۆدە تاری دبت و دەمێ بۆ لایێ دی دهێنە کێشان رەخێت دەپا ژێک ڤەدبن و ژێک دویر دکەڤن و رۆناهی ب ژۆر دکەڤیت(یا ژ پەیڤا أباجورا فرەنسی هاتیە وەرگرتن).

**القباح:** ١- کرێت. ٢- چۆک. ٣- ئەنیشک.
**القباحة:** کرێتی.
**القبار:** ١- چرایێ نێچیری. ٢- ئەو کۆما مرۆڤایە یێت تۆرا ماسیا ژ ئاڤێ دکێشن.
**القباض؛ القباضة(بتشدید الباء):** ١- یێ گرتن دژوار. ٢- یێ ب لەز دهاژۆت.
**القباض(القباضة):** ١- تێکچوون. ٢- لەز.
**القباع(بالفتح والتشدید):** ١- بەراز. ٢- ترسنۆک. ٣- ژویژی.
**القباع(بالضم):** ١- زەلامێ کەر. ٢- ترازیا مەزن.
**القباعي(بالضم):** زەلامێ سەرێ وی گەلەک مەزن.
**القباقب(بالضم):** سالا د دویڤ یا بهێت دا.
**القبال:** ناڤتلکا شمکێ.
**قبالة(بالضم):** هەمبەر.
**القبالة(بالفتح):** قونتەرات.
**قبان:** ١- قەبانا کیشانا تشتی. ٢- گومرکا فرۆتنا تشتی.
**القبانة:** کارێ قەبانچی.
**القباني:** قەبانچی.
**قبب(بکسر الباء):** ناڤتەنگزراڤبوو.
**قبب(بتشدید الباء):** ١- کرە گومبەد. ٢- ڕەخێت وی لێدان. ٣- هشکبوو. ٣- گومبەدەک ل سەر نژنی.
**القبب:** ناڤتەنگزراڤی.
**القبة(بالکسر والفتح):** شێلاڤکا پەزی ئەگەر گربوو.
**القبة(بالضم):** گومبەد.
**القبة الخضراء:** ئەسمان.
**القبة الزرقاء:** عەسمان.
**قبة الإسلام:** ناسناڤێ باژێرێ (البصرة) یە.
**قبة الشهادة:** ئەو خیڤەتە یا جوهی ب سەر تابویتی سۆزێ(تابوت العهد) داددەن، دیسا دبێژنێ:(قبة الزمان).
**القبج:** کەو.
**القبجة:** ١- نێرەکەو. ٢- مێکەو.
**قبح(بفتحتین):** شکاند.
**قبح(بالفتح والضم):** کرێتبوو.
**قبح(بتشدید الباء):** ١- ژ باشیێ دویرکر. کریتکر.
**القبح:** ١- کرێتی. ٢- دویرکەڤتن ژ باشیێ.
**قبحا له:** یێ ژ باشیێ دویر بت.
**قبحه الله(بتشدید الباء):** خودێ وی ژ باشیێ دویر بکەت.
**قبر:** بنئاخکر.
**قبر(بتشدید الباء):** کرە د قەبری دا.
**القبر(بالفتح):** گۆڕ.
**القبرة(القنبرة؛ القنبراء):** بالندەیێ کەدیک.
**قبرس(بالضم):** باشترین جۆرێ سفری یە.
**القبرية:** گیایەکە کولیلکێت بنەفشییێت جوان ددەت.
**القبز(بضمتین):** ئامویرەکێ موزیکێ یە.
**القبز(بالکسر):** ١- مرۆڤێ قەلس. ٢- بەژنکورت.
**قبس:** ١- گوریەک ژێ بر. ٢- هلکر. ٣- ئینا. ٤- زانی. ٥- فێربوو. ٦- نیشادا.
**القبس:** ١- بژوت. ٢- پەل. ٣- گوریکەک.
**قبسة العجلان:** کینایەتە بۆ شۆلێ لەزێ، کورد بێژن: (ما تو هاتیە ئاگری؟).
**قبص:** ١- غاردا هەروەکی دفریت ئانکو هەمما سەرێت سمێت وی ژ عەردی دگرن. ٢- نەهێلا تێر ڤەخۆت.
**قبص(بالتشدید):** ب سەرێ تلا ڕاکر.
**قبص(بالفتح):** ١- ل بایێ بەزێ چوو. ٢- پلەک ژێ راکر. ٣- خرڤەبوو.
**قبص(بالکسر):** سڤک و زیرەکبوو.

**القبص(بالفتح):** ١- ئێشەکە کێلەکێ دگریت ژ بەر خوارنا قەسپا و ب سەرداکرنا ئاڤێ ب لەخرینی. ٢- هلگرتنا تشتی ب سەرێت تبلا. ٣- جهێ خڕڤەبوونا خێزێ مشە.
**القبص(بالكسر):** ١- جهێ خڕڤەبوونا خیزێ مشە. ٢- ژمارەیا مەزن ژ مرۆڤا.
**قبصاء:** سەرێ مەزن.
**القبصة(القبيصة):** پلا ژ تشتی.
**قبض(بالضم):** کەتە بەر مرنێ.
**قبض(بالفتح):** ١- وەرگرت. ٢- دەستێ خۆ هاڤێتێ. ٣- دەستێ خۆ مچاند. ٤- ب دەستی گرت. ٥- تێکبر. ٦- دانەئێک(پەڕ). ٧- ب لەز هاژوت. ٨- لەز تێداکر. ٩- چوون و لەزکرن. ١٠- مراند. ١١- ڕاوەستا و نەچوو(زک). ١٢- بۆ خۆ بر. ١٣- بر. ١٤- قائلنەبوو بگرت. ١٥- داپاش. ١٦- هێلا و ژێ دویرکەڤت.
**قبض(بتشديد الباء):** داڤێ، پێ دا وەرگرتن.
**قبض(يكسر الباء):** مر؛ ڕحا وی هاتە ستاندن.
**القبض(بالفتح والسكون):** ١- تێکچوون. ٢- گرتنا تشتی. ٣- زکنەچوون. ٤- هاژۆتنا ب لەز. ٥- د عەرووزێ دا دبیتە ڕاکرنا پیتا پێنجێ یا مەند وەکی ڕاکرنا پیتا (ن) ژ (فعولن) دا ببیتە (فعول) و دبیژنە ڤێ تەفعیلێ (مقبوض). ٦- ل نک سۆفیا دبیتە ئەو تێکچوونا خودێ حەق د دلێ مریدی پەیدا دکەت و ژ خوارن و ڤەخوارن و ئاخڤتنا دکەت.
**القبض(بفتحتين):** ١- مالێ هاتیە وەرگرتن. ٢- تێکچوون. ٣- لەز. ٤- پویرەیی هاتیە خڕڤەکرن و هێشتا لێکڤەنەکری. ٥- ل نک سۆفیا حالێ عارفی یە خودێ دلێ وی تەنگ دکەت و ژ بکارئینانا تشتێ حەلال بێ بەهر دکەت و ژ بلی زانینا وی تشتەکێ دی ل نک ناهێلت.
**القبضة(بالضم والسكون):** ١- لەپەک ژ تشتی. ٢- تژی لەپی.
**القبضة(بالضم والفتح):** ١- شڤانێ باش شڤانیێ ل پەزێ خۆ دکەت. ٢- یێ تشتی دگریت و نەبەردەت.
**القبضة(بالفتح والسكون):** ١- ئێک مست یان لەپ ژ تشتی. ٢- دەستک.
**قبط:** ١- ب دەستی خڕڤەکر. ٢- تێکهەلکر.
**قبط(بتشديد الباء):** تێکبر.
**القبط(الأقباط):** کۆما(القبطي) یە، کو دبیتە خەلکێ ڕەسەنێ وەلاتێ مسرێ.
**القبطان:** سەرکێشێ کەشتیێ.
**قبطري:** جلکەکە ژ کتانێ سپی دهاتە چێکرن.
**القبطية:** جلکەکێ کتانی یە ل وەلاتێ مسرێ دهێتە چێکرن.
**قبع:** ١- سەرێ خۆ کرە د ناڤ ستۆیێ خۆ دا. ٢- سەرێ خۆ کرە د ناڤ قەرقۆدێ خۆ دا. ٣- سەرێ خۆ کرە د ناڤ کراسێ خۆ دا یان کراسێ خۆ ب سەرڤەئینا. ٤- لێڤێت وی چماندن یان وەرپێچان(جهال). ٥- ب ناڤ دا چوو(عەرد). ٦- دیاربوو پاشی بەرزەبوو (ستێر). ٧- خۆ تێدا ڤەدەرکر و بەرزەکر و ڤەشارت (خانی). ٧- فرفرکر (بەرازی). ٨- دەنگکر(فیلی). ٩- گیرۆبوو. ١٠- وەستیا.
**القبع:** بووق.
**القبع(القباع):** ژویژی.
**القبعة(بالضم والفتح):** جۆرەکێ بالندەیە یێ هویرە ل نک کونجوردا دهێتە دیتن و گەر ترسەک بۆ چێبوو خۆ تێدا ڤەدشێرت.
**القبعة(بفتحتين):** کرەمرۆڤ.
**القبعة(بالضم والتشديد):** ١- کولاڤ. ٢- کولاڤێ ژ پەڕۆکی بۆ زارۆکا چێدکەن.

**القبعثری(القبعثر):** ١- یێ مەزن و توند. ٢- حێشترا مەزن.
**قبقب:** ١- ل فیڕیا دا. ٢- خۆکەرکر.
**القبقب(بالفتح):** زک.
**القبقب(بالکسر):** سەدەفا دەریایێ.
**القبقاب(القباقب):** ١- پرپێژ. ٢- یێ گەلەک دئاخڤت. ٣- درەوکەر. ٤- زەلامێ دلڕەق.
**القبقاب:** قەبقەبک؛ شمکا ژ داری.
**القبقبة:** قوڕقوڕا زکێ هەسپی.
**قبقبة:** دەنگێ قوڕقوڕا زکێ هەسپی.
**قبل(بفتحتین):** ١- گرت. ٢- کرە قەبالە. ٣- کەفالەتکر. ٤- بەر ب وی ڤە چوو. ٥- هات و نێزیکبوو. ٦- چاڤێت دەدەکەرتیبوون.
**قبل(بالفتح والتشدید):** هێلا بێگیریێ ب گرێبەستەکێ دگەل بکەت.
**قبل(بالفتح والکسر):** ١- باوەرکر. ٢- پەسەندکر. ٣- پێشوازیکر. ٤- بایێ سپێدێ لێدا.
**القبل(بضمتین):** ١- بەرێ مرۆڤی. ٢- کۆما ژ سێ کەسا پتر. ٣- دەستپێک. ٤- بەر ب ئارمانجا خۆ چوو.
**القبل(بفتحتین):** ١- هەر چیا و گرێ بکەڤیتە بەر سینگێ مرۆڤی. ٢- شاخێت جانەوەری ییت دهێنە سەر چاڤا. ٣- رێکا ئاشکرا. ٤- دروشمە یان باجا مرۆڤ ب سینگێ خۆ ڤە دکەت یان ب ناڤچاڤێت دەواری ڤە. ٥- ویرییا بەرێ رەشکا چاڤێ دکەڤیتە دفنێ. ٦- هەر جهێ بلندی دکەڤیتە بەرانبەری مرۆڤی. ٧- ل هەمبەری مرۆڤی. ٨- کارێ داپیرکێ. ٩- ئاخڤتنکرنا سەرپێ.
**القبل(بالفتح والسکون):** بنتار؛ بنار.
**القبل(بالفتح والضم):** بنتار؛ بنار.
**قبل:** بەری نوکە.
**القبلة(بالضم):** ماچ؛ رامۆسان.
**القبلة(بالفتح):** ١- کەفالەت. ٢- مۆرکێت ساحر سحرا پێ دکەت.
**قبلة(بالکسر):** ١- رووگەهـ. ٢- تشتێ بەر ل ئێک. ٣- سەمت.
**القبلتان:** (المسجد الحرام) و (المسجد الأقصی).
**قبن:** چوو.
**قبن(بتشدید الباء):** ب قەبانێ کێشا.
**القبنة:** لەزا ب قەتاندنا پێدڤیا دا.
**القبو:** ئاڤاهیی ب کڤان.
**القبوة:** ١- ئێک جارا بلندکرنێ یان گومبەدکرنێ. ٢- کومبەد یان کڤانێ بچویک. ٣- پرا بچویک. ٤- پێکڤەنانا لێڤا.
**القبونة:** کارێ قەبانچی.
**القوابص:** کۆما (القابصة)ە کو دبیتە جوین و کوماهیێت مرۆڤا.
**قبوة:** دەڤمچاندن.
**القبور(بالفتح):** کۆرەجهـ؛ کۆرەعەرد ئانکو عەردێ کەس چو ژێ نەزانت.
**القبوص:** سڤکێ زیرەک.
**القبول:** ١- قەبیلکرن. ٢- بایێ سپێدێ. ٣- ژنکا بچویکی ل دەمی بوونێ دبەت.
**قبونة:** قەپانچیاتی.
**القبي:** یێ بەردەوام ب رۆژی دبت هەتا زکێ ب پشتێ ڤە دمینت.
**القبیب:** گیایێ هشک.
**القبیح:** ١- یێ کرێت. ٢- چۆک. ٣- ئەنیشک.
**القبیحة:** کریارا کرێت.
**القبیص:** ١- ئاخا کۆمبووی. ٢- بەرەشیشک.
**القبیصی:** غاردانا دژوار.
**القبیصة:** ١- پەلا ژ تشتی. ٢- ئاخا خرڤەبووی. ٣- بەرەشیشک.
**القبیض:** ١- یێ تێکچووی. ٢- یێ بەزەک. ٣- ژیرێ د کارێ خۆ دا مژویل.

**القبيعة(بالفتح):** يێ ئاسن يان زێر ب دەستكێ وى ڤە(شير).
**القبيعة(بالكسر):** تمبلكێ دفنا بەرازى.
**القبيل(القبل):** ١- كۆما ژ سێ كەسا پتر بت. ٢- هرى و مويێ ژنك تەرخانكرى ژ بۆ رستن. ٣- تاعەتێ خودێ. ٤- يێ بەرانبەر. ٥- كەفيل.
**القبيل:** ١- ژنكا بچويكى ل دەمێ بوونێ دبەت. ٢- جۆر؛ تۆخم.
**قبيل:** بەرى نوكە.
**القبيلة:** ١- ئويجاخ. ٢- بەرێ ل سەر دەرێ بيرێ. ٤- پرتا كەڤلى.
**القبين:** ١- يێ دەستسڤك. ٢- يێ پێسڤك.
**قت(بالتشديد):** ١- درەوكر. ٢- ب دزيكيڤە زێرەڤانى لێكر. ٣- پيچپيچە كێمكر. ٤- كێمكر. ٥- قەدكر.
**القت(بتشديد التاء):** ١- ڤەگوهازتنا ئاخڤتنێ. ٢- درەوا ئامادەكرى. ٣- جۆرەكێ تۆڤى يە خەلكێ گوندا دقوتن و دخوون كتا (القتة). ٤- گيايەكە ئاژەل لێ دچەرن.
**القتات:** ١- ئاخڤتن ڤەگوهێزك. ٢- پێزەڤەنگ. ٣- يێ ب دزى ڤە گوهێ خۆ ددەتە خەلكى و ئاخڤتنێ بۆ خودانى ڤەدگوهێزت.
**القتاد(بالفتح):** دارەكا موكم و ب سترى يە.
**القتار(بالضم):** ١- بێهنا زادى. ٢- بێهنا تشتێ سۆتى.
**القتال(بالكسر):** جەنگ؛ شەر.
**القتال(بالفتح):** ١- نەفس. هێز؛ زاخ.
**القتام:** ١- تۆزا رەش. ٢- رەشاتى. ٣- تارياتى. ٤- تۆزا شەرى.
**القتان:** ١- تۆزا شەرى. ٢- تۆزا رەش. ٣- تارياتى. ٤- رەشاتى.
**القتب(بالفتح):** رويڤيك.
**القتب(بالكسر):** ١- رۆيڤيك. ٢- گرۆڤرکا زكى.
**قتب:** رويڤيكێت بژارتى دانێ.
**القتب(بالكسر):** ١- رويڤيك. ٢- گرۆڤرکا زكى. ٣- مەحافا بێ بان؛ جهێ رونشتنێ يێ ل سەر پشتا دەوارى.
**القتب(بالفتح):** ١- رويڤيك. ٢- مەحافا بێ بان؛ جهێ روينشتنێ يى ل سەر پشتا دەوارى.
**القتب(بالفتح والكسر):** فرشكتەنگ.
**القتبة(بالكسر):** رويڤيك.
**قتت(بتشديد التاء):** وەك درەو بەلاڤكر.
**قتد:** برى و سترى ژێڤەكرن و كرە ئاليك بۆ دەوارا.
**القتد:** دارێ مەحافا بێ بان.
**قتر(بالتشديد):** قەلسى كر و ژيار لێ تەنگ كر.
**قتر (بالضم):** ١- وەلات. ٢- ستويريا تشتى.
**قتر:** ١- قەلسيكر؛ چوليكر. ٢- دويكێل كر. ٣- بێهن ژێ هات.
**القتر(بفتحتين):** قەدەر.
**القتر(بضمتين):** ١- رەخ؛ لا (وەك جهـ). ٢- وەلات.
**القتر(بالفتح والسكون):** ١- ژيارا كێم. ٢- قەدەر.
**بالفتح والكسر):** خۆمەزنكەر.
**القتر(بالكسر والسكون):** ١- سەرتيرێت تيرێت ئارمانجانێ. ٢- لەڤەنێت د ئارمانجێ وەردكەن.
**القترة(بالضم والسكون):** ١- بەرتەنگيا ژيارێ. ٢- كولەك.
**قترة الباب:** جهێ دائێخستنێ يێ ل دەرگەهى.
**قترة البستان:** كونا ئاڤ تێرا دچيتە بيستانى.
**قتراح:** پێشنيار.
**القترة(بالضم):** دەراڤێ تەنگ.
**القترة(بالكسر):** جۆر.
**القترة(بالفتح):** ئێك جار.

**القترة(بفتح الثلاث):** غوبار؛ تۆز.
**القترة:** ١- چەپەرێ نێچیرێ. ٢- کونا پەنجەرکێ. ٣- جهێ ئاڤ تێرا د چیتە ناڤ بیستانی.
**قتع:** ڕەزیلبوو.
**القتع(بالکسر):** ١- مێشا د کەڤری. ٢- مێشا د شەکەفتی.
**قتع الساق:** جۆرە بەلاتینکەکا شەڤێ یە خەرزی د دارێت فێقی دا دکەت وەکی دارا سێڤێ.
**القتعة:** ١- یێ ڕەزیل. ٢- کرمەکێ سۆرە دکەڤیتە داری و دبێژن: خورکا داری یە.
**قتل:** ١- کوشت. ٢- تێکهەلکر(د گەل ئاڤێ). ٣- ڕاشکاند؛ ژ سەقای ئێخست.
**قتل(بالتشدید):** گەلەک کوشتن.
**القتل(بالفتح):** ١- کوشتن. ٢- دربدانانا دژوار.
**القتل(بالکسر):** ١- دوژمن. ٢- هەڤال. ٣- هەڤجەنگ. ٤- شەڕگەر. ٥- دلێر.
**القتل الخطأ:** کوشتنا بێدەستی.
**القتل العمد:** ئەو کوشتنە یا کو ب دربێ کوژەک دهێتە کرن.
**القتلة(بالکسر):** جۆر.
**قتم(بالکسر):** بلندبوو.
**قتم:** ١- ب تاری ڤە چوو(ڕەنگ). ٢- هاتە گوهۆڕین. ٣- بلندبوو.
**القتمة(بالضم):** ١- ڕەنگێ تۆزکەوی. ٢- ڕەنگێ سۆر تێهەل. ٣- سۆرێ گەلەک ڤەبووی.
**القتمة(بفتحتین):** ١- تۆزا ڕەش. ٢- تۆزا شەڕی. ٣- تاریاتی. ٤- ڕەشاتی.
**قتن(بفتحتین):** هشکبوو و چو تەڕاتی تێدا نەما.
**قتن(بالفتح والضم):** ١- خوارنا وی کێمبوو و لەغەربوو. ٢- لەغەربوو.
**القتوبة:** حێشترێت جهێ ڕوینشتنێ ل سەر پشتا وان چێکری.
**القتوت:** ١- پیزەڤەنگ. ٢- یێ ب دزیکی ڤە گوهێ خۆ ددەتە ئاخڤتنێت خەلکی.
**القتوة:** ١- ئێک خزمەتا باش. ٢- پیزەڤەنگی.

**قتور:** قەلس.
**القتول:** ١- ژنکا کوشتن کری. ٢- زەلامێ گەلەک کوشتنێ دکەت. ٣- ژنکا گەلەک کوشتنێ دکەت.
**القتیتی:** پیزەڤەنگی؛ فەسادی.
**قتیر:** ١- سەرێت بزمارا یێت د زریپۆشی دا دەردکەڤن.
**القتیل:** کوشتی.
**القتین:** ١- یێ کێم خوارن و لەغەر. ٢- وەستیایی لەغەر. ٣- سەرەڕەما زراڤ. ٤- بێخێرێ کێم. ٥- پلپلک.
**قث (بالتشدید):** ١- کێشا. ٢- ئاڤدا. ٣- خڕڤەکر.
**قثأ:** ١- تلۆزی لێ زۆربوون. ٢- خڕڤەکر.
**قثا:** خڕڤەکر.
**القثا:** تشتێ خرمخرمی ئانکو ل دەمێ خوارنێ خرمخرم ژێ دهێت وەکی خیاری.
**قثاء:** تلۆزی؛ شەفخشت.
**قثاءة:** ئێک تلۆزی.
**القثاث:** پەرتال؛ متا.
**القثاث(بتشدید الثاء):** پیزەڤەنگ؛ فەسادکەر.
**القثاثة:** کۆما خەلکی.
**القثام:** حەفتیارا مێ.
**قثر:** دودلبوو و بێزاربوو.
**القثرة:** پەڕۆکی مالێ.
**قثقث:** ١- لڤلڤاند دا بینیتەدەر. ٢- دورست کێشا(ترازی).
**قثم:** ١- گوپێ شێری تێدا. ٢- خڕڤەکر. ٣- گەلەک بر وخڕڤەکر.
**قثم(بکسر الثاء):** گوپێ شێری پێڤەما.
**قثم(بضم الثاء):** تۆزکەویبوو.
**القثم(بضمتین):** یێت مەرد.
**القثم(بالضم والفتح):** بەخشیندەر.

**القثمة:** ڕەنگێ تۆزکەوی.
**القثوم:** خرڤەکەرێ خرابیێ یان یێ باشیێ.
**القثيثة:** کۆما خەلکی.
**قح(بالتشديد):** سافی بوو و ما خوڕست.
**القح:** خوڕست؛ سافی ژ هەر تشتەکی.
**القحاح:** یێ خورست و سافی ژ هەر تشتەکی.
**القحة:** یێ دلڕەق.
**قحا:** بەیبوین پێ وەرکر.
**القحاح:** یێ خوڕست.
**القحاد:** کەسێ بێ برا و کوڕ.
**القحازة:** تۆڕا نێچێرکرنا بالندا.
**القحاف(بالكسر):** دژواریا ڤەخوارنێ.
**القحاف(بالضم):** هلمشتا هەر تشتەکی ڕادمالیت.
**القحافة(بالضم):** تشتێ هاتیە ڕامالین.
**القحال:** ئێشەکە بەزی دگریت و پیستێ وی هشک دکەت.
**القحامة:** ب ناڤسالڤەچوونا زێدە.
**قحب:** کوخی.
**القحب:** ١- یێ کۆخکی گرتی. ٢- یێ پیر.
**القحبة:** ١- پیرەژن. ٢- لەشفرۆش؛ گاندەر. ٣- پێیا (القحب)ە.
**قحث:** هەمی پێکڤە بر.
**قحد:** کۆهانا وی مەزنبوو.
**القحدة:** ١- کۆهانا حێشترێ. ٢- بنێ کۆهانا حێشترێ جهێ ل سەر.
**قحر:** پیر.
**قحز:** ١- لۆتدا. ٢- دولدل و نەڕحەتبوو. ٣- وەکی مریا ب عەردی کەڤت. ٤- مراند. ٥- دانایێ. ٦- ئێخست.
**قحط:** ١- دربەک ب دژواری لێدا. ٢- نەباری (باران). ٣- چکبوو و بنبربوو (باران). ٤- ڕامالی و چو نەهێلا.
**قحط(بكسر الحاء):** ١- چکبوو (باران). ٢- باران لێ نەباری و ما هشک(سال).
**قحط(بتشديد الحاء):** ڤەڕەنی.
**القحط:** بێ بارانی و هشکی.
**قحف:** ١- قافێ سەرێ وی شکاند. ٢- سپیکر (تیڤلاند). ٣- کوخی. ٤- دابای. ٥- هەمی قورچدا. ٦- ڕامالی و د گەل خۆ بر.
**القحف:** ١- قافێ سەری. ٢- کۆدە. ٣- پرتا ژ کولۆخکێ سەری ڤەبووی.
**القحفاء:** یا هەر تشتەکی ڕادمالیت.
**قحقح:** ١- کەنی. ٢- دەنگێ وی د حەفکێ ڕا هات و چوو.
**قحل:** ١- هشکبوو. ٢- قورمچی.
**القحل:** مرۆڤێ ب ناڤسالڤەچووی.
**قحم(بالتشديد):** ١- بێی کو هزرا خۆ بکەت د ناڤ شۆلێ هلکر. ٢- کوتەکی لێکر و هێلا کاربدەتێ.
**قحم:** ١- خۆ هاڤێتە د شۆلێ دا بێی کو هزرا خۆ تێدا بکەت. ٢- سەروسەر هاڤێت.
**قحم إليه:** خۆ ژێ نێزیککر.
**القحم:** ١- یێ ب عەمر. ٢- یێ لەغەر.
**قحمة:** ١- کارێ سەخت. ٢- جهێ مرنێ. کولب و خەلا. ٣- کارێ ب کوتەکی. ٤- هەرسێ ڕۆژێت دویماهیا هەیڤێ.
**القحوان:** بەیبوین.
**القحولة:** هشکاتی.
**القحوم:** یێ گەلەک ب ناڤسالڤەچووی.
**القحومة:** ب ناڤسالڤەچوونا زێدە.
**قحيط:** هشک و بێ باران.
**قد(بالتشديد):** ١- قەتکر. ٢- ب درێژکانی شەقکر. ٣- بری. ٤- ژێ دەربازبوو.
**قد(بالفتح):** ١- شڤک. ٢- کەڤلێ گیسکێ. ٣- بەژن؛ قامەت. ٤- ڕاستیا بەژنێ.

**قد(بالكسر):** ١- ئامانێ کەڤلی. ٢- تشتێ پرتپرتکری. ٣- شڤک. ٤- دڤێلا چەرمی.
**قد:** پیتەکە تنێ دگەل کاری دهێت و دبیتە بەرسڤ بۆ پەیڤا(لما یفعل؟) ئانکو (ئەرێ دێ کەت یان نەء؟)، دیسا ژ بۆ دەربرینێ ژ بجهہاتنێ دهێت.
**قد(بتشدید الدال):** ١- شەقکر؛ ب درێژاهی شەقکر. ٢- بڕی.
**القد(بالضم):** ماسیەکێ دەریایێ یە زەیتا ماسیا ژ جۆرەکێ وی دەردئێخن.
**القد(بالفتح):** ١- بەژن؛ بالا. ٢- قامچی. ٣- کەڤلێ گیسکی. ٤- هندی؛ تەمەت.
**القد(بالكسر):** ١- ئامانێ ژ کەڤلی. ٢- دڤێل. ٣- قامچی. ٤- تشتێ قەدقەدکری.
**قدا:** ١- ژ وەغەرێ زڤڕی. ٢- تام و بێهنێت وی خۆش بتوون. ٣- نێزیکبوو. ٤- لەزکر.
**القدا:** بێهنا خۆش.
**قدی:** ١- لەزکر. ٢- ژ کوندا هات.
**القدی:** ١- لەز. ٢- چەنداتی.
**القداة:** بیهن.
**القداح:** ١- کولیلک. ٢- تاکێت گیای یێ دنەرم.
**القداحة(بالفتح):** ١- صتەیێ ل بەری ددەن و کریسک ژێ دچن. ٢- ماکینا ئاگری.
**القداحة(بالكسر):** کارێ ئاگرکەری.
**القداد(بالكسر):** ١- خەزالمشک. ٢- ژویژوی.
**القداد(بالضم):** ئێشەکە زکی دگریت.
**القدة(بالكسر):** ١- دڤێلا کەڤلی. ٢- پرتا تشتی. ٣- کۆما مرۆڤێت هزر بژالە. ٤- ڕاستەک. ٥- مەستەرێ بەنەی.
**قداد:** ١- خەزالمشک. ٢- ژویژوی.
**القدار(بالكسر):** شیان و پێچێبوون.
**القدار(بالضم):** ١- مارێ مەزن. ٢- بچویکێ هەستیسڤک.
**القدارة:** ١- هێز. ٢- شین. ٣- دەولەمەندی.
**القداس:** ١- پاکی. ٢- نڤێژا فەلایە. ٣- سەربڕێ لەشە و خوینا مەسیحایە ل نک فەلا ل دێرێ دهێتە دان.
**القداس:** ١- بەرەکە دکەنە ب برکا ئاڤێ دا پی چەنداتیا ئاڤا لێکڤەکری دیا دکەن. ٢- تشتەکە ژ زیڤی چێدکەن وەکی لۆلۆیێ یە. ٣- سەربلندی و سەرفرازیا مەزن.
**القداسة:** ١- پاکی. ٢- ناسناڤێ زانایێ مەزنە ل نک فەلا.
**القداف:** ١- جەرێ درگنی. ٢- فەرسەخێنیا گەلەک مەزن.
**القدام(بالضم):** ل پێش؛ ل بەر.
**القدامس:** یێ دژوار.
**القدة(بالكسر):** ١- ڕێک. ٢- کۆما مرۆڤێت هەرئێک ل سەر باوەریەکێ. ٣- پێشەنگ. ٤- جۆرەکێ مارا یە.
**قدح:** ١- پێنجەک لێدا. ٢- کریسک ژێ برن. ٣- هلبوو. ٤- پێنج دانا. ٥- تێدا خوار. ٦- لەپێ خۆ دا بن. ٧- کارتێکر.
**القدح:** ١- کرمێ داری. ٢- کرمێ ددانی.
**القدح(بفتحتین):** ئاگر.
**القدح(بالكسر):** ١- تیرا بێ سەرتیر و پەڕ. ٢- پاتێ دکەڤیتە کونا سەرتیرێ. ٣- تیرەکە ژ تیرێت قوماری(المیسر).
**القدح:** پەرداخ.
**القدح:** کرمێ داری ین یێ ددانا.
**القدح الفرد:** بیژێ نەژبابێ خۆ.
**القدحة(بالضم):** لەپەک؛ مستەک.
**قدد:** ١- قەتکر. ٢- شەقکر. ٣- پرتپرتکر.
**قدر(بفتح الثلاث):** ١- کێمکر. ٢- قەلسیکر. ٣- شیا. ٤- شیایێ. ٥- مەزنکر. ٦- قەدرگرت. ٧- پیڤا. ٨- پێ پیڤا. ٩- بریڤەبر.

**قدر(بتشديد الدال):** ١- شیاییێ و گرت. ٢- هێلا بشێتێ. ٣- کره قەدەر. ٤- حسیب بۆ کر. ٥- پێگرت. ٦- لێ ب هێزکەڤت. ٧- دەستنیشانکر. ٨- پێ پیڤا.

**قدر(بكسر الدال):** ١- شیاییێ. ٢- شیا.

**القدر(بالفتح والسكون):** ١- بها. ٢- رێز. ٣- پلە. ٤- مەزنی. ٥- قەدەر. ٦- زەنگینی. ٧- هێز و شیان.

**القدر(بفتحتين):** ١- ب جهاتنا قەزاییێ یە ئەوا خودێ د(لوح المحفوظ)دا نڤیسی. ٢- هێز و شیان.

**القدر(بالكسر والسكون):** قازان.

**القدراء:** گوهێ ناڤنجی.

**القدرة(بالضم والسكون):** ١- شیانا خودێ. ٢- شیان. ٣- مال و ملک.

**القدرة(بفتحتين):** شیشەیێ بچویک.

**القدرية:** رێبازەکا هزریە دبێژت قەدەرا خودێ چو ژ بۆ نینە بەلکو هەرکەسەک گرێداییێ کریارێت خۆ یە تشتێ وی بڤێت دێ کەت و یێ نەڤێت ناکەت.

**قدس(بالتشديد):** پاککر و پیرۆزکر.

**القدس (بالضم والسكون):** ١- پاکی. ٢- بەحەشت. ٣- ئەو بەرە یێ دهاڤێژنە بیرێ دا بزانن کا گەلەک ئاڤ تێدایە یان پیچەک. ٤- تافیری. ٥- ل نک سۆفیا دبیتە زانستێ نەفسێ ژ قرێژا تویعەتی تافیردکەت.

**قدس:** پیرۆز و مبارکبوو.

**قدس(بتشديد الدال):** ١- ب پال پیرۆز دانا. ٢- پاک و پیرۆزکر. ٣- پاککر.

**القدس:** باژێرەکێ فەلستینێ یە د کەڤن دا دگۆتنێ (ئۆرشەلیم).

**قدس الأقداس:** جهەکە ژ کەنیشا جوهیا سالێ جارەکێ مەزنێ زانایێت جوهیا د چوو تێڤە.

**قدع:** ١- زێدەکر. ٢- پالدا. ٣- فرِ ل دویڤ فرێ ڤەخوار. ٤- بەزی. ٥- برێڤەبر. ٦- دربازکر. ٧- ڕاشکاند و نەرمکر.

**القدع(بفتحتين):** ١- کولبوونا چاڤی ژ بەر گری. ٢- ترسنوکی و شکەستن.

**القدعة(بالكسر):** بەرکۆشکا بچویک.

**قدف:** ١- رێهت. ٢- ڕامالی ب هوسکیێ یان لەپی.

**قدم(بفتحتين):** ١- کەتە پێشیێ. ٢- گیرۆنەکر. ٣- نێزیککر.

**قدم(بتشديد الدال):** ١- کەتە پێشیێ. ٢- نێزیککر. ٣- پێشکێشکر. ٤- بەر ب پێش هات. لەزکر.

**قدم(بالفتح والضم):** کەڤنبوو.

**القدم(بفتحتين):** ١- پێشاییی. ٢- پێ. ٣- قەنجی؛ باشی. ٤- دلێر. ٥- ل نک سۆفیا دبیتە ئەو تشتە یێ علمێ خودێ ل نک بەندێ وی خۆجهبووی.

**قدم صدق:** ئەو پێشاییی و دانا جوان و مەزنە یا خودێ ددەتە بەندێت خۆ یێت چاک.

**القدم:** پێ، ژ (٢٦) هەستییێت هویر پێکدهێت.

**القدم(بالكسر والفتح):** ١- کەڤناری؛ کەڤناتی. ٢- دەم. ٣- (قدم العالم) رێبازەکا هزری یە دبێژت هەبوون یا کەڤنە و هەر هەبوویە و چو ئەگەرێت پەدابوونا وێ نینن. ٤- پێشاییی.

**القدم(بضمتين):** ١- چوونا بەر ب پێش. ٢- دلێرێ ل پێشیا لەشکەری دچیت.

**القدم(بالفتح والسكون):** جلکێ سۆر.

**قدما(بالضم):** چوونا بەر ب پێش.

**القدمة(بفتحتين):** ١- تشتێ ل پێشیا تشتی. ٢- عەردێ ب بەر و کەند و کۆر.

**القدمة(بالضم والسكون):** وێرەکی.

**القدموس:** ١- یێ کەڤنار. ٢- کەڤرێ مەزن. ٣- پێشیا لەشکەری. ٤- مەزن. ٥- دژوار.
**القدموسة:** کەڤرێ مەزن.
**القدن:** تیراتی ئانکو تێرا مرۆڤی مەبەست چەنداتی یە.
**قدنس:** سەئاف؛ حەیوانەکێ شیرداریێ ئاڤی یە هندی کتکێ یە، رەنگێ وی قەهوائیییەکێ تاری یە کوریەکا ستویرا پێڤە ل رویبارێت کوردستانی هەیە.
**القدو(بالکسر):** بنیاتێ تا ژێ دچن.
**القدوی:** گرتنا رێکا ڕاست و دورست.
**القدوة:** ١- پێشەوا. ٢- رێباز.
**القدوح:** مێش.
**القدوس:** ١- پاکی ژ هەمی کێماسی و عەیبا بەری. ٢- ژ ناڤێت خودێ یە ئانکو یێ پاک و بژوین ژ هەر کێماسیەکێ.
**القدوع:** ١- شەرمین و کێمئاخڤتن. ٢- یێ ل تشتەکی مجد. ٣- یێ نەرم ڕحەت.
**القدوم(بالفتح):** یێ گەلەک میرانیا دکەت.
**القدوم(بالفتح والتشدید):** تەڤشوی.
**القدوم(بالضم):** هاتن.
**القدیح:** بنڤەرەنک.
**القدیة:** ١- پێشەوا. ٢- رێباز.
**القدید:** ١- گوشتێ قەتقەتکری. ٢- جلکێ دڕیای. ٣- کوشتێ هشککری.
**القدید(بالضم):** جلکێ بچویکێ ژ پویرتی.
**القدیدیون:** ئەو سەرتراش و پنیدۆز و شولکەرن یێت سەر ب لەشکەری ڤە.
**القدیر:** ١- خودان شیان. ٢- ژ ناڤێت خودێ یە.
**القدیس:** ١- پاکێ ژ لایێ خودێ ڤە هاتیە پەسەندکرن. ٢- باوەرداریێ دمرت یێ پال و سەرفەراز.
**القدیس:** مێرێ مێرخاس.

**القدیم:** یێ کەڤن.
**قذ(بالتشدید):** ١- ڕەخێت وی بڕین و گوهۆڕی. ٢- دانا ناڤ هەردو گوهێت وی. ٣- پەڕ پێڤەنان. ٤- هاڤێت.
**قذی:** قرشەک یان پرتەکا کلمیشی کەتە تێدا (چاڤ).
**قذی(بتشدید الذال):** قرشەک ژێ ئینادەر (چاڤ).
**القذی(بالکسر):** ئاخا قوتایی.
**القذی(بالفتح):** قرشێ دکەڤیتە د چاڤی دا یان د ئاڤێ دا.
**القذاة:** قرشێ دکەڤیتە چاڤی.
**القذاذة:** ١- پرتا زێری. ٢- پرتا پەڕی.
**القذارة:** پیساتی.
**القذاف(بالفتح والتشدید):** ١- مەنجەنیق. ٢- هەر ئامیرێ تشتی پێ دویر بهاڤێژن. ٣- دەوار. ٤- ترازی.
**القذاف:** ئاڤا کێم.
**القذاف(بالکسر):** ١- هەر تشتێ دهێتە هاڤێتن. ٢- لەزا چوونێ. ٣- چوونسڤک.
**القذال:** پاتک؛ پشتا سەری.
**القذام:** یا ئاڤ مشە(بیر).
**القذان:** ١- سپیبوونا پرچی یا دکەڤیتە جهنیکا. ٢- سپیاتیا ل چەنگێت بالندەی.
**القذة(بالضم):** ١- کێچ. ٢- گوهێ مرۆڤ یان یێ هەسپی. ٣- پەڕێ تیرێ.
**قذذ:** قوساند و دورستکر.
**قذر:** ١- پیسکر. ٢- پیسبوو.
**قذر(بتشدید الذال):** پیسکر.
**القذر:** یێ پیس.
**القذر(بفتحتین):** ١- پیساتی. ٢- گوی.
**القذروف:** کێماسی؛ عەیب.
**قذع:** خەبەر گۆتنێ و ب کرنا خرابیێ گونەهبارکر.
**قذع(بتشدید الذال):** پێگرت(جلک).

**القذع(بفتحتين):** ١- ئاخڤتنا پیس و کرێت. ٢- پیساتی.
**القذع(بالفتح والكسر):** ١- خودانا قەسێت کرێت. ٢- خودانێ پیساتیێ.
**قذف:** ١- تێوەرکر. ٢- کەسەک گونەهبارکر ب کرنا زنایێ. ٣- دلێ خۆ راکر. ٤- ب دەحفینکا هاژۆت. ٥- ئاخڤتنا بێ بەرسفک کر.
**القذف(بضمتين):** ١- جهێ لێتەحسین و کەڤتنێ. ٢- رەخ؛ لا؛ جهـ.
**القذف(بفتحتين):** رەخ؛ لا؛ جهـ.
**القذف(بالضم والفتح):** رەخ؛ لا؛ جهـ.
**القذفة(بالضم):** ١- ژۆرا بلند. ٢- رەخ؛ لا؛ جهـ. ٣- ئۆدا سەری و ل هنداڤ مالێ. ٤- سەرێ چیای یێ ل هنداڤ تشتەکی.
**القذعمل:** حێشترا ب کەلەخ و زەبەللەح.
**القذعملة:** ١- ژنکا پندلۆفسکا بێخێر. ٢- تشت.
**قذل:** ١- دانا پاتکا وی. ٢- د دویڤ را چوو. ٣- مجدیکر. ٤- بۆ کرە عەیب. ٥- د سەرپێخۆدا و زۆرداریکر.
**القذل:** کێماسی؛ عەیب.
**قذم:** ب ئێک نەقل دایێ.
**قذم(بكسر الذال):** هێلا قورچدەت.
**القذم(بالضم):** سالارێ مەرد.
**القذمة:** ١- ئەو پارچا مالی یە یا خودان ب مەردینی ددەت. ٢- قورچا ئاڤێ.
**القذور:** ژنکا خۆ زەلاما و جهێت گومانێ پارازتی.
**القذوف:** ١- دویر. ٢- دویرهاڤێژ. ٣- چوونسڤک.
**القذوم:** یا ئاڤ مشە(بیر).
**قذي:** قرشەک کەتێ(چاڤ).
**قذيت:** قرشەک کەتێ (چاڤ).
**القذية:** یێ قرشەک یان پرتەکا کلمیشی کەتیێ.

**القذيع:** مرۆڤێ پویچ.
**القذيعة:** گۆتنێت خراب و خەبەر.
**القذيف:** یێ دویر.
**القذيفة:** ١- هەر تشتێ دهێتە هاڤێتن. ٢- بەرکێ تۆپێ.
**القذيفة اليدوية:** نارنجۆک؛ رومانە.
**قذيفة:** بەرکێ تۆپێ.
**القذيمة:** ئەو پارچەیا مالی یا زەلام دبەخشیت.
**قر(بالتشديد):** ١- تەزی؛ ساربوو. ٢- خۆجهبوو. ٣- ژ روندنکا هشکبوو و تەنابوو.
**القر(بالفتح):** ١- رۆژێت پشتی رۆژا قوربانداندێ ل حەجێ. ٢- مەحاف. ٣- جۆرەکێ زینی یە بەلێ ژ زینی خۆشترە.
**القر(بالضم):** ١- جهێ خۆجهبوونێ. ٢- سر؛ سەقەم. ٣- جۆرەکێ پێشکا یە ل سەر ئاڤێ دهێت و دچت.
**قرء:** ١- ژڤان؛ خوین دیتن. ٢- سەرشویشتنا ژ بەر ژڤانی. ٣- سەروا شعرێ.
**القرا(بالفتح):** کولند.
**قرأ:** ١- خواند. ٢- گەهاند. ٣- کومکر و دا د گەل ئێک.
**القرأ:** پشت.
**قرا:** قەستکرێ.
**القرا:** پشت.
**القرى:** ١- مێهڤانکر. ٢- خرڤەکر. ٣- تشتێ ددەنە مێهڤانی. ٤- ئاڤا د برکێ دا خرڤەدبت.
**القرى(بالكسر):** تشتێ بۆ مێهڤانی دهێتە پێشکێشکرن.
**القرآن:** ١- قورئانا پیرۆز. ٢- ئەو دەقێت ژ نک خودێ ب خواندن هاتینە خوارێ ئانکو نە ب نڤیسین و نڤیسار. ٣- خواندی.
**القراء(بالفتح والتشديد):** یێ خواندن باش.
**القراء(بالضم والتشديد):** پەرستنکار.

**القراءة:** ١- خواندن. ٢- کۆمکر و لێکدا.
**القرأة:** وەبا.
**القراب(بالكسر):** کاڤلان.
**القراب(بالفتح):** نێزیکی.
**القراب(بالضم):** ١- نێزیکی. ٢- هندی؛ تەمەت.
**القرابة(بالضم):** مرۆڤاینی.
**القرابة(بالفتح):** چوونا ب شەڤێ یە ژ بۆ گەهەشتنا دەمێ سپێدێ.
**القرات:** باشترین جۆرێ مسکی یە.
**القراح:** ١- زەڤیا بێ ئاڤاهی و دار. ٢- یا زەلال و بێ قرش(مەبەست ئاڤە).
**القراح:** ١- ئاڤا شرین. ٢- ئاڤا زەلال.
**القراحي:** ١- یێ باژێری بەرنەدەت و نەچیتە گوندا. ٢- یێ ل مالا خۆ یان گوندێ خۆ مای و نەدەکەڤتی یە شەڕی.
**القراحيتان:** هەردو کیلەک.
**القراد(بالضم):** بشکۆژا مەمکی.
**القراد(بالفتح والتشديد):** ڕاهینەرێ مەیموینکا.
**القراد(بالكسر):** خاپاندن.
**القراديات:** جانەوەرێت میکرۆسکوپی نە د هەویرن لێ ژ تووخمێ دوپشک و تەڤنپیرکانە، ئەون دبنە ئەگەرێ حەساسیا ژ تۆزا خانی چێدبت.
**القرار:** ١- بریار. ٢- خۆجهی. ٣- هاتنەخوار و ستویرکرنا دەنگی یە ل نک سترانبێژا. ٤- عەردێ ڕاست. ٥- خۆجهبوون.
**القرارة:** ١- جهێ نزم ژ عەردی. ٢- یێ کو ئارامی و خۆجهی تێدا. ٣- چالا ئاڤ لێ ڕادوەستیت. ٤- ئاڤا ل گرارێ دکەن دا نەسۆژت. ٥- یێ کورت.
**القراريط:** بەرکێت تەمرهندێ (التمر الهندي).
**القراس(القراسية):** مەزن؛ زەبەللەح.
**القراسيا(القراصيا):** جۆرە دارەکە ژ نڤشێ گولا ل لوبنانێ و هندەک وەلاتێت ل دۆرێت دەریا سپی دهێتە چاندن، فێقییەکێ هویرێ ب ڕەشی ڤە ددەت(یۆنانی) یە.

**القراص:** گیایێ گەزنگ.
**القراصيا:** سەحکە (القراسيا).
**القراضب:** یێ هەمی تشتا دخۆت و چو نەهێلت.
**القراضة:** ١- هویرکێ ژ برینێ چێدبت. ٢- هویردە؛ پارێ بێخێر.
**القراضم(القرضيم):** یێ هەمی تشتا دبەت.
**القراضيب:** یێ هەمێ تشتا دخۆت و چو نەهێلت.
**القراط:** ١- چرا. ٢- گوڕیا چرای.
**القراطة:** پشکا سۆتی یا ژ پەتیلێ دهێتە ڤەکرن و سۆتن.
**القراطب:** بڕەک.
**القراظ:** (قرظ)فرۆش.
**القراع(بالضم):** کەچەلی، ئیشەکا پیستی یا بڤەگرە سەری دگرت پرچی دوەرینت.
**القراعة:** ١- مەتال. ٢- ڕەقێ توند.
**القراغول:** زیرەڤانێ ڕیکێ(مەگۆلی) یە.
**القرافة:** تیڤلێ دارێ.
**القرافص:** هێزدارێ کەلەخ مەزن.
**القرافصة:** دزێت ئاشکرا.
**القراقر(القراقري):** حێشترکێشێ دەنگ خۆش.
**القراقرة:** ژنکا پڕبێژ.
**القراقف:** یێ دەنگ بلند.
**القرام(الكسر):** ١- پەردا تەنک.٢- جلکێ تەنک.
**القرامة:** ١- هویرکێ نانی یێ کەتی تەنویرێ. ٢- کەڤلکێ ژ دفنا حێشترێ ڤەدکەن. ٣- هرمهرما حێشترێ. ٤- کیماسی.
**القرامل(القراميل):** بەلالیکا ژنک ددەتە ناڤ پرچا خۆ.
**القرامطة:** جوینەکێ شیعەیێت ئیسماعیلی نە، دویڤچوویێت (حمدان بن أشعث)ن یێ کو ناسناڤێ وی (قرمط).

**القران:** ١- خواندی. ٢- کۆمکری و لێکدایی. ٣- ناڤێ کتێبا خودێ یە ژ بەر کو ژ ئایەت و سوورەتێت کۆمکری و لێکدایی پێک دهێت.

**القران(بالكسر):** ١- کنفێ ئێخسیری پێ گرێ ددەن. ٢- جۆتکرنا تشتی. ٣- کرنا حەج و عومرا ب ئێک ئیحرامێ و ب ئێک سەفەرێ. ٤- کنفێ پێ سەرێ حێشترێ دکێشن. ٤- کنفەکە پێ حێشترێ گرێددەن.

**القرانی:** ١- ژەها ژ کەڤلێ حیشترێ. ٢- یێت پێکڤەگرێدایی.

**القرانیا:** جۆرەدارەکە ل نیڤا باکۆرا گۆیا زەمینێ شین دبت، کولیلکێت وێ وەکی خیڤەتا ڤاژیکری یە، فێقییەک پێڤە دهێت دهیتە خوارن.

**القرایة:** تەختکێ بچویکێ کتێبێ ل دەمێ خواندنێ ددانن‌ەسەر.

**قرب(بفتحتین):** ١- کرە ج کاڤلانی دا. ٢- کاڤلانەک بۆ چێکر.

**قرب(بالفتح والضم):** نێزیکبوو.

**قرب(بتشدید الراء):** ١- نێزیککر. ٢- کرە ئێک ژ نێزیکێت خۆ. ٣- پێشکێشکر.

**القرب(بفتحتین):** ١- بیرا ئاڤ نێزیک یان دەستێ مرۆڤی دگوهیتێ. ٢- چوونا ب شەڤێ یە ژ بۆ گەهەشتنا دەمێ سپێدێ.

**القرب(بالضم):** ١- نێزیکی. ٢- ناڤتەنگ. ٣- ل نک سۆفیا دبیتە عبادەت.

**القربان:** ١- سەربرێ مرۆڤ ددەت دا پێ نیزیکی خودێ ببیت. ٢- هەڤالێ تایبەتی یێ د گەل شاهی درووینت. ٣- یێ نێزیکی تژیبوونێ بووی(ئامان).

**القربی:** نێزیکیا مرۆڤینیێ.

**قربة(بالضم):** ناڤتەنگ.

**قربة(مقربة):** نێزیکیا مرۆڤینیێ.

**القربة:** ١- نێزیکی ٢- ل نک سۆفیا دبیتە پلەیا نێزیکیێ.

**القربة(بالكسر):** ١- کونکێ ئاڤێ. ٢- مەشکا شیری یان یا ماستی.

**القربوس:** قەلپیس؛ دبیتە ئەو پشکا بلندا زینێ هەسپی یان یێ ماهینێ ئەوا دکەڤیتە پێشیا سیاری یان پشت وی.

**قرت:** ١- ل سەرێک هشکبوو یان د برینێ دا هشکبوو یان ل بن پیستی شینبوو ژ بەر دربدانێ(خوین). ٢- بێدەنگبوو.

**قرت(بكسر الراء):** ١- ل سەر ئێک هشکبوو یان ل بن پیستی شینبوو یان ل بن نەینووکێ ڕەشبوو(خوین). ٢- دێمێ وی ژ خەما یان کەربا هاتە گوهۆڕین.

**القرة(بالضم):** ١- ڕاوەستیانا چاڤی ژ حەزکرنا هەبوونا عەیالەکێ وەکی یێت خەلکێ. ٢- هشکبوونا چاڤی ژ ڕوندکێت ژ خەما نەبوونا عەیالی دهێنە بارین. ٣- یا تەزی.

**قرة العین:** ١- ئەگەرێ زوهابوونا چاڤا ژگری. ٢- پویز.

**القرة:** بەق.

**القرة(بالكسر):** سەرما.

**قرة(بتشدید الراء):** مستەک ژ تشتی.

**القرت:** تشتێ هشک.

**القرتان:** هەردو سڕ کو دبنە سپێدە و عەیشا.

**قرث:** لێ توندبوو.

**قرث(بكسر الراء):** کارکر.

**قرح:** ١- برینداركر. ٢- برین لێ چێبوون. ٣- ددانێت وی هاتن. ٤- ل عەردەکی کۆلا یێ چوجارا نەهاتیە کۆلان(بیر). ٥- ددانێ و ب سەرکەڤت. ٦- ئاڤسی لێ دیاربوو(حێشتر).

**قرح(بكسر الحاء):** برین کەتنێ.

**الهلكة(بالفتح والسكون):** جۆرێ مرنێ.
**الهلكون:** ١- عەردێ هشک و بێ گیا.
٢- عەردێ دەمەکێ درێژ باران لێ نەهاتی.
**الهلكين:** عەردێ دومەکێ درێژ باران لێ نەهاتی.
**هلل(بالفتح):** ١- بێجورعەتییێ گرت و رەڤی.
٢- پاشداچوو. ٣- گیرۆبوو.
**الهلل(بالفتح):** ١- دەستپێکا بارانێ.
٢- تەڤنێ تەڤنپیرکێ. ٣- ترس.
**هلل(بالتشديد):** ١- گۆتی(لا إله إلا الله).
٢- نڤیسار نڤیسی.
**الهلل:** ترس.
**هلم:** وەرە.
**الهلم(بفتحتين):** بەرسڤا (هلم)یە.
**الهلم(بضمتين):** مامزێت چیای.
**الهلم(بالكسر والسكون):** یێ بێهزڤەدایی.
**هلما:** هوین هەردو وەرن.
**الهلمان (الهيلمان):** ١- تشتێ مشە.
٢- خێروبێرێت مشە.
**هلمم:** گۆتێ (هلم).
**هلمن:** هوین هەمی وەرن گەلی ژنکا.
**هلموا:** هوین هەمی وەرن گەلی زەلاما.
**الهلهال:** ١- هەلبەستا نازک. ٢- جلکێ نازک.
**الهلهل(بالضم):** بەفر.
**الهلهل(بالفتح):** ١- جلکێ تەڤنێ وی خراب.
٢- هەلبەستا نازک.
**هلهل:** ١- خراب کر(تەڤن). ٢- تازککر.
٣- پاقژنەکر و چەوا هات وەسا ڤریکر.
٤- باش مۆخل نەکر. ٥- دەنگڤەدا.
٦- خۆ گرت وبێهنا خۆ فرەهـ کر.
٧- پاشڤەبر. ٨- زڤری. ٩- چونەمابوو.
١٠- ب پەڤا(هلا) لی حەیتاند ب پەیڤا (دەوار).
**الهلوع:** ١- فرشکتەنگ. ٢- یێ ژ شەری دترست. ٣- یێ قەلسییێ کەت و ل مالی ب حرس. ٤- یێ زوی بێزار دبیت و سەبری ل سەر مسیبەتا نەکێشت. ٥- یێ برسی.
**الهلوف:** ١- جۆرەکێ بەرازایە، رەنگێ وی یێ رەش یان خولیکی یە، دو ددانێ درێژ پێڤە هەنە، ل کیشوەرێ ئەفریقیا دژیت.
٢- گرانێ دلرەق. ٣- یێ گەلەک ب پویت. ٤- رهدینا مەزن. ٥- حێشترا پیرا گەلەک ب پویت. ٦- بەرازێ کویڤی.
٧- پیرمێرێ مەزن و دانعەمر.
**الهلوفة:** ١- درەوکەر. ٢- مارێ مەزنێ گەلەک ب پویت. ٣- پیرەژن.
**الهلوک:** ژنکا پویچا بالۆلی و ب گر.
**الهليلة:** عەردێ ژ ناڤ عەردا هەمیا تنێ باران ل وی هاتی.
**الهليم:** تشتێ دهێتن ئانکو برێڤە.
**الهليوسكوب:** دوێربینا چاڤک رەش یا کو ژ بۆ زێرەڤانیا تولپێ رۆژێ دهێتە ب کارئینان.
**الهليوكوبتر:** ئەو جۆرێ فرۆکێ یە یا پەروەانەیێ وێ ب پشتێ ڤە و دشێت ستوینکانی بهێتە خوارێ و د جهدا ب راوەستیت (یۆنانی) یە.
**الهليوم:** غازەکە یا تیر و سڤکە و ئاگر نا بەربیتێ، ژ کانییێت گازا رەش دهێتە دەرئێخستن.
**الهليون:** کۆما (هليونة) جۆرەکێ گیایە رهیە و ریشالێت خۆ د بن عەردی دا بەلاڤ دکەت جۆرەکێ فێقی پێڤە دهێت ب کەلاندن دهێتە خوارن.
**هم(بالفتح والتشديد):** ١- دلتەنگکر و ب خەمئێخست. ٢- لەشێ وی حەلاند.
٣- حەلاند. ٤- دۆهت. ٥- کرە دلێ خۆ و قەستکرێ. ٦- ڤیا و حەژێکر.
٧- ناڤکا وی خوار و خلۆلەکر. ٨- بوو خەم. ٩- ڤیا.
**الهم(بالفتح):** ١- خەم. ٢- نیاز؛ ئنیەت.
٣- حەز.
**الهم(بالكسر):** ١- زراڤێ لەغەر. ٢- پیرێ چوویی. ٣- کەڤن و شکەستی.٤- پیرێ چوویی.
**هماً:** ١- راکێشا ئینا دریا. ٢- پوێتیکر.

**الهمء:** جلکێ دڕیای و پوێتی.
**هما:** باری.
**همی:** ١- بەرزەبوو. ٢- کەڤت. ٣- ڕست. ٤- باری. ٥- ل چەروانی بەلاڤبوو.
**الهماذي:** ١- لەزا د غاردانێ دا. ٢- دژواریا بارانێ. ٣- دژواریا گەرمێ.
**الهمار:** ١- یێ ب ڤەرێژ. ٢- یێ پڕبێژ.
**الهماز(بتشدید المیم):** ١- لۆمەکەرێ ب ئاماژەکرنێ لۆمە دکەت. ٢- یێ تەحنا ددانیتە خەلکی.
**الهماس:** ١- شێرێ نێچیرێ د پەلخینت. ٢- یێ گەلەک پسپسێ د ئاخفتنێ دا ب کاردئینت.
**الهماط:** زۆردار.
**الهمال:** ١- عەردێ کەس ئاڤانەکەت. ٢- عەردێ سست. ٣- هەر تشتێ سست و پست.
**الهمالیل:** ١- گیا و چەروانێ مایی. ٢- جلکێ دڕیای.
**الهمام(بالفتح):** ١- یێ تشتی دکەتە ئنیەت و بجهدئینت. ٢- پێزەڤەنگ.
**الهمام(بالضم):** ١- بەز یان بەفرا حەلهای. شاهێ حەز مەزن. ٢- سالارێ دلێرێ مەرد. ٣- شێر.
**الهمایون:** ١- سولتان. ٢- شاه. ٣- د بنیات دا ژ پەیڤا (هما) یا فارسی هاتیە کو بیتە تەیرکێ دەولەتێ یێ چیڤانۆک دبێژن: بالندەیەکێ وەکی شاهینی یە و خوارنا وی هەستی نە، یێ دادەتە سەر یەرێ وی دێ گەهیتە پلەیێت بلند و دبێژن ل دەمێت گەلەک گەڤن دەما شاهێ وەلاتەکی بێ دویندەهـ مریا دا خەلکی ل گۆڕەپانەکێ خڕڤەکەن و تەیرکێ دەولەتێ هەلاڤێژن یێ دادابا سەر سەری دا وی کەنە شاهێ خۆ. ٤- ناڤێ ئاهەنگەکا مۆزیکی یا ئیرانی یە. ٥- دەرگەهێ سولتانی.
**همت:** د ڕوینی دا ئاڤابوو.
**الهمة(بالفتح):** ١- دەستپێکا ئنیەتێ. ٢- نیاز یان ئنیەتا ب هێز. ٣- نویسیانا دلی ب تشتێ گرنگی پێدایی ڤە.

**الهمة(بالکسر):** ١- پیرەمێرێ چوویی. ٢- پیرەژنا چوویی.
**همج:** ١- برسیبوو. ٢- ب ئێک جار پێرانا و ڤەخوار هەتا کۆ تێربووی.
**الهمج(بفتحتین):** ١- کۆمە کتا وێ (همجة)ە کو دبیتە برس. ٢- مێشک؛ مێشەکا هویرە ژ مێشێ هویرترە ب دەڤ و لێڤێت پەز و دەوارا ڤە دمینت. ٣- مهێت لاواز و لەغەر. ٤- نەریبەری. ٥- مرۆڤێت بێعەقل. ٦- مرۆڤێت بێخێر.
**الهمجیة:** ڕەوشا دژی شارستانیەتێ.
**همد:** ١- ڤەمری(ئاگر). ٢- گەرما وی چوو (ئاگر). ٣- مر. ٤- ڕاوەستا(دەنگ). ٥- بێ ژیانبوو ئانکو بێ دار و گیا و بارانبوو(عەرد). ٦- گوڕیا وی چوو و نەما(ئاگر). ٧- چرچڕبوو (جلک).
**همد(بالفتح والتشدید):** ١- ڤەمراند(ئاگر). ٢- ساركر(ئاگر). ٣- مراند. ٤- ڕاوەستاند (دەنگ). ٥- بێ گیا و دار و بارانکر(عەرد). ٦- گوڕیا وی ڤەمراند (ئاگر). ٧- چرچڕکر (حلک).
**الهمدة:** هشبوون؛ بێدەنگی.
**همذان:** باژێرێ (همدان)ێ ئیرانێ یە.
**الهمذاني:** ١- یێ ژ خەلکێ باژێرێ (همدان)ێ ئیرانی. ٢- یێ پڕبێژ. ٣- ئەو جۆرێ ڕیڤەچوونێ یە یێ خودان هەمی جۆرێت وێ تێکهەلدکەت.
**همر:** ١- دارێهت. ٢- ڕیهت. ٣- دارژیا. ٤- هەمی دوهت(گوهان). ٥- دایێ. ٦- هەرافت (ئاڤاهی). ٧- ب سمێت خۆ ب دژواری قوتا(عەرد). ٨- زێدەکر.
**الهمر(بالفتح والکسر):** یێ ستویر و قەلەو.
**الهمرة:** ١- ئێک جارا (همر)ە. ٢- تاڤیەکا بارانێ. ٣- پتپتا ژ کەرب.
**همرج:** شێلوبێلکر.

**الهمرجة:** ١- شێلوبیلکرن. ٢- شێلوبێلی. ٣- سڤکی. ٤- لەز. ٥- گۆتگۆتکێت خەلکی. ٦- نەحەقی.
**الهمرجان:** گۆتگۆتکێت خەلکی.
**الهمرش:** ١- پیرەژنا ب ناڤسالڤەچووی. ٢- حێشترا گەلەک ب شیر.
**الهمرشة(الهمرش):** لڤین.
**همز:** ١- ب ئاماژەیا ئەندامەکێ لەشی لۆمەکر. ٢- دربەک لێدا. ٣- لەقەک لێدا. ٤- غەیبەتا وی کر. ٥- شکاند. ٦- ل عەردی دا. ٧- دەخشەک لێدا دا بچیت. ٨- گڤاشت. ٩- وەسواسەک د دلی دا چێکر.
**الهمز:** دیناتی.
**همزی:** یا ب دەنگەکێ دژوار.
**الهمزات:** ئەو هزرێت خرابن یێت شەیتان د دلێ مرۆڤی دا چێدکەت.
**الهمزة(بالضم والفتح):** لۆمەکەر. ٢- لۆمەکەرێ ب ئاماژەکرنێ لۆمە دکەت.
**الهمزة(بالفتح والسکون):** ١- ئێک ئاماژە وەک لۆمە. ٢- خەتەرا شەیتانی.
**همس:** ١- ڤەشارت. ٢- هێدیکا گۆت. ٣- دەڤگرتی جوی. ٤- وەسواس کرە دلی. ٥- پێ خۆ هێدی دانا دا دەنگ ژێ نەهێت. ٦- گڤاشت. ٧- شکاند. ٨- پسپسکر. ٩- ب شەڤ بێی خاڤی و سستی چوو.
**الهمس:** ١- پسپس؛ دەنێ نزم. ٢- پێژنا پێی. ٣- دەڤ گرتن ل دەمێ خوارنێ. ٤- توندی.
**همش:** ١- کۆمکر. ٢- لەقەک لێدا. ٣- ئاخڤتنا نەدورست زێدەکر. ٤- ئاخڤتن و لڤین. ٥- لڤی دا ب ئاریێت.
**همش(بالفتح والکسر):** ١- زێدە ئاخڤتنێت نەدورست کرن. ٢- ئاخڤتن و لڤین. ٣- لڤی دا بئاریێت(کولی).
**همش(بالفتح والتشدید):** ل پەراوێزا کتێبێ تێبینی نڤیسین.
**الهمش(بالفتح والسکون):** لەزا خوارنێ.
**الهمش(بالفتح والکسر):** یێ ب تبلێت خۆ سڤک کاردکەت.
**الهمشی:** ١- یا ل مالا خۆ نەروینت. ٢- یا گەلەک پرێژ و ب قەسەو و ئاخڤتن.
**همط:** ١- زۆرداریکر. ٢- پویتە ب وان گۆتنا یێت کرین و وان ئاخڤتنێت گۆتین نەکر. ٣- بێی کیشان و پیڤان بر.
**همع:** ١- هاتە خوارێ (ڕوندک). ٢- باری (ڕوندک). ٣- شکاند(سەر).
**همع(بالفتح والکسر):** یێ دبارت.
**همغ:** شکاند(سەر).
**همک:** خۆ دناڤڕاکر.
**همل:** ١- ڕست. ٢- ژپاشگوهڤە هاتە هاڤێتن و پشتا خۆ داین. ٣- تژی ڕوندک بوو. ٤- باری ب ئارامی بەردەوامبوو.
**الهمل(بفتحتین):** ١- ئاڤا دهەرکیت. ٢- لیفێ ژ دارێ ڤەکری. ٣- ئاژەلێ ب شەڤ بێ شڤان ماین. ٤- خانیێ سپی. ٥- خانیێ بچویک. ٦- پەزێ ب رۆژێ بێ شڤان بچەرت.٧- پەزێ بێ شڤان.
**الهمل(بالکسر والسکون):** ١- جلکێ پنیکری. ٢- مرۆڤێ دانعەمر.
**الهملاج:** بارگیرێ چوون باش.
**هملج:** ١- خۆش و سڤک ب ڕێڤەچوو. ٢- ڕەفتارا وی باشبوو.
**الهملج:** ١- یێ بێ ئەختوبار و براینیا کەسێ ب دۆم نەکەت. ٢- حیشترا بەزەک. ٣- زەلامێ چوونسڤک یێ ڕپرپێ ژ پێت خۆ دئینت.

**هملق:** لەزکر.
**همـم:** ١- د بـەرا گـۆت و نڤانـد(بچویک). ٢- بەردا.
**همه(بتشدید المیم):** حەلاند.
**همهام(بالبناء علی الکسر):** ناڤە ئانکو چو نەما.
**الهمهام:** ١- سالارێ دلێرێ مەرد. ٢- شێر.
**الهمهامة(الهمهومة):** کەرێ مەزنێ حێشترا.
**همهـم:** ١- پسپسـکر. ٢- ئـهێن ژێ هـات. ٣- دەنگکر.
**الهمهمة:** ١- همهم؛ دەنگێ ژ سینگی دەردکەڤیت. ٢- دەنگێ عەوری.
**الهمـوس:** ١- یـێ ب شـەڤێ ب رێڤـەدچت. ٢- شێرێ درب سست. ٣- شێرێ نێچیرا خۆ دپەلخینت.
**الهموع:** یێ درسییێت.
**الهموع:** یێ گەلەک ب باران.
**الهموم:** ١- یا چوون خـۆش(حێشتر). ٢- یا ب ڤەرێژ(عـــــەور). ٣- گەلـــــــەک ب ئاڤ(بیر). ٤- شێر.
**الهمیان:** ١- رژتن. ٢- دوخین. ٣- تویرکێ پارا.
**الهمـیج:** ١- یـێ گـەنج و لـــەش جـوان. ٢- بێزک؛ ناڤتەنگ زراڤ.
**الهمیر(الهمیرة):** پیرەژنا چوویی.
**الهمـیس:** ١- رێڤـەچوونا بـێ پێـژن و دەنـگ. ٢- دەنگێت سمێت حێشترا.
**الهمیشة:** کولیێت کەلاندی.
**الهمیغ:** ١- مـرن. ٢- مرنا لـەزلێکری ئانکو دەمێ وێ ئینایە پێش.
**الهمیم:** ١- پێژنا چوونێ. ٢- بارانا لاواز.
**الهمیمة:** ١- باران نەرم و هویر.
**هن(بـالفتح والتشـدید):** ١- گـرێ؛ کرەگـری. ٢- خەریببوو.
**هن(بالضم والتشدید):** ئەو(ئانکو ئەو ژنک.
**هن(بالضم):** بمینە.

**هنئ به:** پێ کەیڤخۆشبوو.
**هنئ منه:** ژێ تێربوو.
**الهنئ:** ١- دان. ٢- قەتران تێدان.
**هنؤ:** ب ساناهی ب دەستکەڤت.
**هنئ:** ڤێرێ.
**هنأ بـ:** گۆتێ: (لیهنئک).
**هنا(بالضم والتشدید):** ئالاڤێ ئاماژەکرنێ یە ئانکو ڤێرێ.
**هنا(بالفتح):** ئەز.
**هنـأ:** ١- خـوارن دایـی. ٢- دایـێ. ٣- قـەتران تێـدا. ٤- پشـتەڤانیا وی کـر. ٥- لـێ غێفـــری. ٦- دلخۆشـــبوو. ٧- گـــۆتێ: (لیهنئک). ٨- چێکر و دورستکر.
**الهـنء:** ١- دان؛ بەخشـین. ٢- قـەترانکرن. ٣- پیچەک ژ شەڤێ.
**هنا(بالفتح):** ١- ئەز. ٢- یاری و مژویلاهی.
**هنا(بالضم):** ل ڤێرێ.
**الهناء:** خێر و خۆشی.
**الهناء(بالکسـر):** ١- قـەتران. ٢- ئویشـیێ دارقەسپێ ئانکو یێ قەسپا.
**الهنابت:** ١- مسیبەت. ٢- شۆل و دەنگۆباسێت شێلوبێل.
**الهنـابر:** کۆمـە و ئیکـا وێ (هنبـۆرة)ە ئـانکو خیزێ بلند و ل هنداڤا.
**الهناة:** مسیبەت.
**الهناع:** ئێشەکە ستۆیا دگریت.
**الهنادک:** کۆمە و کتا وی (هندکي) یە ئانکو زەلامی هندستانی، ل ڤێرێ پیتا(کاف) بۆ کێمکرنێ یە.
**هناک(هنالک):** ئاماژەیە بۆ جهێ دویر.
**الهنانة:** ١- مەژی. ٢- سپیکا چاڤی. ٣- باشی.
**هناه:** پیرۆزباهی لێ کرن.
**هنبت:** خاڤ و سستبوو.
**الهنبتة:** ١- شۆلا سەخت و دژوار. ٢- تیکهەلکرنا ئاخڤتنێ.
**الهنبذة:** شۆلا سەخت و دژوار.
**الهنبر(بالکسر):** ١- جەحشک. ٢- حەفتیار. ٣- تێژکێ حەڤتیاری. ٤- گا. ٥- هەسپ. ٦- کەڤلێ ب کێرنەهاتی.

**الهنبـرة:** ١- مێـا (الهنبـر). ٢- ماكـەر. ٣- حەفتیار.
**هنبس(تهنبس):** سیخوڕیکر.
**هنبغ:** ١- برسیبوو. ٢- زێدەبوو و ئاریا(تۆز).
**الهنبغ:** ١- تۆزا ب ساناهی ڕادبیت. ٢- ژنکا بێدەلنگ و کەر. ٣- شێر. ٤- دژواریا برسێ. ٥- دژوار.
**هنبل:** لەنگی و وەکی حەفتیار چوو.
**الهنبورة:** خیزێ بلند و ل هنداڤا.
**هنتب:** خاڤ و سستبوو.
**هند:** دەنگێ کوندی کر.
**هند(بالتشدید):** ١- خەبەرێت پیس گۆتن. ٢- خەبەرێت وی یێ خەبەر گوتنێ لێ نەڤەگێران. ٣- قوسیری تێدا کر. ٤- گیرۆبوو. ٥- هوسێ؛ سەقاکر. ٦- ئەڤینی د دلی دا هێلا.
**الهند(الهیندة):** ناڤێ سەد حێشترا و پێهەلە.
**الهنداز:** ١- پیڤان. ٢- گەزا پیڤانا درێژاهیێ.
**الهندازة:** گەزا پیڤانێ.
**الهندام:** ١- جوانی و کێلیا بەژنێ. ٢- ڕاپێچا مرۆڤی ژ جلک و خەملێ(فارسی) یە.
**الهندباء(الهندب؛ الهندبا):** گیایێ تەعلیشک.
**الهندباء البریة:** ١- جۆرەکێ شەڤبشکێڤا یە یێ هویرە. ٢- گیایەکە بەلگێت وی ددانوکن، گەلەک جۆر ژێ هەنە، ل هندەک وەلاتا دکەنە زەلاتێ و وەک دەرمان ژی بۆ چارەکرنا قەبزیێ ب کاردئینن، (الهندباة) کتا (الهندباء)ە.
**هندس:** ١- خوین ئالیست. ٢- لێڤێت خۆ ئالیستن. ٣- پیڤا و ئەندازەکر.
**الهندس:** ١- شێر. ٢- دلێر.
**الهندسة:** ئەزدازیاری.
**هندم:** ١- جوان و باش چێکر. ٢- چێکر و قەدارەکر.
**هندن:** ١- ڕاوەستا؛ ئارامبوو. ٢- ترسیا و سستبوو. ٣- ڕاوەستاند و ب ئاخڤتنەکێ یان سۆزەکێ قائیلکر. ٤- قائیلکر. ٥- بنئاخکر. ٦- کوشت.
**الهندواني:** یێ ژ هندستانێ.
**الهندوس:** ئەندازیار.
**هنع:** ١- خوارکر و چەماندە سەرێک. ٢- خۆ شکاند و چەماند.
**الهنع:** خۆ چەماندن.
**الهنعاء:** ١- مێیا(الأهنع)ە. ٢- یا ستۆبادایی. ٣- یا کورت.
**الهنعة:** ١- ئێکا جارا (هنع) یە. ٢- پشتا برجێ (الجوزاء)ە و ژ پێنج ستێران پێکدهێت کو وێنەیێ کۆپالی پێک دئینن.
**هنف:** لەزکر.
**الهنق:** بێزاری.
**الهنم:** ١- خورمە. ٢- جۆرەکێ خورمێ یە.
**هە:** دەنگەگە ژ بۆ هشیارکرنێ و گەفێ دهێتە ب کارئینان.
**الهنو(بالکسر):** دەم.
**الهنيء:** ١- یێ ب ساناهی ب دەست مرۆڤی دکەڤت. ٢- یێ ل مرۆڤی د غێفرت.
**هنیهە:** بیهنکەکێ؛ دەمەکێ کورت.
**هنا:** ئەها ڤێرێ.
**هو:** ١- جیناڤێ کەسێ نەدیارێ کتە دبیتە ئەو. ٢- ل نک سۆفیا ذاتی خودێ حەقە.
**الهو:** ١- ڕەخ؛ تەنشت. ٢- کولەک.
**الهوء:** ڕایا دهێتە ب جهئینان.
**هوی:** ١- ڤیا. ٢- کەڤت. ٣- ژۆردا هاتێ. ٤- درێژبوویێ. ٥- ڕابوو(بـا). ٦- ب ناڤڤەچوو. ٧- مر. ٨- دەڤێ خۆ ڤەکر. ٩- ب سەرکەڤت.
**الهوی(بالفتح والکسر):** ئەڤیندار.
**هوی(بالفتح والکسر):** ڤیا و دلێ وی چوویێ.
**الهوی:** ١- عشق، ٢- ئەڤین. ٣- بایبکێت نەفسێ و خۆشیێت وێ. ٤- حەزا نەفسێ و چوونا وێ بۆ خوشیێت دنیایێ.
**الهواء:** ١- با. ٢- تشتێ ڤالا. ٣- تشتێ بندرپای وەکی کونکی. ٤- تشتێ کەڤتی. ٥- ڤالاتی. ٦- ل نک سۆفیا دبیتە غەیبا چێنەبیت کەس ببینت.

**الهواءة:** ١- عەردێ نزم و چال. ٢- زەمبۆقە.

**الهوائي:** ١- یێ ترسنۆک. ٢- ئەریەل؛ ئەنتێن.

**الهواجم:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبیتە ئەو تشتێ ب هێزا دەمی د دلی دا پەیدا دبیت.

**الهوادة:** ١- تشتی هویڤی ژێ هەین کو دێ ئاشتییێ د ناڤبەرا خەلکی دا پەیداکەت. ٢- نەرمی. ٣- خۆشرینکرن.

**الهوارة (بفتحتين):** مرن.

**الهوارة (بالفتح والتشديد):** لەشکەرێ نەرێکخستی.

**الهواس (الهواسة):** ١- شێرێ ب شەڤێ دگەریێت. ٢- دلێرێ سەربۆرکری. ٣- یێ ب خوەرە.

**الهواع (الهواعة):** دلێ هاتیە ڕاکرن.

**الهواک:** یێ حێبەتی.

**الهوام (بالضم):** ئەڤینی.

**الهوام (بالفتح والتشديد):** شێر.

**الهوام:** مێشەوەرێت زیاندەر.

**الهومان (الهومة):** بیابان.

**الهوامج:** یێت ئێکجار ب ئاڤێ ڕانای و تێر ڤەخواری.

**هوان:** ١- بێبهایی. ٢- لاوازی. ٣- ڕەزیلی و بێحالی ژ لایێ ژیانێ ڤە.

**الهواهي:** ئاخڤتنا پوچ و پەلاچە.

**الهواية:** ئارەزۆ.

**الهوب:** ١- دویری. ٢- بێعەقلێ پرێێژ. ٣- گوریا ئاگری.

**الهوبر:** ١- سۆسنا سۆر. ٢- بەڤل. ٣- مەیموینکا گەلەک ب موی. ٤- حێشتر.

**هوت (بالفتح والتشديد):** کرە قێری.

**هوة:** مستا دانی یا دکەنە کونا دستاری.

**الهوة:** ١- عەردێ نزم وچال. ٢- چال. ٣- زەمبۆقە. ٤- ڤالاتیا د ناڤبەرا عەردی و عەسمانی دا.

**الهوتة:** ١- عەردێ نزم. ٢- ڕێکا دبیتە ژۆردانی هەتا دگەهیتە ئاڤێ.

**الهوثة:** تێهنکاتی.

**هوج:** یێ کەرەدرێژبوو.

**الهوجاء:** ١- حێشرا بەزەک. ٢- هورێ گەلەک دژوارێ خانیا دبەت. ٣- یێ دگەهیتە هناڤا (درب).

**هوجل:** ١- خەوەکا سڤک کر. ٢- ل بیابێت ب ڕێڤەچوو یان ل ڕیکا بێ نیشان یان ل عەردێ ب چەپ و چویر.

**الهوجل:** ١- بیابنا بێ نیشانێت ڕێ. ٢- ڕێکا بێ نیشان. ٣- عەردێ ب چەپ و چویر. ٤- یێ چوون گران. ٥- یێ بێعەقل. ٦- ژنکا بێ دەلنک. ٧- پیچا خەوێ. ٨- ئەڤەری کەشتییێ. ٩- چوونا ب سستی.

**هود (بالفتح والتشديد):** ١- دەنگێ خۆ ب نەرمی دەرئێخست. ٢- ڕیڤەچوونەکا سستکر. ٣- ستران گۆتن. ٤- دلێ وی ب سترانا خۆ خرابکر. ٥- کرە جوهی. ٦- سەرخۆشکر. ٧- ب ئارمی ئاخڤت. ٨- ب گرانی چوو. ٩- گوشتێ کۆهانێ خوار.

**الهود:** جوهی.

**هود:** پێغەمبەرێ مللەتێ (عاد) بوو سلاڤ لێ بن.

**هود:** گوهانێ حێشترێ.

**الهودج:** مەحاف.

**الهودعة:** کەردیکل(نەعام).

**الهودک:** یێ ڤەلەو.

**هوذا:** ژ (هو) و (ذا) پێکهاتیە دبیتە: ئەو ئەڤەیە.

**الهوذة:** بالندەیێ کەتیک.

**الهـور:** ١- گـەڕا ئـاڤێ. ٢- كـەرێ پـەزی. ٣- پێ پان و بەرین.

**الهورة:** پێمرن.

**هوز(بـالفتح والتشـديد):** ١- مـر. ٢- پـەیڤا دووێ یـە ژ پـەیڤێت پیتێـت ئەبجـدی ژێ پێكدهێن كو دبیتە: (هـ) و (و) و (ز).

**الهوز:** چێكری(یێت خودێ).

**الهـوزب:** ١- بالنـدەیێ قـورت. ٢- حێشـترا چوون دژوار.

**الهوزن:** تۆز.

**هوس(بالتشـديد):** ١- قـەتا داهویربییـت. ٢- هـێلا بكەڤیتـە خوركومانـا خـۆ تێـك بچیت.

**هوس(بالفتح والكسر):** كەتە خوڕكومانا خۆ و تێكچوو.

**الهوس:** جۆرەكێ دیناتییێ بە.

**الهوش(بالفتح والسكون):** ژمارەیا زۆر.

**هـوش (بـالفتح والكسـر):** ١- تێكچـوو. ٢- تێكهاتن و تێكچوو.

**هوش(بـالفتح والتشـديد):** ١- تیكهـەلكر. ٢- ژ ڤێـــرێ و وێراهــــە خرڤـــەكر. ٣- ژ گەلـەك جۆرا ئینـا. ٤- لێكئێخست و پێكڕابەردان.

**هوش(بـالفتح والكسـر):** زكـێ وی ژ لاوازیـێ بچویكبوو.

**الهـوش (بـالفتح والسـكون):** ١- ژمارەیـا گەلەك. ٢- ڤالاتیا زكی.

**الهوشـات:** ١- مـالێ ژ حـەرامی و حـەلالی تێكهەلكری. ٢- كۆمێت مرۆڤا.

**الهوشـة:** ١- ئایـان. ٢- فتنـە و شـلقیان. ٣- لڤـین. ٤- كۆمـا تێكهـەلبووی. ٥- رویدان.

**الهوع(الهـواع؛ الهيعوعـة):** یـێ دلـێ وی ڕابووی.

**الهوع:** دوژمنی.

**الهـوف:** ١- بـایێ گـەرم. ٢- بـایێ سـار. ٣- زەلامێ بێخێر.

**هوک:** كەربوو.

**هوک(بالفتح والتشديد):** كەركر.

**الهوک(الأهوک):** كەرەمرۆڤ.

**الهوكة:** چال.

**هول(بالتشـديد):** ١- ترسـاند. ٢- كرێـت دا نیاسین. ٣- مەزنكر. ٤- جلک و چەكێت خۆ ل خۆ كرن(ژنكێ).

**الهول:** ترسا ژ تشتی.

**الهولة(بالضـم):** ١- هەلامـەتێ نـاڤ ڕەزی. ٢- تشـــتێ بچـــویكی پـــێ دترســـینن. ٣- جریسەت.

**هوم(بتشديد):** ١- سەرێ وی ژ خەو دا هژیا. ٢- پیچەكێ نڤست.

**الهوم:** ١- خەوا سڤک. ٢- عەردێ نزم.

**هوم المجوس:** گیایـەكێ وەكـی یاسمینێ یـە، قـورمێ وی یـێ زراڤـە و كولیلكیـت وی دزەرن، یێ تام شرین و دژوارە، زەرادەشتیا د پەرسـتنا خـۆ دا ب كاردئینـا و دگـۆتن مفایێت عنتیكە تێدا هەنە.

**الهوماة(الهومة):** بیابان.

**هون(بـالفتح والتشـديد):** ١- ب سـاناهیكر و سڤک كر. ٢- دیت یێ سڤک و چونە.

**الهـون(بالضم والسـكون):** ١- شـەرمزاری و ڕویڕەشی. ٢- خولقەت.

**الهون(بالضم):** شەرمزاری؛ ڕویڕەشی.

**الهون(بالفتح والسكون):** ١- هەدار و گرانی. ٢- سـڤكی. ٣- بێبهـایی. ٤- ئـابۆری تێداكرن.

**الهونـة (بالضـم والسـكون):** ١- ئـارامی. ٢- ئاشتبوون.

**الهونة(بالفتح والسكون):** یا ب ساناهی و نازک.
**الهوها:** بیرا جهێ پیا ل دیوارێت وێ نە و بێ وەریس.
**الهوهاء:** ١- یێ دل لاواز. ٢- یێ کەر.
**الهوهاءة:** یێ کەر.
**الهوهة(الهواهیة):** یێ ترسنۆک.
**هوهو:** ئێکبوونا ذاتا.
**الهوهو:** ئەو ئەو.
**الهویة(بالفتح):** بیرا کویر.
**الهویة(بالضم):** ١- ناسنامە. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە ڕاستیا د جیهانا غەیبێ دا.
**الهویس:** ١- هزر. ٢- تشتی مرۆڤی کریە دلێ خۆ. ٣- گولی و گەنمۆکێ دهێنە بژارتن بۆ خوارنێ.
**الهویشة:** کۆما تێکهەل.
**الهوینا:** هێدی و ب دلێ خۆ.
**الهییئ(الهییء):** یێ سەروبەر جوان.
**هیئة:** ١- دەستەک. ٢- سەروبەر.
**هیا:** ئالاڤێ گازیکرنێ یە ئانکو (وەرە).
**هیا:** ئالاڤێ گازیکرنێ یە دبیتە(أیا) ئانکو (ئەی..).
**هیأ:** ئامادەکر.
**الهیاة:** شۆل، کار.
**هیاج:** ئاریان؛ ئازریان.
**الهیار:** ١- یێ لاواز. ٢- یێ دهەرفت و دکەڤت.
**الهیاط:** قەرەبالغ و دەنگ و پێژن.
**الهیاع:** بەلاڤەبوون.
**هیال:** خیزێ خشیای.
**الهیام(بالضم):** ١- تێهنا دژوار. ٢- خیزێ خۆ نەگریت و د خشییێت. ٣- دیناتیا ژ عشقێ چێبووی. ٤- تێهنکا ل حێشترا دکەڤیت.
**الهیام(بالفتح):** خیزێ ب سەرێک دا دهێت و خۆ نەگریت. - دیناتیا ژ عشقێ چێدبیت. دەردەکە حیشترا دگریت ژ بەر دژواریا تیهنیبوونێ.
**الهیام(بالکسر):** حێشترێت تێهنی.
**الهیام(بالضم والتشدید):** عاشڤێت وەسواسێ گرتین.
**هیاە:** دورستکر.
**الهیبان:** ١- یێ ژ خەلکی دترست. ٢- ترسنوک. ٣- شڤان. ٤- ئاخ. ٥- کەفا دەڤێ حێشترا. ٦- یێ گەلەک و زەحف. ٧- یێ سڤک.
**الهیبة:** ١- سەهم. ٢- ل نک سۆفیا کارتێکرنا دیتنا مەزناهیا خودێ د دلی دا.
**هیت(بالفتح والتشدید):** گازیکرێ.
**هیت لک(هلم):** وەرە.
**الهیت:** عەردێ مرۆڤ نەزانت چ ل بنی هەیە.
**الهیثة:** جڤاتا مرۆڤا.
**هیثم:** ١- دارەکە ژ نفشێ ترنجێ. ٢- باشۆک. ٣- تێژگێ باشۆکی. ٤- تێژکێ ئەلهۆی. ٥- تێژکێ قورتی.
**هیج:** ئاراند.
**الهیج:** ١- زەراتی. ٢- هشکی.
**الهیجاء(الهیجا):** جەنگ؛ شەڕ.
**الهیجمانة:** ١- لۆلۆ. ٢- تەڤنپیرکێ نێر.
**الهید:** ١- یێ نەرحەت و دلڤلڤیت. ٢- ترساندن. ٣- ئازاردان. ٤- ژپاشڤەبرن. ٥- بزاڤ و لڤین.
**الهیدان:** ١- یێ ترسنۆک. ٢- یێ نەرحەت. ٣- قەلسێ کەر.
**الهیدب:** ١- یێ گەلەک ب موی. ٢- چچکێ ژنکێ. ٣- عەورێ شۆڕ. ٤- دەڤلالۆتەیێ قەسەگران. ٥- تایێ دارێ.

**الهیدروجین:** غازەکا بێ ڕەنگ و بێهنە ژ هەمی غازا سڤکترە، ئاگر بەردبیتێ، دو جۆرن: ١- هێدروجینا نۆرمال یا کو هاتیە سـالۆخەتدان. ٢- هیـدروجینا گران(الدوتیریوم): گرانیا وێ دو جارا هندی ئۆکسجینا نۆرمالە د گەل ئۆکسجینێ هەل دبیت و ئاڤێ پێکدئینت، دیسا د ڤەکۆلینێت ئەتۆمی دا دهێتە ب کارئینان.

**الهیر:** ١- بایێ باکۆر. ٢- نیڤا ئێکێ ژ شەڤێ. ٣- یێ د شۆلا دا ل سەرێ خۆ سیاردبیت.

**الهیرة:** عەردێ ڕاست.

**الهیرع:** ١- ترسنۆکێ لاواز. ٢- کەرەمرۆڤ. ٣- ژنکا بالۆلی. ٣- یێ دژوار(با).

**الهیرعة:** ١- بلویلا شڤانی. ٣- یێ دژوار(با).

**الهیرون:** ١- جۆرەکێ خورمێ یە. ٢- خورما هشک.

**الهیزعة:** ١- ترس. ٢- دەنگ و پێژنا ژ شەڕی دهێت.

**الهیزلة:** ئالا.

**الهیزم:** ١- ڕەقێ موکم. ٢- شێر.

**الهیشة(هوشة):** ١- لڤین و ئازریان. ٢- کۆما تێکهەل. ٣- بەلا؛ فتنە.

**الهیشر:** ١- یێ درێژ و خاڤ و سست (زەلام). ٢- کەنگرێ بیابانێ.

**الهیشلة:** حێشترا پیر و قەلەو.

**الهیشوم:** تەڕ و نازک و نەرم.

**الهیص:** پیڤا بالندەی.

**الهیصم:** یێ تشتی دشکێنت و هویرهویر دکەت.

**هیض(بالفتح والتشدید):** ئاراند.

**الهیض:** ١- شکاندنا هەستی پشتی ڤەگرتنێ. ٢- قەرەبالغ و دەنگەدەنگ.٣- گویێ بالندەی.

**الهیضاء:** جڤاتا مرۆڤا.

**الهیضة الکبری:** شکاندن و سستکرن.

**الهیضة:** ١- زکچوون دگەل دلڕابوونێ. ٢- ئێشا کولیرا. ٣- لێزڤڕینا خەمێ. ٤- ئێشا ل دویڤ ئێشێ.

**الهیط:** قەرەبالغ و دەنگەدەنگ.

**الهیطل:** ١- ڕویڤی. ٢- کۆما کێما هێرشێ پێ دکەن. ٣- ئاڤێ کەڤنێ دەڤەرا ڕۆژهەلات و باکوری دەریا خەزەرە. ٤- نفشەکێ ترکا یە یان یێ هندۆکا.

**الهیطلة:** قازانا سفری(فارسی) یە.

**الهیعة:** ١- چوونا تشتێ و ڕژیانا وی ل سەر عەردی. ٢- عەردێ ڕاست. ٣- دەنگێ مرۆڤ ژێ بترست. ٤- حرسا پیسا دگەل لاوازیێ.

**هیعر:** کرە بێدەلنگی.

**الهیعرة:** ١- ژنکا بێدەلنگ. ٢- سەرگەرمی و کەربنی. ٣- پیرهەڤی.

**هیغ:** باش باری.

**هیف(بالکسر):** ناڤتەنگا وی زراڤبوو.

**الهیف:** ١- ناڤتەنگزراڤی. ٢- بایەکێ گەرمە گیای هشک دکەت و حەیوانی تێهنی دکەت و ئاڤێ هشک دکەت.

**هیفاء:** ناڤتەنگزراڤ(ژنک).

**الهیفان(الهیوف):** یێ تێهنی.

**الهیق:** ١- کەردیکلێ نێر. ٢- یێ گەلەک درێژ(زەلام). ٣- یێ درێژ و زراڤ(زەلام).

**الهیقعة:** ١- چرپێنا شیری دەمێ ب تشتی دکەڤیت. ٢- قرچێنا ڤێککەڤتنا تشتیت هشک.

**الهیقل:** ١- کەردیکلێ گەنج. ٢- بزنمشک.

**الهیقلة:** جۆرەکێ ڕیڤەچوونێ یە.

**الهیقم:** ١- دەریا بەرفرەه. ٢- دەنگێ شلقێنا دەریایێ.

**هیک:** ١- لەزکر. ٢- کۆلا. ٣- بلندبوو و تایێت وی درێژبوون (گیا).

**الهيكل:** ١- پرسگەهـ، مزگەفت. ٢- قەرقۆدە. ٣- ئاڤاهیێ بلند. ٤- حەیوانێ ب کەلەخ و مەزن. ٥- جهێ قوربانا لێ ددەن ژ دێرێ. ٦- پەیکەر. ٧- جهێ ڕیوەرەسمێت دانا قوربانا ل کەنیسێ. ٨- د بنیات دا پەیڤەکا (سۆمەر)ی یە ب ڕامانا قەسر یان پەرێسگەهـ.

**الهيكل العظمي:** قەرقۆدەیێ هەستی، یێ بچویکی ژ (٣٠٠) هەستیا پێکدهێت بەلێ پیچپیچە هەتا مەزن دبیت و بالق دبیت هندەک ژێ دبنە ئێک و د ئەنجام دا ژمارەیا وان دبیتە (٢٠٦) هەستی کو ژمارەیا هەستیێت مروڤی نە.

**هيل:** خەترەرەک بۆ چێبوو و ترسیا.

**هيل(بالفتح والتشديد):** خشاندە خوار(خیز).

**الهيل:** خیزێ دخشیێت و خۆ ل سەر ئێک نەگرت.

**الهيلان:** خیزێ خشیایی.

**الهيلة:** ترسا ژ تشتی.

**الهيلع:** زەلامێ کولبەیی.

**هيلل:** گۆتی(لا إله إلا الله).

**الهيللة:** گۆتنا(لا إله إلا الله).

**الهيلمان:** ١- مال زەحف. ٢- خیز و با.

**الهيليوسكوب:** دویربینا شیشە تاری یان ڕەنگینا پێ ل تلپێ ڕۆژێ دنێرن.

**الهيليوم:** غازەکا سڤکە، ئاگر نابەربیتێ، دکەنە پوڤدانکا.

**هيم(بالتشديد):** کرە ئەڤیندار.

**الهيم(بالكسر):** ١- خیزێ هشکێ ئاڤی نەبت. ٢- یێت تێهنی.

**هيم:** د بنیات دا (أیم)یە کو دگەل ناڤێ خودێ دهێت و دبیتە (هەیم الله) ئانکو (سویند ب خودێ).

**الهيماء:** ١- بیابانا بێ ئاڤ. ٢- دەشتا بێ ئاڤ.

**الهيمان:** ١- یێ تێهنی. ٢- حێشترا تێهنک لێ کەتی. ٣- عاشقێ خەریبی دژوار و ل دویڤ سەرێ خۆ چووی هەر وەکی هەوا ب سەری کەفتی. ٤- ل نک سۆفیا دبیتە ئەڤینا ژ قامێ دەرکەتی یا د هەمی هەبویان دا دگەڕیت.

**الهيمع:** مرنا دەمەلدەست.

**هيمن:** ١- گۆتی ئامین ئانکو قەبیل بکە. ٢- کۆنترۆلکر و زەپکر.

**هيمي:** حێشترا تێهنی.

**الهين:** ١- یێ ب ساناهی. ٢- یێ لاواز. ٣- یێ ڕەزیل. ٤- یێ بێهنفرەهـ.

**هين:** ب ساناهی کەت.

**الهينة:** ١- جۆر. ٢- گرانی و ئارامی.

**هينتك:** هێدی هێدی؛ ل سەر خۆ.

**الهينم:** پەمبوی.

**الهينمة:** پسپس؛ دەنگێ نزم.

**الهينوم:** ئاخڤتنا کەس تێ نەگەهیت.

**هيهات:** ئانکو (یا دویرە).

**الهيوب:** ترسنۆک.

**الهيوفاريقون:** جۆرەکێ گیایە، بەلگێت وی د هەمبەری ئێکن و کولیلکێت وی د زەرن، ل وەلاتێت نیڤا باکۆرا گۆیا زەمینی یێت سەڤا ناڤنجی شین دبت، هندەک مفاییێت چێکرنا دەرمانا تێدا هەنە.

**الهيول:** ل (الهباء) بزڤرە.

**الهيولى(الهيول):** ١- پەیڤەکا یۆنانی یە دبیتە بنیات یان کەرەستە. ٢- کەرەستێ ئێکێ یە یێ کۆ دبیتە بنیاتێ هەر تشتەکی. جەوهەرێ لەشی یە، شیانێت هەین کو ل دویڤ وان گوهورینا بهێتە گوهۆرین یێت کو دکەڤنە جۆر و شێوەیێ لەشی.

**الهيوم:** یێ حێبەتی.

# پیتا ( و )

**و:** پیتا بیست و حەفتێ یە ژ ئەلفابێیا عەرەبی، هژمارا د حسێبا ئەبجەدی دبیتە (٦)، چەندین جۆر ژێ هەنە: ١- واوا کۆمکرنێ. ٢- واوا لێڤەگریانێ. ٣- واوا تەرتیبێ. ٤- واوا سویندێ. ٤- واوا کارێ (دکەل) دکەت. ٥- واوا کاودانی. ٦- جیناڤێ کۆمێ. ٧- واوا زێدە. ٨- واوا ب بەری خۆ ڤە هاتیە گرێدان(حسب ما قبلها).

**وأي:** ١- ژڤان دا. ٢- ڤەشارت.

**الوأي:** ١- ژڤان. ٢- وەهم. ٣- گومان. ٤- دژواریێ بەزەک. ٥- کەرێ کویڤی.

**الوأية:** قازان یان سێنیکا فرەھ.

**وئار:** چالکێت تەقنێ.

**وئام:** کونجان.

**وئبة:** بیرا کویر.

**وؤرة:** کوچکێ ئاگری.

**وأوأ:** رەوی.

**الوئيـة:** ١- جهالێ مەزن. ٢- حێشترا زک مەزن.

**الوئية:** ١- قازان فرەھ. ٢- سێهنیکا فرەھ.

**وئيد:** ١- گورمێنا گەلەک مەزن وەکی کەتنا دیوارەکی. ٢- دەنگێ حێشترێ.

**وا:** ئالاڤێ گازیکرنێ یە ئانکو (یا).

**الوأب:** ١- حیشترا ب کەلەخ. ٢- پەرداخێ مەزن و فرەھ. ٣- سمێ رەق. ٤- پێ فرە. ٥- پێ مەزن. ٦- دژوارێ سم لیکدای.

**وأب:** شەرمکر و تێکچوو.

**الوأبة:** ١- تەحا. ٢- بیرا گەلەک کویر.

**الوأج:** پێ برس دژوار.

**وأد:** ١- ب ساخی بنئاخکر. ٢- گرانکر. ٣- غەوارەکر.

**الوأد:** ١- بنئاخکرنا ب ساخی. ٢- گرانکرن. ٣- غەوارەکرن.

**وأر:** ١- بزداند؛ ترساند. ٢- هاڤیتە د ناڤ ئاریشەیەکێ دا.

**الوؤوة:** گۆچکێ ئاگری.

**وئرة:** گەرمدژوار.

**وأص:** لێدا.

**وأط:** ١- سەرەدانکر. ٢- ئاریا.

**الوأطة:** ١- عەردێ بلند. ٢- پشکا مەزنا ئاڤێ.

**وأل:** ١- بـەرێ خـۆ دایێ، قەستکرێ. ٢- داخـوازا قورتـالبوونێ ژێ کـر. ٣- کـرە جهـێ پـەنابرنێ. ٤- بـۆ خـودان زیـل. ٥- رزگاربوو.

**الوأل(الموئل؛ الموئلة):** جهـێ مـرۆڤ ژ بـۆ پارازتنا خۆ بەرێ خۆ ددەتێ.

**الوألة:** زبلێ پەزی.

**وأم:** ١- گونجا. ٢- خولقەتا وی تێکدا.

**الوأم:** مالا گەرم.

**الوأمة:** یێ زاری خەلکی ڤەدکەت.

**الوئيصة:** ١-خەلک. ٢- جڤاتا مرۆڤا.

**الوائر:** یێ بزدیای.

**واءم:** د گەل گونجا.

**الوابر:** کەس.

**الوابص:** یێ برسقی.

**وابصة:** ١- برویسی. ٢- پەل.

**الـوابط:** ١- یـێ بـێ قـەدر و رێـز. ٢- یـێ ترسنۆک. ٤- یێ کێم و چونە.

**وابل:** پێگیری کر.

**الوابل:** بارانا دژوار.

**الوابلة:** ١- مێیا (الوابـل)ە. ٢- سـەرێ هەستیێ زەندکێ یان یێ رەهنی.

**وابن:** کەس.

**الوابور:** ل (بابور) ب زڤرە.

**واتأ:** نەرماتی کر.

**الواتد:** ١- یێ خۆجهـ. ٢- یـێ قیـت. ٣- یـێ ڤەنای.

**واتر:** ١- ئێک ل دویڤ ئێک ئینا. ٢- پشـتی دەمـەک ل دویـڤ چـوو. ٣- ئێـک ل دویـڤ ئێکێ هنارت. ٤- ئێـک گـرت و ئێـک یـان دو خوارن(رۆژی).

**واتن:** ١- د گەل مـا و بەرنـەدا. ٢- وەکـی وی کر. ٣- مانا خۆ درێژکر.

**الواتن:** ١- یێ خۆجهـ و بەردەوام ل جهێ خۆ. ٢- ئاڤا زەلالا مەند.

**واثـب:** بـەری ئـەو خـۆ تێـوەبکـەت وی خـۆ تێوەرکر.

**الواثر:** یێ ل سەر تشتی خۆجهـ.

**واثق:** سۆز دایێ.

**الواثق:** ١- یێ باوەری ب هەڤالێ خۆ ئینـای. ٢- یێ پشتراست. ٣- موکم.

**الواثن:** خۆجهێ نەلڤ.

**واجب:** ل سەر کرە ئەرک؛ ل سەر فەر کر.

**الواجب:** ١- ئەرک. ٢- کوشتی. ٣- کەڤتی.

**وجبـت:** ١- بـوو ئـەرک. ٢- هاتـە کوشـتن. ٣- کەڤت.

**واجب الوجـود:** ئـەو تشـتە یـێ هـەبوونا فـەرە هـەبیت کـو دبنـە دو جـوین: ١- (واجـب الوجـود لذاتـه) کـو خـودێ یـە. ٢- (واجب الوجود بالغير) کو چێکری نە.

**الواجـد:** ١- یـێ بـێ منـەت. ٢- ئەڤینـدار. ٣- شیاندار.

**الواجز:** ١- یـێ سڤکێ کـورت. ٢- سـڤکێ ب لەز دگەهیتە مێشکێ مرۆڤ(ئاخڤتن).

**الـواجس:** ١- دەنگـێ ڤەشارتـی. ٢- خـەترە؛ خەیال؛ ئاشۆپ.

**واجف:** غارەکا سڤک کر.

**الواجم:** یێ خەما وی زۆربووی.

**واجن(وجن):** عەردێ جەهجوبر.

**واجه:** رِوی ب رِوی بوویێ.

**الواجهة:** بەرێ هەر تشتەکی.

**الواحة(الواح):** جهـێ ب ئـاڤ و دارێ ل نـاڤ بیابانا خیزی.

**الواحـد:** ١- ژمـارە ئێـک. ٢- یـێ ئێـک و نەبیتـە جـوت. ٣- ژ ناڤێـت خـودێ یـە. ٤- کتەک ژ کۆمەکێ. ٥- یێ مایە ب تنێ و بێ وێنە و هەڤکویف.

**الواحدية:** ١- رێبازەکا فەلسەفی یە دبێژیت هەبوون ئیک تشتە وەکی ماددەی یان رحێ یان عەقلی؛ ئێک ژ زانایێت وێ (سبینوزا) یە یێ دبێژیت خودێ و سرۆشت ئێکن. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە: تەجەللایا ذاتێ خودێ ب ناڤ و سالوخەت ڤە.

**الواحف:** یێ گەلەک ب پەر(چەنگ).

**واحل:** بەریکانە کر کانێ کی پتر ددەتە تەقنێ.

**واخم:** هەولدا ژ وی پتر ب حەبلت.

**واخى:** براینیا وی کر.

**الوادس:** گیایێ رۆیێ عەردی داپۆشی.

**وادع:** دگەل ئاشبوو.

**الوادق(الودوق والوديق):** ئاژەلێ هاتیە کەل.

**الوادي:** ١- نهال. ٢- رێباز.

**الواذع:** ١- ئاڤا ل سەر کەڤری دهەرکت. ٢- ئاڤا ب بلقێن دەردکەڤیت.

**الوار:** یێ هلبووی(ئاگر).

**وارب:** خاپاند و حیلە لێکر.

**الوارث:** میراتگر.

**وارد:** ١- هاتە نک. ٢- ل سەر ئێک رامان دگەل پێک هات.

**الوارد:** ١- هاتی. ٢- یێ دچیتە سەر دەراڤی. ٣- دلێر. ٤- رێ. ٥- یێ درێژ. ٦- ل نک سۆفیا دبیتە هەر تشێ دهیتە سەر هزرا دەرویشی.

**الواردة:** ١- رێک. ٢- خەلکێ ل سەر دەراڤی. ٣- داهاتی؛ هاتی.

**الوارس:** ١- یێ سۆر. ٢- یێ دژوار (رەنگ).

**الوارش:** ئەوە یێ دچیتە سەر زادێ خەلکێ بێی کو بهێتە داخوازکرن وەکو دبێژن کەڤچکێ خۆ ژ مالا خۆ دبەت.

**وارط:** خاپاند.

**وارع:** د گەل ئاخڤت و پرسیارا خۆ پێکر.

**الوارف:** یێ درێژ و بەرین(سیبەر).

**الوارق:** ١- یا ب بەلک. ٢- یا گەلەک ب بەلگ. ٣- یا بەلگ جوان.

**الوارقة:** دارا بەلگ کەسک و ب خەمل.

**وارن:** رووبەرووبوو.

**الواره:** یێ بەرفرەه.

**الواري(الوري):** یێ کریسک ژێ چووین یان هلبووی.

**وازى:** ١- کەتنە بەرانبەری ئێک. ٢- بەرانبەرکرن.

**وازر:** ١- هاریکر و ب هێزئێخست. ٢- بارکر. ٣- بوو وەزیرێ وی.

**الوازع:** ١- یێ کار و بارێت لەشکەری ب رێڤە دبەت. ٢- یێ ئێکی ژپاشڤە دبەت. ٣- صە. ٤- هاریکارێ شاهی. ٥- مەزنێت نەهێلن زێدەگاڤی ل توخیبێت خودێ بهێنە کرن. ٦- ئەوە یێ ل پێش رێزێ رادوەستیت و دورست دکەت. ٧- سولتان. ٨- یێ خەلکی ژ خرابیێ ددتە پاش.

**وازف(توزف):** ژێک نێزیکبوون(خەلک).

**وازن:** ١- پاداشتکر. ٢- کەتە هەمبەر. ٣- کرە هەڤسەنگ. ٤- کێشا وێ درستکر (یا شعرێ).

**الوازن:** یێ دیتن رەسەن.

**واسى:** سەرەخۆشی لێکر.

**الواسط:** ١- دەرگەهـ. ٢- پێشیا کونستێنگێ یان یا مەقلا ژ ئاخێ چێکری.

**الواسطة:** ١- دەستک؛ هەڤگین. ٢- پێشیا کونستێنگێ یان یا مەقلا ژ ئاخێ چێکری. ٣- مراریا ل نیڤا رستکێ. ٤- یێ ژ باشا.

**واسطة الفيض:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبیتە مرۆڤێ تەکووزە(الإنسان الكامل) یێ کو دبیتە هەڤگین د ناڤبەرا خودێ حەق و چێکریا دا.

**واسطة المدد:** هەر (واسطة القيض)ە.

**الواسع:** ١- یێ فرەهـ. ٢- یێ گەلەگ مەرد و دانا وی هەمیا ڤەدگریت. ٣- یێ هەر تشەکی دزانت. ٤- ژ ناڤیت خودێ یە.

**واسق:** هندی وی لێهات.

**الواسق:** ١- یێ بارکری. ٢- یا ئاڤس.

**الواسل(الواسلة):** ١- یێ لاڤا ژ خودێ دکەت. ٢- یێ کارەک کری دا خۆ پێ نێزیکی خودێ بکەت.

**واسم:** ١- ڤیا ژ وی جوانتر بت. ٢- قەستا گیایێ دەمێ گیای کر. ٣- داخوازا نیشانێ کر. ٤- پیشبینی تێدا کر. ٥- ل دویڤ دەوسا وی چوو.

**الواشج:** یێ ب ناڤئێککەڤتی؛ یێ تێکڕاتێکڕا.

**واشجة:** مرۆڤاینی.

**واشرة:** ئەو ژنکە یا ددانێت خۆ تیژ دکەت.

**الواشق:** ١- تشتێ ب لەز دچت وەکی عەمری. ٢- شێرێ کێم. ٣- بالندەیێ باشۆک.

**واسک:** لەز د چوونا خۆ دا کر.

**الواشل:** ١- چیایێ دلۆپ پێدا دهێن. ٢- یێ لاواز.

**واشمة:** ئەو ژنکە یا دەقا ل بێت دی دکەت.

**الواشي:** ١- پێزەڤەنگ؛ فەساد. ٢- تەڤنکەر. ٣- یێ گەلەک عەیال تەرش هەین.

**واصى:** گەهاندە ئێک.

**واصب:** پێگیری کر.

**الواصب:** یێ بەردەوام.

**الواصبة:** ١- یا بەردەوام. ٢- بیابانا بێ دویماهی.

**واصف:** فرۆتە بکرێ ل دویڤ سالۆخەتدانێ بێ کو ببینت(تشت).

**الواصف:** سالوخەتکەر.

**واصل:** ١- بەردەوامی پێ دا. ٢- پەیوەندی دگەل بەردەوامکر.

**الواصل:** ١- یێ گەهەشتی. ٢- ل نک سۆفیان ئەو مریدە یێ بەردەوام قووناغا بەر ب دیوانا خودێ دبڕت.

**الواصلية:** موعەزلەنە؛ دویڤچوویێت (واصل بن عطاب)ی نە، دبێژن: خودێ یێ بێ سالوخەتە، و قدرەت یا د دەستێ بەنیا دا.

**واصى:** گەهاندنە ئێک.

**واضأ:** ژێ زێدەکر ب پاقژیێ و جوانیێ.

**واضب:** بەردەوامبوو.

**الواضح:** ١- یێ ب ناڤودەنگ. ٢- تشتێ ڕەنگێ وی سپی. ٣- یێ دیار و ئاشکرا و ڕوهن.

**واضح الحسب:** یێ ڕڤشت پاک و ئاشکرا.

**الواضحة:** ١- ددانێت ل دەمێ کەنی دیار دبن. ٢- یا ب ناڤودەنگ.

**واضخ:** ١- بەریکانا ئاڤ برنێ یان ب ڕێڤەچوونێ یان یا غاردانێ د گەل کر.

**واضع:** ١- شەرتانێ دگەل کر. ٢- دگەل ڕێکەڤت. ٣- هێلا. ٤- بەتالکر.

**الواضع:** ١- ژنکا چارکا خۆ ڕاکری. ٢- دانەر. ٣- بێرووەمەتکەر. ٣- بچویکبوویی.

**واطئ:** نزم.

**واطأ:** ١- هەڤدەمکر. ٢- گونجاند و تێ کارکر.

**الوطأة(بالفتح والسكون):** ١- ئێک پێلێنان. ٢- جهێ پێلێنانێ. ٣- گڤاشتن. ٤- برنا دژوار.

**الوطأة(بفتحتين):** ڕیڤینگ.

**الواطئة:** ١- خورما کەڤتی بنێ دارقەسپێ. ٢- ڕیڤینگ.

**الواطي:** ١- یێ نزم. ٢- یێ کەسایەتیا وی نزم.

**الوطاء:** ڕاژێرک.

**الوطاءة(الوطوءة):** نەرمی و حەلیمی.

**واظب:** ١- بەردەوامی دا. ٢- پێگیری بەردەوامکر.

**واظف:** دگەل گونجا و د گەل ما.
**واعد:** ١- ژڤان دانه ئێک. ٢- ژڤان دایێ.
**الواعر:** ١- یێ سەخت و ب زەحمەت. ٢- یێ ڕەق و توند.
**واعس:** ١- بەریکانەکر د چوونێ دا. ٢- ستوییێت خۆ درێژکرنە چوونێ و پێنگاڤێت خۆ دویر هاڤێتن (حێشترا).
**الواعظ:** یێ شیرەتا دکەت و بەرێ مرۆڤی ددەت لخۆزڤرینێ و کرنا باشیێ.
**الواعي:** ١- سەمیان. ٢- پاریزکار. ٣- یێ تیگەهشتی.
**الواعیة:** ١- مێیا الواعي) یە. ٢- دەنگ. ٣- قیژی.
**واغد:** وەکی وی کر؛ کریارەکا وەکی کریارا وی کر.
**الواغر:** یێ دلێ وی تژی ئاگرێ کینێ بووی.
**الواغل:** یێ چوویە سەر زادی بێی کو بهێتە داخوازکرن.
**وافی:** ١- بۆ ئەداکر. ٢- هاتە نک. ٣- ژ نشکەکێ ڤە خۆ نیشادا. ٤- دەمدەست گەهەشتێ.
**الوافد:** ١- جهێ ژ بەر پاری بلند دبت ژ روی ل دەمێ خوارنێ. ٢- ئاژەلێ ل بەراهیا کەری.
**الوافر:** کێشەکا شعری یە ل سەر دوجارکیا (مفاعلتن مفاعلتن فعولن) ب رێڤەدچیت.
**الوافرة:** ١- دوینگێ بەرانی دەما مەزن دبت. ٢- یێ مشەکری (تشت). ٣- مێیا (الوافر)ە.
**وافز:** لەزکر.
**وافق:** ١- دکەل پێکهات. ٢- گونجا. ٤- دیت. ٤- قەبیلکر.
**الوافه:** مجێورێ دێرێ.
**الوافي:** ١- دەرهەمەک و چار دانق. ٢- مالکا شعرێ یا ژ هەمی لایا ڤە دورست و تمام.
**الواق(الواقي):** ١- قەل. ٢- پارێزکار.
**واقع:** ١- شەرێ وی کر. ٢- دەستپێکر.
**الواقع:** ١- دۆرهێل. ٢- ل نک (المتکلمین)ا دبیتە (اللوح المحفوظ). ٣- ل نک (الحکماء)ا دبیتە مێژکێ کاریگەر(العقل الفعال). ٤- بالندەیێ دادایی.
**الواقعة:** ١- لێکدانا شەری. ٢- ژ ناڤێت قیامەتێ یە. ٣- مسیبەت. ٤- دلێر. ٥- ل نک سۆفیا دبیتە تشتێ ژ (عالم الغیب) دهێتە دلی.
**الواقعي:** دویڤچوویێ ڕێبازا ئەدەبی یا (الواقعیة).
**الواقعیة:** ڕێبازەکا ئەدەبی یە تشتی ب کرێتیا وی و بێ گوهۆڕین وێنە دکەت یان ب کارێت درامایی نیشا ددەت.
**الواقف:** ١- یێ ڕاوەستیای. ٢- یێ چاڤێ خۆ ددەتە ملکەکی و بەرهەمێ وی د ڕێکا خودێ دا دمەزیخت.
**واقف:** هەر ئێک دگەل یێ دی ڕاوەستیا.
**الواقي:** یێ تشتی دپارێزت.
**واقیة الصدمات:** دەعامیێ توربێلێ.
**الواك:** یێ دهێتە جویتن.
**واکا:** درێژکرن ل دەمێ دوعایێ (دەست).
**واکی:** دەستێت خۆ هلپەساری خودێ کرن ژ بۆ دوعایێ.
**واکب:** ١- بەردەوامی ل سەر کر. ٢- دگەل سیابوو و چوو.
**الواکبة:** لنگەک ژ لنگێت دەواری.
**الواکز:** یێ کولم دانای.
**واکف:** ١- کورتانکر(دەوار). ٢- بەرهنگاریکر.
**الواکف:** بارانا دباریت.

**واکـل:** ١- هنـدا هنـد کرنـە وەکیلێـت خـۆ. ٢- خراب بڕێڤەچوو.
**الواكل:** ئەو دەوارە یێ ل دەمێ چوونێ پێدڤی چویڤی دبت.
**الواكن:** ١- یێ کورک. ٢- یێ دادایی.
**والي:** ١- ب کارەکی ڕاسپارد. ٢- هەڤالینی و پشتەڤانیا وی کر. ٣- چرتکر و ژێک ڤەدەرکرن(پەز). ٤- ل دویڤچوو.
**الوالب:** یێ دچیتە د تشتی ڕا.
**الوالبـة:** ١- گیـایێ هـویر. ٢- بچویـک و مچویک. ٣- بەرخ و کار و گۆلک.
**الوالجة:** ١- دەهبە و مار. ٢- ئێشـەکە هناڤا دگریت.
**والد:** باب.
**والدة:** دایک.
**الوالدين:** دەیباب.
**والس:** خاپاند و دەڤحولیاتی بۆ کر.
**الوالع:** درەوکەر.
**الوالف:** ١- هەڤالینیا وی کر. ٢- خۆ ل بەر شرینکر و پەیوەندی پێکر.
**الوالي:** ١- مەزنێ جهی. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە ئەو کەسێ هاتیە دانان ژ بۆ سەمیانەتیێ.
**الوامئة:** مسیبەت؛ بەلا.
**الوامض:** یێ برسقی.
**وامق:** حەژێکرن د گەل کر.
**الوامق:** ئەڤیندار.
**وان:** ١- سست. ٢- وەستیایی. ٣- لاوازی.
**وانح:** خۆ د گەل گونجاند.
**الواني:** ١- یێ لەغەر. ٢- یێ بێهێز. ٣- یێ خاڤ و سست.
**واه:** ١- پەیڤەکـە ژ حێبـەتیا دهێتـە گـۆتن. ٢- دیسا ژ بۆ خەریبییێ دهێت.
**واها:** پەیڤەکە ژ حێبەتیا دهێتە گۆتن.
**واهس:** شەڕی وی کر و هەڤڕکی د گەل کر.
**واهق:** ستۆیێ خۆ ل دەمێ چوونێ درێژکر.
**واهب:** ڤیا ژێ دەرباز ببت د دان و بەخشینێ دا.
**الواهب:** بەخشەندە؛ ژناڤێت پاکێت خودێ یە.
**الواهف:** مجێورێ دێرێ.
**الوهمة:** هێزا خەلەتبوونێ.
**الـواهن:** ١- یـێ لاواز. ٢- دەمـارا ژ سـتۆی دچیتە ملی.
**الواهنـة:** ١- لاوازی. ٢- زەنـدک. ٣- گـەها ستوی. ٤- بایێ دکەڤیتە گەهێت مرۆڤی ل دەمێ پیریێ.
**الواهي:** یێ لاوازی.
**الواو:** زاراڤەکێ سۆفی یە دبیتە لایێ ڕەهایی ژ هەر تشتەکی.
**وب:** خۆ بۆ شەڕی ئامادەکر.
**وبأ:** داگرت.
**الوباء(الوبأ):** ئێشا تەڤایی.
**الوباص:** ١- تلپێ هەیڤێ. ٢- عەورێ گرگڕی. ٣- تشتی ڕەنگێ وی دتەیست.
**الوباط:** لاوازی.
**الوبال:** ١- دژواری. ٢- مەزنی. ٣- دویماهیا خراب.
**وبت:** ما و خۆجهبوو.
**وبخ:** گازندە ژێ کرن و ژ پاشڤەبر.
**الوبخة:** ١- گازنـدا دلسـۆژ. ٢- گازنـدەکرن و ژپاشڤەبرن.
**وبد:** ڕەوشا وی خرابوو.
**الوبد(بفتحتين):** ١- خرابیا ڕەوشێ و دژواریا ژیارێ. ٢- سالۆخەتێ دورست. ٣- گەرم. ٤- قوسیری. ٥- چالکا ل چیای.
**الوبـد(بالفتح والكسـر):** ١- یـێ برسـی. ٢- چاڤهاڤێژێ چاڤ دژوار.
**الوبد(بالفتح والسكون):** چالکا ل چیای.
**وبر:** ما و خۆجهبوو.
**وبر(بالفتح والكسر):** گەلەک ب مویبوو.

**وبر(بالفتح والتشديد):** ١- مووی لێهاتن. ٢- ل سەر مویێ پێت خۆ بریڤەچوو. ٣- ل عەردێ ڕەڤ برێڤەچوو. ٤- ما و خۆجهبوو. ٥- کویڤیبوو. ٦- د مالا خۆ ڤە دەمەکی ما و نەدەرکەڤت. ٧- تۆڤکر(دارقەسپ).

**الوبر(بفتحتين):** مویێ حێشترێ و کڤریشکا.

**الوبر(بالفتح والسكون):** ١- جانەوەرەکە هندی کتکێ یە ژ نفشێ خودان لمبیسا، ل ئەفریقیا و هندەک جهێت کیشوەرێ ئاسیا دژیت، تنێ گیای دخۆت، گوشتێ وی یێ خۆشە و کەڤلێ وی یێ ب بهایە. ٢- ڕۆژەکە ژ حەفت ڕۆژێت دبێژنێ: (برد العجوز) یێت دکەڤنە دویماهیا زڤستانێ.

**وبش:** گورێبوو.

**وبش(بالفتح والتشديد):** ١- برسقێنا وی دیاربوو. ٢- گورێبوو. ٣- تێرا ئاسێبوو. ٤- کۆمێت زەلاما ژ چەندین ئێلا خرڤەکرن.

**الوبش:** ١- پنێت گورێاتیێ نە ل لەشێ حێشترا دیار دبن. ٢- کتا (الأوباش)ە یێت کۆ دبنە پویچ و خراب. ٣- یێ بێخێر. ٤- کێمێت بەلاڤ.

**وبص:** ١- ڤەکر. ٢- قەدرێ وی کێمبوو. ٣- چاڤێت وی بشکورین.

**وبص(بالفتح والتشديد):** دایێ.

**وبط:** ١- فەکر. ٢- قەدرێ وی کێمکر. ٣- نەهێلا بگەهیت.

**وبط(بالفتح والضم):** لاوازبوو.

**وبق:** مر.

**وبل:** ١- ل دویڤێک دانایێ. ٢- ب توندی کرەدەر. ٣- بارانەکا دژوار باری. ٤- گرانبوو. ٢- ل دویڤێک هات. ٥- ڕاتەقاند.

**وبل(بالكسر):** ١- دژواربوو. ٢- مەزنبوو.

**الوبل(بالفتح والسكون):** بارانا دژوار.

**الوبلة(الأبلة):** ١- مەزنی. ٢- گرانی. ٣- دژواری. ٤- حەمەربوون.

**الوبنة:** ١- زیان. ٢- برس.

**وبه:** تێگەهەشت.

**وبئ:** داگرتی.

**الوبئ(الوبيء؛ الموبوء):** یێ مشە ئێش و دەرد لێ هەبن.

**الوبيصة:** ١- ئاگر. ٢- برسقێن.

**الوبيل:** ١- گران. ٢- دژوار. ٣- مەزن. ٤- ب دویماهیەکا خراب. ٥- شوینک. ٦- دارێ چەنگێ. ٧- چویڤێ نەرم. ٨- دارێ یێ چەنگێ دقوتن. ٩- یێ ب ترس. ١٠- چویڤ.

**الوبيلة:** ١- چویڤێ ستویر. ٢- ملەکێ دارا.

**وتأ:** پێگرانبوو.

**الوتبي:** یێ گەلەک خۆ دهاڤێژت.

**وتح:** کێمکر.

**وتح(بالفتح والضم):** یێ کێمبوو.

**الوتح:** ١- کێمێ چونە. ٢- یێ بێخێر.

**وتخ:** دانایێ.

**الوتخة:** ١- هەڕی. ٢- تشت.

**وتد:** ١- موکمکر. ٢- خۆجهبوو. ٣- داڤێت وی دەکەڤتن و خۆ گرت.

**وتد(بالفتح والتشديد):** ١- خۆجهکر. ٢- موکمکر. ٣- ما و خۆجهبوو. ٤- گیایێ وی موکمبوو.

**الوتد:** ١- سنگ. ٢- تمبلکێ گوهی یێ ڕەق.

**الوتد المجموع:** د کیشا شعرێ دایە و دبیتە دو پیتێت (متحرك) دگەل ئیکا پیتا (ساكن)، وەکی (لكم) و (بها).

**الوتد المفروق:** د :یشا شعرێ دایە و دبیت دو پیتێت (متحرك) یێت ئێک پیتا (ساکن) د ناڤبەرا وان دا، وەکی (قال) و (کیف).

**وتر:** ١- ژێ کێمکر. ٢- ژەها وی پیڤە گرێدا. ٣- زۆرداری لێکر. ٤- ترساند. ٥- ژێ کێمکر. ٦- کرە کت.

**وتر(بالتشديد):** ژەها وی توندکر.

**وتر(بالكسر):** کت.

**الوتر(بالفتح):** ١- ژەه. ٢- تێلە. ٣- تۆلڤەکرن. ٤- زۆرداریا د تۆلڤەکرنێ دا.
**الـوتر:** ١- تۆلڤـەکرن.. ٢- گـەڕیانا ل دویـڤ تۆلڤەکرنێ.
**الوترة:** ١- کنفێت ڕەشمالێ یێت دئێخنە سنگا. ٢- چـەرمێ د ناڤبـەر تلێـت مرۆڤـی دا. ٣- کرکرکا گوهی. ٤- کرکرکا د ناڤبەرا هەردو کتێـت دفنـێ دا. ٥- ڕهـا بـن ئـەزمانی. ٦- گرۆڤرکـا هـەر تشـتەکی. ٧- خوڕسـتێ تشتی.
**الوتش:** ١- کێمێ هەر تشتەکی. ٢- بێخێرێت خەلکی.
**وتـغ:** ١- گونـەهگر. ٢- ل دنیـایێ و ئـاخرەتێ تێچـوو. ٣- ئێشـا. ٤- د ئـاخڤتنێ دا یـێ کـێم عـەقلبوو. ٥- ڕەوشـتێ وی خرابـوو. ٦- ئاخڤتنـا وی کرێتبـوو و یـێ گەلـەک نەزانبوو. ٧- خەلەتیکر.
**وتـن:** ١- بـەردەوامبوو و قەتعەنـەبوو (ئـاڤ). ٢- خۆجهبوو و ما. ٣- ڕها دلـێ وی هاتـە هنگاڤتن.
**وتن(بالضم والکسر):** گازندە ژ ڕها دلـێ خۆ کر.
**الوتنة:** ١- د گـەل مـان و نەبـەردانا خۆشتڤی. ٢- ترس.
**الوتیح:** ١- یێ کێم و چونە. ٢- یێ بێخێر.
**الوتیرة:** ١- ڕێباز. ٢- کنفێت ڕەشمالێ یێت دئێخنە سنگا. ٣- چەرمێ د ناڤبەر تلێت مرۆڤی دا. ٤- کرکرکا گوهی. ٥- کرکرکـا د ناڤبـەرا هـەردو کتێـت دفنـێ دا. ٦ - تۆلڤەکرن. ٧- دەمـێ کـاری. ٨- نـاڤێ ژمـارە دەهـێ یـە. ٩- خـۆ گیرۆکـرن. ١٠- بێنفرەهکـرن. ١١- زینـدان. ١٢- گـۆڕ. ١٣- پنیـا گرۆڤـرا ل ئـەنیا هەسـپی. ١٤- چارچووڤـەیێ لێڤـێ. ١٥- عـەردێ سپی. ١٦- کولیلکا دارێ.
**الوتیغة:** خەلەتی یا د هێچەتێ دا.
**الوتین:** ١- ڕها خوینێ یـا ل ستۆی. ٢- ڕها دلی یا سەرەکی.

**وثـا:** ١- مرانـد. ٢- ئێـک ژ هـەردو پیتێـت (متحرک) ژ (وتـد)ێ (فـاعلاتن) ڕاکـر دا ببیتە (مفعولن).
**وثئ:** خەلیا (دەست).
**الوثئ:** دەست شکەستی.
**الوثء:** خەلیان.
**الوثی:** ژان و ئێش.
**الوثاب(بالکسر):** ١- تەختێ نڤستنێ؛ نڤین. ٢- جهێ ڕوینشتنێ.
**الوثاب(بـالفتح والتشـدید):** ١- یـێ گەلـەک لۆتـا دهـاڤێژت. ٢- ئێشـەکە زەڤلـەکێت پشتێ پێ دوەرمن. ٣- یێ بەزەک.
**الوثار:** نڤینا ب کارئینای و نەرم و خۆشبووی.
**الوثارة:** چوونا سەر نڤینێ.
**الوثاق:** بەند.
**الوثاقیـة:** تراشـۆکەکە ژ نفشـێ دارزەیتوینـا، بـەلگێت وێ ل هەمبـەر ئێکن، کولیلکێـت وێ د سپی و ئویشیکانی نە.
**وثب:** ١- خۆ هلاڤێت. ٢- ڕابوو و ڕاوستیا. ٣- لۆتـەک ل خـۆ دا. ٤- خـۆ ب جۆتکـانی هاڤێت.
**وثب(بالتشـدید):** ١- دانـا سـەر بـالیفکێ. ٢- بـۆ هاڤێـت دا ڕوینیتـە سـەر(بالیفک). ٣- ڕاژێرکەک بۆ ڕائێخست.
**الوثبی:** یێ لۆت دژوار.
**وثـج:** ١- تیربـوو. ٢- گوشـتێ وی زێـدەبوو. ٣- گیا و چەر لـێ مشـەبوون.
**الوثخة:** تەڕاتیەکا ئاڤێ.
**وثـر:** ١- چـوو سـەر و نـەرمکر(نڤین). ٢- قەلـەوبوو. ٣- زێدەبوو.
**الوثر:** ١- پرتەکا کەڤلی یە دڤێلا زێ چێدکەن. ٢- بەرکۆشـک. ٣- یـێ چووینـە سـەر و نەرمکری.
**وثغ:** شکاند(سەر).

**الوثغة:** پیچەک.
**وثف:** پێکوچک دانانە بن(قازان).
**وثق:** ١- باوەری پێ ئینا. ٢- موکمکر. ٣- گرێدا.
**وثق(بالتشدید):** ١- ژێ گوٚت کو جهێ باوەریێ یە. ٢- موکمکر.
**وثق بە:** باوەری پێ ئینا.
**الوثقی:** یا موکم و نەئێتە پچیان.
**وثل:** ١- خرڤەکر. ٢- شیاند.
**الوثل:** ١- کنفێ ژ لیفی. ٢- قرێژا کەڤلی.
**وثم:** ١- شکاند و قوتا. ٢- ب دژواری باری. ٣- ب سمێت خوٚ ل سەرگەڕیا(عەرد). ٤- خوینەلوٚکر.
**وثم(بالفتح والکسر):** گیایێ وی کێمبوو.
**الوثم:** کێمی.
**وثن:** خوٚجهبوو و ل سەر سوٚزا خوٚ ما.
**الوثن:** بوت؛ پەیکەر؛ سەنەم.
**الوثني:** بوتپەرێس؛ سەنەمپەرێس.
**الوثنیة:**بوتپەرێی پەرستنا بوتا.
**الوثوب:** خوٚهەلاڤێتن.
**وثوخ:** لاواز.
**الوثوق:** باوەریپێکرن.
**وثي:** خەلیا.
**الوثیج:** ١- یێ ب گیا و چەرە. ٢- یێ ب گوشت. ٣- یێ تیر. ٤- یێ قوتای(پەڕوٚک).
**الوثیجة:** ١- عەردێ گەلەک ب دار. ٢- عەردێ داریێت وی د ناڤ ئێک را. ٣- یا مشە چەروان.
**الوثیخة:** ١- شیرێ تیر. ٢- هەستیێ زراڤ. ٣- گیایێ تەڕ و تیکهەل. ٤- عەردێ ب تەقن.
**الوثیر:** ١- نەرم و خوٚش. ٢- یێ چووینە سەر نەرمکری.

**الوثیرة:** ١- مێیا (الوثیر)ە. ٢- یا ب گوشت.
**الوثیغة:** ١- تێکئالیانا گەلەک جوٚرێت گیای ل بهارێ. ٢- پیچەک (ژ بارانێ).
**وثیق:** موکم و خوٚجه.
**الوثیقة:** ١- دەکومینت؛ بەلگە؛ بەلگەنامە. ٢- یێ گەلەک گیا لێ(عەرد). ٣- موکمی و بێ قوسیریا د کاری دا دهێتە کرن.
**الوثیل:** ١- لیف. ٢- کنفێ لیفی یان داڤێت گیایێ تەلیسا ژێ چێدکەن.
**الوثیمة:** ١- بەر. ٢- بەرێ ستەی. ٣- کوٚما گیای.
**وج:** لەزکر.
**الوج:** ١- دارێ هەڤجارێ. ٢- لەز. ٣- کەردیکل. بالندەیێ کەدیک. ٤- جوٚرەکێ دەرمانی یە ژ ڕهێت گیایەکی دهێتە چێکرن وەکی قەرەمی یە. ٥- سوٚسنا زەر.
**وجأ:** تێوەراند.
**وجأ(بالفتح والتشدید):** دیت ئاڤا وێ یا قەتعەبووی(بیر).
**الوجء(الوجأ؛ الوجاء):** یێ خێر تێدا نە وەکی بیرا بێ ئاڤ.
**وجي:** دیت یێ بیخێرە.
**وجي(بالفتح والتشدید):** پێخاسبوو.
**الوجی:** ١- دژواریا ژینێ. ٢- بارێت بچویک.
**الوجاء:** ١- گەمراندنا ڕهێت گونا کو ڕەنگەکێ خەساندنێ یە. ٢- تێوەراندن.
**الوجاب:** ١- ترسنوٚک. ٢- یێ خوٚ گەلەک دقوتت(دل).
**الوجابة:** یێ ترسنوٚک.
**الوجاح(بالفتح):** ١- تشتێ مروٚڤ خوٚ پێ ستار دکەت. ٢- کەفرێ حولی. ٣- ترس یان شەرم.
**الوجاح(بالضم أو الکسر):** تشتێ مروٚڤ خوٚ پێ ستار دکەت.

**الوجاد:** یێ گەلەک دتنگژت.
**الوجــار:** ١- کونــا بزنمشــکی. ٢- چالکــا هلمشت ل پاشخۆ دهێلت.
**الوجاق(الأوجق):** ١- جهێ ئاگری. ٢- کوچکێ ئـاگری. ٣- لەشـکەر سیسـتەمدار(ترکی) یە.
**الوجاهة:** ١- قەدر و رێز. ٢- مەزناهی.
**وجب:** ١- بوو ئـەرک. ٢- تێکچـوو. ٣- کـەت و مر. ٤- ئاڤابوو(رۆژ). ٥- کەڤتـە خوارێ سەر عـەردی(دیوار). ٦- ئاڤابوو. ٧- چوو خوارێ(چــاڤ). ٨- ل ســـەر فــەربوو. ٩- ئێـک دانـێ زادی خـوار. ١٠- ڤەلـەرزی و خۆ قوتا.
**وجب(بـالفتح والتشـديد):** ١- تنـێ دانـەکێ زادی خـوار. ٢- کـرە ئـەرک. ٣- دۆتنا وێ کـرە ئێـک دان. ٤- وەسـتیا. ٥- خـۆ بـەردا عەردی.
**وجب(بالفتح والضم):** یێ ترسنۆک بوو.
**الوجب(بـالفتح والسـكون):** ١- یـێ ترسـنۆک. ٢- کونکێ مەزنێ ئاڤێ.
**الوجـب(بفتحتين):** خـەلاتێ بەریکانـە ل سـەر دهێتە کرن.
**وجبة:** ١- کەتنا ب دەنگ. ٢- دانـێ خوارنێ. ٣- تەغما ددانێت دەستکرد.
**وجح:** دیار و کفش بوو.
**الوجح:** تۆز.
**وجد:** ١- دیت. ٢- لێ تنگژی. ٣- خەریبوو. ٤- پـێ بـێ مەنـەت بـوو. ٥- ب ئـەڤینـەکا دژوار حـەژێ کـر. ٦- پەیـداکر. ٧- چێکـر. ٨- زانی.
**وجد(بالفتح والكسر):** دیت؛ ب سەرهلبوو.
**الوجــد:** ١- بــێمنەتی. ٢- کەیفخۆشـــی. ٣- پێچێبــوون. ٤- خــەریبی. ٥- ل نــک سـۆفیا دبیتـە نهێنیـا خـودێ حـەق لنـک باوەردارێت بێگومـان کـو دبیتـە تـرس یـان کەیف یان کەشف.
**الوجدان:** وژدان؛ مروەت.
**وجذ(بالفتح والكسر):** گەلەک ب تەحا.
**الوجذ:** تەحا ئاڤێ.
**وجـر:** ١- دەرمــان کــرە دەڤــی. ٢- قەســەکا نەخۆش گۆتێ.
**وجر(بالكسر):** ترسیا.
**الوجر(بالفتح):** کونا وەکی شکەفتی.
**الـوجرة:** چـالا بـۆ نێچیرکرنـا حـەیوانی دهێتـە چێکرن.
**الوجز(بسـكون الجـيم):** ١- سـڤکێ کـورت. ٢- یێ زوی تشتی ددەت. ٣- یێ شڤک.
**وجز:** کورتکر.
**وجز(بـالفتح والضـم):** ١- هاتـە کـورتکرن. ٢- یێ کورت ئاخڤتنبوو.
**وجس:** ١- نەپەنیبوو. ٢- گول دەنگەکی بـوو. ٣- ترسـا ژ تشـتێ گولێبـووی یـان کەتیـە دلی.
**الوجس(بـالفتح والسـكون):** ١- دەنگێ نەپەنی. ٢- ترسا دلی.
**الوجس:** هەست.
**وجع:** ١- نەساخبوو و ئێشا. ٢- ئێشا.
**الوجع(بفتحتين):** ١- نەساخی. ٢- ئێشان.
**الوجع(بالفتح والكسر):** یێ دئێشت.
**الوجعاء:** قوون.
**وجــف:** ١- لڤلڤــی. ٢- خۆقوتــا (دلـــی). ٣- سڤک زڤڕی ڤە.
**الوحفة:** دەنگ.
**وجل:** ١- ترسیا. ٢- هەست ب ترسێ کر.
**وجل(بالفتح والضم):** پیربوو.
**الوجل(بفتحتين):** ١- ترس. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە مەقامێ ئێکێ یێ ترسێ.
**الوجل(بالفتح والكسر):** یێ ترسیای.
**وجم:** ١- کولمەک لێدا. ٢- ژ کەربا دا نەشیا ب ئاخڤیــت. ٣- ژ خـــەما دا ئێنیـــا وی تێکچوو و سەرێ خۆ چەماند. ٤- نە ژ دل دەسـت ژێ بـەردان. ٥- نـەڤیا. ٦- خـەمێ گرت.
**وجم:** گەلەک ب خەم کەت.

**الوجم(بالفتح والسكون):** ١- کەلۆتکا وەک نیشان بۆ رێڤینکا دهێتە دانان. ٢- کەلەکا بەرا. ٣- یێ خراب(مرۆڤ). ٤- یێ مەزن(خانی).

**الوجم(بفتحتين):** ١- یێ دومۆر. ٢- یێ لەش سڤک. ٣- یێ مەزن. ٤- یێ قەلس.

**الوجمة(بالفتح والسكون):** دانەکێ خوارنێ.

**الوجمة(بفتحتين):** جڤین؛ خەبەر.

**وجن:** ١- هاڤێت. ٢- تێقوتا. ٣- ڤەقوتا. ٤- لێدا.

**وجن(بالفتح والتشديد):** ڤەقوتا دا نەرم ببیت.

**الوجن(الواجن):** عەردی ب بەر ە رەق.

**وجناء:** ژنا هنارۆکێت رویێ وێ د مەزن.

**الوجنة(الأجنة):** هنارۆکا رِوی.

**وجه:** بوو خودان رێز و قەدر.

**وجه(بالفتح والتشديد):** ١- کرە خودان قەدر و رێز. ٢- بەرێ وی دا جهەکی. ٣- سەمتا وی دورستکر. ٤- لێچوون و شوینەکا دیار لێکرن(رێ). ٥- رەنی و جهێ خۆ لێچێکر (بارانی ل عەردی). ٦- گۆتێ: پشتا مرنا من تۆ یێ ئازادی. ٧- بەرێ وی دا قبلێ(خانی). ٨- چوو نک. ٩- هنارت. ١٠- دگەل خۆ بر(بای ئاخ).

**الوجه:** ١- سەروچاڤ. ٢- مەبەست و نیاز. ٣- رامان. ٤- جهێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتێ و قەست دکەتێ. ٥- قەدر و رێز. ٦- روومەت. ٧- رەنگ وجۆر. ٨- رێ. ٩- دورستی. ١٠- رِوی. ١١- ئنیەتا ئاشکرا. ١٢- پشک.

**وجه الحق:** ١- ئەو تشتە یێ تشت پێ دبیتە حەق. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە جوهەرێ حەقی یێ د هەمی تشتا دا هەر هەی.

**الوجهة:** ١- سەمت. ٢- رەخ؛ لا. ٣- جهێ مروڤ بەرێ خۆ ددەتێ و پێڤەدچیت.

**الوجوب:** ١- جلک. ٢- فەربا تشتی.

**الوجود:** ١- هەبوون. ٢- خەریبی. ٣- ل نک سۆفیا دبیتە نەمانا سالوخەتێت بەنیا ل نک مریدی ب خەریبیا ل نک چێدبت.

**الوجدانيات:** ئەو تشتن یێت ب هەستێت باطنی هەست پێ دهێتە کرن یان مرۆڤ دگەهیتێ.

**الوجودية:** رێبازەکا فەلسەفی یە دبێژیت پەیدابوونا مرۆڤی یا ئێکێ پەیدابوونەکا رەنگ میتافیزیکی بوو خۆ چێکر و خۆ ب کار و کریارێت خۆ هلبژارت.

**الوجور:** دەرمانێ دکەنە دەڤی.

**وجول(بضمتين):** کۆما پیرەمێرا.

**وجوه:** مەزن و ماقویل.

**الوجي:** ١- یێ پێت وی ژ بەر رێڤەچوونێ تەنک و نازک بووین. ٢- یێ بێخێر.

**الوجيئة:** ١- خورمە یان کولیێ باش دهێتە هێران و زەیتکرن. ٢- چێل.

**الوجيب:** دەنگ.

**الوجيبة:** ١- کارمەندی. ٢- ئەوە کو کەسەک تشتەکی بفرۆشیت کەسەکێ دی و ئەو کەس وی تشتی پیچپیچە ببەت هەتا خلاس دبیت.

**الوجيد:** عەردێ راست.

**الوجيز:** ١- سڤکێ کورت. ٢- یا کورت و سڤک دگەهیتە مەژیێ مروڤی(ئاخڤتن).

**الوجيع:** ب ئێش.

**وجيف:** ١- چوونا دەوار و حێشترا. ٢- کەڤتنا ژ ترسادا.

**الوجيل:** چالا ئاڤێ لێ عومبار دکەن.

**الوجيم:** یا ب گەرم و گور(رۆژ).

**الوجين:** ١- رەخێ نهالێ. ٢- گرێ نزم و درێژ و رەق.
**وجيه:** ١- مەزنێ کۆمێ. ٢- سالار. ٣- خودان پلە و رێز.
**الوجيهة:** مۆرکەکا دو رووی یە ژ بۆ حەسەدێ دکەن ستۆیێ خۆ.
**الوحا:** لەز.
**وحى:** ١- ئاماژە پێدا. ٢- قاسدەک بۆ هنارت. ٣- ب نەپەنی ڤە بۆ ئاخڤت. ٤- کرە دلی یان هزرێ. ٥- ب لەز سەرژێکر. ٦- لەزکر.
**وحى(بالتشديد):** ١- ب لەز سەرژێکر. ٢- لەز لێ کر.
**الوحى:** ١- دەنگ. ٢- ئاگر. ٣- لەز. ٤- شاه. ٥- سالارێ مەرد.
**الوحاة:** دەنگ.
**الوحام:** مەهبرن.
**وحج:** قەستکر.
**الوحج:** جهێ مرۆڤ ژ بەر ئەگەرەکێ قەست دکەتێ.
**وحد:** خۆ ڤەدەرکر خو کرە ئێک.
**وحد(بالفتح والتشديد):** ١- کرە ئێک. ٢- باوەری تنێ ب وی ئینا. ٣- گۆتی: (لا إله إلا الله). ٤- کرە ئێک د عبادەتی دا.
**وحد(ببالفتح والضم):** خۆ ڤەدەر کر و هێلا ئێکێ ب تنێ.
**الوحد:** ١- یێ ڤەدەر و ب تنێ. ٢- یێ خۆ ڤەدەرکری و هیلایە ب تنێ.
**الوحداني:** یێ خۆ ڤەدەر کری.
**الوحدانية:** ١- کاودانێ وی یە یێ خۆ ڤەدەرکری. ٢- ل نک سۆفیا دبیتە چێبوونا ئێکانەتیێ ب کەسێ ئیکانە ب وی رەنگی کو نەیا بەرعاقل بیت ئەو ئێکانەتی بۆ کەسەکی ژبلی وی کەسێ ئێکانە هەبیت.
**الوحدة:** ١- ڤەدەری. ٢- ئێکگرتن. ٣- ئێکانەتی.

**وحر:** ١- ئەو تشت خوار یێ جانەوەرێ (الوحرة) چوویە سەر. ٢- جانەوەرێ (الوحرة) چوو سەر.
**وحر(بالفتح والكسر):** ١- کەربا وی دژواربوو و کینا وی زۆربوو.
**الوحر(بالفتح والكسر):** یێ کەرب دژوار و کین زۆر.
**الوحر(بالفتح والسكون):** ١- کین. ٢- کەرب. ٣- وەسواسێت د دلی دا.
**الوحرة (بفتحتين):** جانەوەرەکێ وەکی کۆرەماری یە هەر تشتێ د سەر را بچیت دکەتە ژەهر ئانو ژەهرا وی دچیتە ناڤ.
**الوحرة(بفتحتين وتشديد):** ١- ژنک یان حێشترا بەژنکورت. ٢- ژنکا رەش و کرێت. ٣- ژنکا سۆر و کرێت.
**وحش(بالتشديد):** جلکێت خۆ یان چەکێ خۆ هاڤێت دا کەس نەنیاست.
**وحش:** ما ب تنێ.
**وحش(بالفتح والتشديد):** جەکێ خۆ یان جلکێ خۆ ژ ترسا دا هاڤێت.
**الوحش:** ١- هووڤ. ٢- حەیوانێ کویڤی. ٣- جهێ کەس لێ نە. ٤- یێ ب تنێ. ٥- جهێ هشک و بێ ئاڤ و گیا. ٦- یێ برسی.
**الوحشان:** یێ خەمێ گرتی.
**الوحشة:** ١- ڤەدەری؛ تەنیایی. ٢- ترس. ٣- هەستێ ژ ڤەدەریێ پەیدا دبت. ٤- خەم. ٥- ڤەقەتیان. ٦- دویرکەڤتنا دلی ژ ئەڤینیێ. ٧- عەردێ ڤالا ژ مرۆڤا.
**الوحشي:** ١- ئەو ئەندامێ لەشی یە یێ ژ ناڤدا وەکی کونا گوهی. ٢- هووڤ. ٣- یێ ژ مرۆڤا برەڤت. ٤- لایێ راستێ ژ هەر تشتەکی. ٥- یێ کویڤی. ٦- یێ ل چۆلێ شین دبت یان دچیت. ٧- پشتا کڤانی.

**الوحشية:** ١- مێیا (الوحش)ە. ٢- ئەو هوریێ ب هێزە یێ د جلکی دبەهت و دگەهیتە لەشی.

**وحف:** ١- خۆ هاڤیتە عەردی. ٢- خۆ ل عەردی دا. ٣- روینشت. ٤- دار لێدا. ٥- نێزیکبوو. ٦- قەستکری. ٧- لەزکر.

**وحف(بالفتح والكسر أو الضم):** بۆر بوو و تژیبوو(پویت یان گیا).

**الوحف(بالفتح والسكون):** ١- پویتێ گەلەک رەش و جوان. ٢- گیایێ تێرئاڤ. ٣- یێ گەلەک ب پەر. ٤- یی بۆر و پر.

**الوحف(بفتحتين):** پویتێ گەلەک و جوان.

**الوحفاء:** ١- یێ بەریێت رەش لێ (عەرد). ٢- یێ سۆر(عەرد).

**الوحفة:** ئێک جارا (وحف).

**وحل:** کەتە تەقنێ.

**وحل(بكسر الحاء):** کەتە تەقنێ.

**الوحل(بكسر الحاء):** یێ تەقن پێڤە.

**الوحل:** تەقن؛ هەری.

**وحم:** ١- مەهـ برن(ژنکا ب حال). ٢- دلێ وێ ژ زادی رەش بوو. ٣- دلێ وی چوویێ.

**وحم(بالتشديد):** ئەو تشت دایێ یێ دلێ وی دچیتێ.

**الوحم:** ١- ئەو تشتە یێ دلێ ژنکا مەها دبەت دچیتێ. ٢- دەنگێ فرینا بالندەی. ٣- گەرم. ٤- مەهبرن.

**الوحمى:** ژنکا مەها دبەت.

**وحمت:** مەهبرن.

**وحمة:** نیشانا ژ مەهبرنا دایکێ ل لەشێ بچویکی چێدبت.

**الوحمى:** ژنکا ب حالا مەها دبەت.

**وحن:** کین هەلگرت.

**الوحنة:** ١- ئێک جارا (وحن). ٢- تەقنا تەحسۆک.

**الوحواح:** ١- سەیێ دەنگ ژێ دهێت. ٢- یێ ب هێز. ٣- سالار؛ سەرۆک.

**وحوح:** ١- پفکرە دەستیت خۆ ژ سەرما دا. ٢- دەنگەکێ ستویر ژ خۆ ئینا.

**الوحوح:** ١- تێکچووی نەفس دژوار. ٢- زەلامێ سڤک. ٣- یێ ب هێز.

**الوحي(بتشديد الياء):** بەزەک.

**الوحي:** ١- پەرتووک. ٢- نامە. ٣- ئیلهام. ٤- ئاماژە. ٥- ئاخڤتنا نهینی. ٦- نڤیسار. ٧- لەز.

**الوحيد:** ١- یێ خۆ ڤەدەر کری. ٢- یێ ئێکانە. ٣- ئێکە ژ ناڤێت خودێ یێت پیرۆز.

**الوحيش:** حەیوانێ کویڤی.

**وخى:** ١- قەستا وی ب تنێ کر. ٢- بەرێ خۆ دایێ. ٣- هێدی ب ریڤەچوو.

**الوخى(الوخية):** قەستکرن.

**الوخاط:** ١- کەردیکلێ بەزەک. ٢- حێشترا بەزەک. ٣- دربێ دگەهیتە هناڤا.

**الوخامة:** ١- تیری. ٢- گرانباری و سەختی. ٣- بکێرنەهاتن. ٤- خرابی.

**وخد:** لەزکر وەکی کەردیکلی گاڤێت خۆ هاڤێتن.

**الوخد(واخد؛ وخاد؛ وخود):** لەزۆکێ گاڤێت خۆ وەکی کەردیکلی دهاڤێژت.

**وخز:** تێرا کر بێ کۆ بگەهینیتە جهێ خلۆلە(روم، دەرزیک).

**الوخز:** ١- تێراکرنا نەگەهیتە خولۆلاهییێ(روم، دەرزیک). ٢- یێ کێم ژ هەر تشتەکی.

**وخش:** ١- رەزیل و بێخێربوو. ٢- هشکبوو و تێکچوو.

**وخش(بالفتح والتشديد):** ١- کێمکر. ٢- رەزیل و بێخێرکر.

